# عەتر

پەتریك زویسكیند

وەرگێڕانی لە ئەڵمانییەوە

عەبدولموئمین دەشتی

**خانەی موکریانی بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە**

MUKIRYANI

ESTABLISHMENT FOR RESEARCH & PUBLICATION

- **عەتر**

- نووسینی: **پەتریک زویسکیند**
- وەرگێران: **عەبدولموئمین دەشتی**
- نەخشەسازی ناوەوە: سەنگەر دلاوەر عەبدوڵڵا
- بەرگ: رێمان
- ژمارەی سپاردن: ( ٢٥٢٦ ) لەساڵی ٢٠١٣
- نرخ: (٤٠٠٠) دینار
- چاپی یەکەم : ٢٠١٣
- تیراژ: ١٠٠٠دانە
- چاپخانە: چاپخانەی موکریانی (هەولێر)

**زنجیرەی کتێب (٧٦٤)**





**ماڵپەڕ:** www.mukiryani.com

**ئیمەیل:** info@mukiryani.com

**کاری ئەو وەرگێڕانەم، پێشکەش بە هەموو ئەوانەی کە شانازی بە زمانی دایکی خۆیان دەکەن.**

# چەند پەیڤێک بۆ وەرگێڕانی ئەو رۆمانەو زمانەکەمان:

تەواو حەوت ساڵ بەر لە ئێستا لە بەرلین و لە زستانی ٢٠٠٧ دەستم بە وەرگێڕانی ئەو رۆمانە کرد، لە زستانی ساڵی ٢٠٠٨ برادەرێک لە کوردستانەوە لێی پرسیم خەریکی چیت، پێم گوت خەریکی وەرگێرانی رۆمانی (عەتر)م، هی پەتریک زویسکیند ، پێکەنی گوتی ئەوە لێرە وەرگێڕدراوەو بڵاویشکراوەتەوە. ئەو دەمە من بەشی دوومم تەواو کردبوو، زۆریشی پێ ماندوو ببووم. دەبووایە ئەو هەواڵە دڵم خۆش بکات، خۆ ئەمە بازاڕی رۆشنبیری کوردی دەوڵەمەند کردووە، منیش خۆ هەر ئەوەم گەرەکە، بەڵام نازانم بۆچی نیگەرانییەک دایگرتم، وابزانم هەستم بە رەنجبەخەساریی خۆم کرد، بۆیە هەستم بەو نیگەرانییە کرد. نزیکە لە کارەکەم سارد بوومەوە، بەڵام پاشماوەیەک تێی هەڵچوومەوە، گوتم سەرێکە هێناومەو نایبەمەوە، دڵی خۆشم بەوە خۆش کرد، کە هەر وەرگێڕانێک بۆخۆی جۆرێکە، جا بەراستیش وایە، ئەوە بوو لە ١٩.٠١.٢٠١٠ لە وەرگێڕانەکەم بوومەوە، عەبدولغەنی کاکۆی خوارزام بۆی خوێندمەوەو پێیدا چووەوە، وەرگێڕانەکەمی زۆر پەسند کردو هەندێ سەرنجی باشیشی دامێ، لێرە سوپاسی دەکەم.

هەموو وەرگێڕانێک کارێکی دژوارە، بە تایبەت وەرگێڕانی ئەو رۆمانە ، چونکە بابەتی ئەو رۆمانە وەرگێڕ ڕادەکێشێت بۆ زانستەکانی کیمیاو رووەکزانی و دەباغچێتیی، ئەوجا عەترسازیی، من کەمێک لە کیمیاو رووەکزانی دەزانم، بەڵام هیچ پەیوەندییەکم بە بابەتەکانی تر نەبوو. لە لاییێکی تر ئەو هەموو ناوە فرەنسییانەی کە لە ناواخنی ئەم رۆمانەدا هەیە، فۆنەتیکەکانیان بۆ فرەنسی نەزانێک ئاسان نیەو دژوارە، گومان لەوەدا نیە، کە ناوەکانم وەک خۆیان نەخوێندۆتەوەو تەنها بە نزیکیی نەبێت. وەرگێڕانەکەم نزیکە سێ ساڵە لەناو لێپتۆبەکەم خەوتووە، دەزگەی موکریان ئامادەیی چاپکردنی پێشاندا، سوپاسیان دەکەم، کە بەهۆی ئەوان ئەو رەنجەم دەکەوێتە بەرچاوی خوێنەرانی رۆمان و سەرنگوم نابێت.

هەرچەندە ئەو رۆمانە باس لە بکوژێک دەکات، بەڵام لە رێگەی ئەو بکوژەوە ئەو راستییەمان لا رۆشنتر و تۆختر دەبێتەوە، کە مرۆڤ بریتییە لە کۆمەڵێک ئاکار و سیما، کە دەتوانین بە ئاکار و سیمای مرۆڤیی ناویان بەرین، ئەگەر مرۆڤێکت لەم ئاکار و سیمایانە رووتکردەوە، یان لێت بێ

بەش کردن، ئەوەی دەمێنتەوە جانەوەریکە وەک هەر جانەوەرێکی تر، واتە مرۆڤ بەر لەوەی ناوێک بێت، بۆ رەگەزی مرۆڤ، چەپکێکی فەلسەفییە بۆ ئاکاری مرۆڤیی.

پەتریک زویسکیند بەوە دەناسرێتەوە، کە نووسینەکانی زۆر تایبەتمەند و جیاوازن، پالەوانی چێرۆک و رۆمانەکانی هەمووی کەسانی زۆر نامۆ و نائاسایین، بەڵام لە پەنای ئەو کەسە نامۆ و عەنتیکەو سەرنجراکێشانە ئەو مرۆڤی راستەقینەمان پێ دەناسێنێت، ئەو مرۆڤەی کە بە هەموومان ئاشنایە. لە کۆتای وەرگێرانەکەم بە پێویستم زانی فەرهەنگۆکێک بۆ ئەو وشانە دابنێم کە زۆر بڵاو نین، یان خۆم دامرشتوون، هیوادارم بەم کارەو لە رێگەی زمانەوە، کە گرنگترین کۆڵەگەی نەتەوایەتی هەر نەتەوەیەکە، خزمەتێکی نەتەوەکەی خۆم کردبێت.

هەر لێرە، بە هەلی دەزانم، وەک مامۆستاییێکی زانکۆ، بانگەوازێک بۆ رۆشنبیران و سیاسەتمەدارن بڵاوبکەمەوە، کە دەمێکە لە دڵم ورتە ورتییەتی، لە کاتی ئێستادا، من هەست بە مەترسییێکی گەورە دەکەم لەسەر زمانی کوردی، لە کاتی ئێستادا لە ژێر دروشمی ئەوەی کە گوایە زمانی ئینگلیزی و عەرەبی، زمانی زانست و بازرگانییە، لە ناو زۆر لە دەزگا دەسترۆیشتووەکان، لەوانەی کە پەیوەندییان بە ستراتیجی زمانی کوردی هەیە، لەوانە لە ناو زانکۆکانی کوردستان، زمانی کوردی فەرامۆش کراوەو لەسەردەمی ئازادیدا وەک زمانی خوێندن و زمانی نەتەوەیی ئەو کوردستانە بەکارناهێنرێت و بایەخی پێ نادرێت، هەر بۆیەشە بەدەگمەن کتێبێکی زانستی دەبینیت بۆ کوردی وەربگێڕدرێت، ئەگەر کار وا بڕوات هەرگیز دەرگای زانست لە زمانی کوردی ناکرێتەوە، زمانی کوردی دەپوکێتەوەو گەشە ناکات و تەنها لەناو بازنەی زمانی بازاڕ و ئەدەبیدا دەمێنێتەوە. بەڵام بە بینینی من ئەوە هەڵەیەکی سیاسی گەورەیە، زمان بەهێزترین پایەی نەتەوایەتیمانە، زمانی کوردی لە هەموو بوارەکانی زانست توانای بەکارهێنانی تێدایە ، ئەگەر بە شێوەیەکی زانستیی بەکاربهێنرێت. بە داخەوە ئێستا تەنها لە قوتابخانەکانی سەرەتایی و ناوەندی بەکاردێت، بەڵام ئەوەی چاوێک بە کتێبەکانی سەرەتایی و ناوەندیش بگێڕێت، هێندەی تر گریانی بۆ زمانی کوردی دێت. ئەمە بەهۆی بێ توانایی زمانەکەمان نیە، بەهۆی فەرامۆشکاری و بایەخپێنەدانە، من نەوەی رێکەوتنامەی ١١ی ئاداری ١٩٧٠م، واتە بە زمانی کوردی سەرەتایی و ئامادەییم خوێندووە، تاقیکردنەوەی شەشی ئامادەیی ئەوسام بە کوردی کردووە، وانەکانی ماتماتیک و فیزیاو رووەکزانی و کیمیاو گیانەوەرزانی و هەموو وانەکانی شەشی ئامادەییم بە کوردی خوێندووە، وەرگێرەکانی ئەوسا زۆر باشتر و زانستانە تر، ئەو کتێبانەیان وەرگێرا بوو بۆ کوردی، ئەوان نەهاتبوون ئەتۆم بکەن بە وردکە، مۆلیکیول بکەن بە شتێکی تر، زمانەکە کوردی بوو، بەڵام ئەتۆم

و مۆیکیـول و تانجێـت و سـاین و کۆسـاین و سـیکەند…هتد هـەر لاتینـی بـوون، وەک هـەموو ئـەو میللەتانەی ئەوروپا ئەوانەیان بە مولکی کوردیش زانی بوو، مامۆستایانی وەرگێڕی ئەوان رۆژان زۆر وریاتربوون و زانستیی تر بـوون، کـە چـووین بـۆ بەغـدا لـە هـەموو دەرسـە زانسـتییەکان ئێمـە لـە خوێنـدکارە عەرەبـەکان باشـتر بـووین، ئـەویش بـە هـۆی ئـەوەی بـە زمـانی دایـک خوێنـدبوومان و وەرگێردراوەکانیش زانستانە بوون. من پێم وایە ئاستی زانستیی هەر گەلێک تەنها بـە زمـانی دایـک پێشدەکەوێت، تا ئێمە ئاوا زمانی دایک فـەرامۆش بکـەین و بـە ئینگلیزییـە ناچلـەکانمان خـەریکی تێگەیاندنی خوێندکاران بین، ئەوا نە مامۆستاییێکی سەرکەوتوو دەبین، نە دەتـوانین وەک پێویسـتە زانست لە وڵاتەکەمان پێش بخەین، چونکە ئێمـە بـێ پـەرواو بـێ ڕادە زاڵـین بەسـەر زمـانی دایـک، بۆیەش زۆربەی هەرەزۆری گەلان زمانی نەتەوایەتی لە زانکۆکانیش بەکار دەهێنن، وە هەموو کتێبـە زانستییەکان وەردەگێڕن بۆ زمانی نەتەوایەتی خۆیان و ناڵێن، فـلان زمـان زمـانی زانسـتەو دەبێـت زمانی خۆمان بخەینە مۆزەخانە، ئەلمان بە ئەلمانی و فارس بە فارسی و تورک بە تـورکی و چیـک بە چیکی و گریک بە گریکی…هتد دەخوێنن، ئایا ئێمە زرەنگتـرین لـەو گەلانـە؟؟؟ خـۆ ئەگـەریش بڕیار وابێت ئیتر لە قوتابخانە سەرەتاییە ئەهلی و تایبەتییەکانیش، ئیتر بۆ هەمیشـە زمـانی بیـانی بکـەین بـە زمـانی منداڵـەکانمان، ئـەوا خراپەیـەکی نامرۆڤایـەتی لەگـەڵ مێـژووی نەتەوەکـەمان و زمانەکـەمان دەکـەین، هـەروەهاش لەگـەڵ کۆمەڵگـەی ئـەو کوردسـتانە، چونکـە نابێـت ئەوەشـمان لەبیربچێت، کە تـەنها دەسـتەیەکی تایبـەتی دەستڕۆیشـتوو، دەتـوانن منداڵـەکانیان بنێـرن بـۆ ئـەو قوتابخانە ئینگلیزی و تورکی ئەمەریکی و ئەلمانییە …، ئەوسـا لـە دوارۆژیـش هـەر ئـەو دەسـتەیە دەبن بە دەسەڵاتداری ئەو کوردە بێ بەختە، کە بە زۆر دەیانەوێت فێـرە زمـانی بیـانیی بکـەن. بـە داخێکی زۆرەوەش سیاسەت لەم مەیدانە خەوتووە، ئەویش بە ناوی ئەوەی نابێت سیاسەت دەسـت لە زانست بدات، کەئەم بۆچوونەش هە هەڵەیەکی گەورەیەو تێ نەگەیشتنە لە سیاسەت.

**هیوادارم ئەو پەیڤانەم مەبەستەکانمی پێکابێت…**

**عەبدولموئمین دەشتی**

**٢٠١٣/٠٢/٠٣**

**هەولێر**

# بەشی یەکەم

## ١

لە سەدەی هەژدەم پیاوێک لە وڵاتی فەرەنسادا دەژیا، ئەو پیاوە یەکێک بوو لە بلیمەتترین و سامناکترین بوونەوەرەکانی ئەو سەردەمەی، کە تێیدا مرۆڤە بلیمەت و سامناکەکان ژمارەیان کەم نەبوو. دەمانەوێت لێرە بەسەرهاتی ئەو پیاوە بگێڕینەوە.

ئەو پیاوە ناوی (جۆن پاتیست گرێنوی) بوو. ئەگەرچی ئەمڕۆ ناوەکەی بە پێچەوانەی ناوی بلیمەتە دڕندە چەپەلەکانی تر، لە بابەتی دێ ساج، سا جوست، فۆشێیس، بۆناپارت...هتد کەوتۆتە چاڵی لەبیرچوونەوە، دڵنیا نین لەوەی، ئەگەر هۆیەکەی ئەوە بووبێت، کە گرێنوی لە ڕووی گەردنکەشی و ئازاردانی مرۆڤ و بێ ڕەوشتیی، یان بە کورتی لە بێخودایی، کەوتبێتە دواوەی ئەو پیاوە سامناکە بەناوبانگانە، نەخێر تەنها لەبەر ئەوە بووە، چونکە تاکە بلیمەتی و زیرەکییە دانسقەکەی ئەو پیاوە لە بابەتێکی وەها بوو، کە هیچ شوونێک لە دوای خۆی لە مێژوودا بەجێناهێڵێت: واتە مەملەکەتی ناجێگیر و پەرتەوازەبووی بۆن و بەرامەکان.

لەو سەردەمەی کە ئێمە قسەی لێوە دەکەین، بۆگەنێکی ئەوەندە ناخۆش و گەندەڵ شارەکانی داگیرکردبوو، کە بۆ ئێمەی مرۆڤی مۆدێرن دژوارە بتوانین بیهێنینە بەر چاوی خۆمان. جادەکان بۆنی پاشەڕۆکی ئاژەڵیان لێ دەهات، حەوشەی پشتەوەی خانووەکان بۆنی میزیان لێ دەهات، پەیژەی ماڵەکان بۆنی داری گەنیو و جورجی تۆپیویان لێ دەهات، ئاشپەزخانەکان بۆنی کەلەمی ڕزیو و دونگی بەرانیان لێ دەهات، ژوورە هەوانەگۆڕەکان بۆنی تۆزی گڵمخایان لێ دەهات، ژووری خەوەکان بۆنی بۆیەی چەور و بۆنی دۆشەکی پەڕی شێدار و هاڵاوی لەگەنی پیسایی شەویان لێوە دەهات. لە ئاگردانەکان بۆگەنی گۆگرد دەهات، لە دەباغخانەکان بۆگەنی تفتاوە سوتێنەرەکان دەهات، لە قەسابخانەکان بۆنی خوێنی مەییو

دەهات. مرۆڤەکان بۆنی ئارەق و جلوبەرگی نەشۆراویان لێ دەهات، بۆنی ددانی رزیو لە زاریان دەهات، بۆنی پیازاو لەگەدەو جەستەیان دەهات، خۆ ئەگەر تەواو گەنج نەبان، ئەوا بۆنی کۆنەپەنیر و شیری ترشاو و بۆنی نەخۆشی کوڵک و لاڕەشەیان لێ دەهات. روبار و مەیدانەکان بۆنیان لێ دەهات، لە کڵێساکان، لە ژێر پردەکان لە کۆشکەکان بۆنی کەلاکی تۆپیو دەهات. جوتیار و قەشە، کرێکار و سەرکار،

شاگردان و وەستاو وەستاژنیش بۆنیان لێ دەهات، خانەدانەکانیش، واتە چین و بنەماڵەی پاشا تا دەگەیشتە خودی پاشا خۆشی، هەر هەموو بۆنی کەلاکیان لێ دەهات، پاشا بۆنی دڕن و بۆنی گیاندارێکی دڕندەی کێوی لێ دەهات، شاژنیش بۆنی پیرە بزنێکی ڕزیوی لێ دەهات، کەژی هاوینیش بۆن زستانی لێ دەهات.

چونکە لە سەدەی هەژدەم هێشتان هیچ مەرزێکیان بۆ چالاکی بەکتریاکان دانەنابوو لە رزاندن و گەنیوکردن، بەو شێوە هیچ کارێکی مرۆڤ، هیچ ئاواکردنێک، هیچ وێرانکردنێک و هیچ گەشانەوەو ئاوابوونێکی ژیان، هیچ دەربڕینێکی ئەو ژیانە کرمی و رزیوە، بێ یاوەری بۆنی بۆگەن بەڕێوەنەدەچوو.

بێ گومان چونکە پاریس گەورەترین شاری فەرەنسا بوو، لە هەموو شوێنێک گەنیوتر بوو،. لە ناو شاری پاریسیشدا شوێنێک لە نێوانی شەقامی ئۆفێر و شەقامی فێرۆنەری، بە ناوی گۆڕستانی ئینۆسۆم هەبوو، بۆنێکی بۆگەنی یەگجار سامناکی لێ دەهات و بە درێژایی هەشت سەت ساڵ مردووەکانی نەخوشخانەی " هۆتێل دییۆ" و جڤاتەکانی قەشایەتی ئەو دەوروبەرەیان هێنابووە ئەو شوێنە، بە درێژایی هەشت سەت ساڵ، رۆژانە چەندین کەلاکی مردوویان بە گالسکە لێرە رووکردبووە ناو گۆڕی بە کۆمەڵی درێژ و زەبەلاح، بە درێژایی هەشت سەت ساڵ  چین چین هێسکیان خستبووە سەر هێسک. زۆر دواتر، بەر لە ئێوارەی شۆڕشی فەرەنسا، کاتێک هەندێک لە گۆڕخانەکان بە شێوەیەکی مەترسیدار داتەپین، بۆنی گەنیوی گۆڕستانە داتەپیوەکان نەک هەر بووە هۆی ناڕەزایی دانیشتووان، بەڵکو بووە هۆی چەندین راپەڕینی راستەقینە، ئەوسا ئەو شوێنە دادەخرێت و ملیۆنان هێسک و پرووسک و کەللەسەر بە پاچ و پێمەڕە هەڵدەکەندرێن و دەگوازرێنەوە بۆ گۆڕخانەی مۆمارترێ، و ئەو شوێنەش دەکرێتە مەیدانی خۆراکو  سەوزە فرۆشی.

ئا لێرە، لە بۆگەنترین شوێنی مەملەکەتی پاشایەتیدا لە ١٧ تەموزی ١٧٣٨، لە گەرمترین رۆژی ئەو ساڵەدا، جۆن پاتیست گرێنوی لە دایک بوو.. گەرمایی وەک قورقوشمی توواوە دەڕژایە سەر گۆڕستانەکەو بۆنێکی تێکەڵ لە بۆنی کاڵەکی گەنیو و زوخاڵی قۆچی سوتاو، وەک هالاوێکی بۆگەن بە کووچەکانی دەوروبەر بلاودەبووەوە.

دایکی گرێنوی کە ژانی هاتێ بەسەر پێوە بوو، لە مەیدانێکی ماسیفرۆشی لە دەم شەقامی ئۆفێر خەریکی پاککردنەوەی ماسییێک بوو، کە پێشتر هەڵیبژاردبوو. گوایە ئەو ماسییانە بەیانی ئەمرۆژە لە  رووباری "سێنە" دەرهێنراون، لەگەڵ ئەوەش ئەوەندە بۆنیان لێ دەهات، کە بۆنەکەیان

بۆنی جەستە بۆگەنەکانی داپۆشیبوو. بەڵام دایکی گرێنوی نە هەستی بە بۆنی ماسی دەکرد و نە بە بۆگەنی جەستەکان، چونکە لووتی ئەو ژنە بەتەواوی هێزی بۆنکردنی کوڵ ببوو، سەرەڕای ئەوەش لەشی ژانی دەکرد و ژان هەموو هەستێکی تری سڕ کردبوو، هەستی بە هیچ شتێکی تری دەرەوەی خۆی نەدەکرد. ئەو دەیویست هەر چۆنی بێت ئەو ژانە یەقەی بەر بدات،

دەیویست تا دەکرێت زوو ئەو نەوزادە بێزەوەرە لە یەقەی خۆی بکاتەوە. ئەمەیان پێنجەمین منداڵی بوو، هەمووی لێرە لەو شوێنی ماسی فرۆشییە، بە مردوویی یان بە نیوە مردوویی، فڕێ دابوون، چونکە ئەو گۆشتە خوێناویەی کە لێی دەهاتە دەرەوە جیاوازییێکی نەبوو لەگەل ئەو هەناو و ریخۆلە فڕێدراوانەی ماسی کە لەو ناوە کەوتبوون، هەروەها ئەوەندە زۆریش نەدەژیان، ئیتر ئێوارە لەگەڵ ئەو هەناو و ریخۆلە فڕێدراوانەی ماسی کۆدەکرانەوەو هەموو بە خاکەناز فڕێ دەدرانە گۆڕستانەکە، یان دەهاویشترانە ناو رووبارەکە. ئەو نەوزادەی ئەمڕۆشی دەبووایە هەر ئاوای بەسەر هاتبا بە دەردی ئەوانەی تری چووبا، دایکی گرێنوی کە هێشتا ژنێکی گەنج بوو، تەمەنی بیست ساڵ دەبوو یان نا، هێشتان ژیکەلە دەکەوتە بەرچاوان، هێشتان نزیکەی تەواوی ددانەکانی لە زاردا مابوون و کەمێک قژی بەسەرەوە مابوو، جگە لە نەخۆشی جومگەئێشە و فەرەنگی و سەرسووڕانێکی سووک نەخۆشییەکی تری ئەوتۆی نەبوو کە بە هەند وەربگیرێت، هێشتان هیوای ژیانێکی درێژی نزیکە پێنج یان دە ساڵی بە بەردەمەوە مابوو، تەنانەت لەوانەش بوو رۆژێک لە رۆژان شوو بکات و وەک ژنێکی شەرەفداری بێوەمێردێکی پیشەگەر منداڵی راستەقینەی ببێت یان ئاوا... دایکی گرێنوی ئارەزووی دەکرد هەمووی کۆتایی بێت و ببڕێتەوە. کە ژانی منداڵبوون لێی تیر کرد و زۆری بۆ هێنا، خۆی دانەواندەوەو لە ژێر مێزی ماسی پاککردنەوەکە، لەسەر چیچکان دانیشت و وەک چوار جاری تری پێشووی ئەو زگەشی دانا، هەر بە چەقۆی لەتوپەتکردنی ماسییەکان ناوکی شتە تازەبووەکەی بڕی. بەڵام پاشان بە هۆی گەرمی و بۆنی بۆگەن لە هۆش خۆی چوو، ئەگەرچی ئەو بەو شێوەیە هەستی بەو گەرمی و بۆگەنە نەدەکرد، بەڵکو وەک ئەوەی کەوتبێتە ژێر کاریگەری شتهایێکی بەرگەنەگیراو و سڕکەر، وەک بۆنی مێرگە زەنبەقێک، یان وەک بۆنی ژوورێکی تەنگی پڕ گوڵە نێرگز، لار بووەو کەوتە ژێر مێزەکە، لە ناوەڕاستی جادە، بە خۆو بە دەستی بە چەقۆوە کەوتە سەر زەوی.

لە ناو زیڕەو بگرەبەردەو هاوار هاوار و راکەڕاکە، خەڵک ئاپۆڕەیان بەستبوو تەماشایان دەکرد، پۆلیسیان بۆ بانگ کرد، ژنە هێشتان بە خۆو بە چەقۆی دەستی لەو ناوە کەوتبوو، وردە وردە هاتەوە سەرخۆی:

- چیت بەسەر هاتووە؟
- هیچ.
- چیت بەم چەقۆوە کردووە؟
- هیچ.
- ئەو خوێنە چیە بە کراسەکەتەوە؟
- هی ماسییەکانە!

ئیتر هەڵدەستێتەوە سەرپێیان و چەقۆکە فڕێدەدات و ئەوێ جێ دەهێڵیت، بۆ ئەوەی بچێت خۆی بشوات.

ئا لەو کاتەدا ئەوەی چاوەروان نەدەکرا روویدا، کۆرپەی ژێر مێزەکە دەستی کرد بە زریکاندن. خەڵکەکە تەماشایان کرد، لە بن قۆمەتی باڵ و پوولەکەو هەناو و ریخۆڵە و سەرەماسی فڕێدراودا، چاویان بە جەستەی کۆرپەیەک کەوت. رایان کێشا دەرەوە. دەوڵەت کۆرپەکەی دایە دایەنێک و دایکەکەیان گرت. جا چونکە بێ ئەملاو ئەولا دایکە دانی بەوەدا نا، کە ئەو ویستوویەتی ئەو شتە بتۆپێنێت، وەک چۆن پێشتر چوارەکەی تری تۆپاندووە، بردیانە بەردەم دادگا. دادگاش، بە تاوانی کوشتنی چەندجارەی منداڵان، گوناهباری کرد و چەند هەفتەیەک دواتر لە مەیدانی گرێڤ لە سەریان دا.

تا ئەو کاتە کۆرپەکە سێ جاران دایەنی گۆڕی بوو. هیچ یەکێک لە دایەنەکان نەیویستبوو لە چەند رۆژێک پتر ئەو زارۆکە بەخۆیەوە بگرێت. گوایە زارۆکێکی زۆر چڵێسەو بەشی دوو منداڵ شیر دەخوات و، بەشە شیری شیرەخۆرەکانی تریش دەخوات، بۆیەشە بۆ ئەوان، بۆ دایەنەکان دەریناهێنێت و ئەوان ناتوانن تەنها بە مووچەی بەخێوکردنی تاکە زارۆکێک بژین. ئەفسەرێکی پۆلیس، کە ناوی لافۆس بوو، بەرپرسی ئەم کێشانە بوو، بەزەیی بە زارۆکەکەدا هاتەوە، ویستی زارۆکەکە بباتە خانەی منداڵە دۆزراوەو سێوییەکان لە شەقامی سانت ئەنتوان، کە لەوێوەش رۆژانە منداڵەکان دەگواسترانەوە بۆ خانەی سەرەکی دەوڵەتیی بۆ منداڵە دۆزراوەکان لە شاری رووا. منداڵەکان لەلایەن بارهەڵگرانەوە بە هۆی زەمبیلی بارهەڵگری دەگواسترانەوە، ئەویش بە هۆی دەستگری و کابانی، بۆ کەمکردنەوەی خەرجی، هەموو جارێک چوار زارۆک پێکەوە دەخرانە زەمبیلێک، بۆیەشە رێژەی مردنی زارۆکەکان لە رێگا بە شێوەیەکی نائاسایی زۆر بوو. لەبەرئەوەش بوو کە بارهەڵگرەکان، لە دیدی باوەڕەوە، تەنها ئەو زارۆکانەیان وەردەگرت، کە ئاومۆر کرابوون و نامەی گواستنەوەی یاساییان بۆ ئامادە کرابوو، ئەو نامانەش دەبووایە لە شاری رووا مۆر بکرێن. بەڵام چونکە ئەو زارۆکە، گرێنوی، نە ئاومۆر کرابوو، وە نە ناویشی لێ نرابوو، تا بتوانن ناوەکەی لە نامەی گواستنەوەی یاسایی بنووسن، هەروەها بۆ پۆلیسیش باش نەبوو، منداڵێکی بێ ناو

بخاته بەردەم دەروازەی خانەی منداڵە دۆزراوەکان، کە ئەوساش زۆر کاری رۆتینی تری دەما بۆ وەرگرتنی، جا بە هۆی ئەم هەموو کارە بیرۆکراتییانەوە، کە بۆ ناردنی منداڵەکە پێویست بوون، کاتەکەش تەنگەتاو بوو، ئەفسەری پۆلیس، لافۆسێ، لە بڕیارەکەی یەکەمی پەشیمان بووەوەو، فەرمانی دا کە بەرامبەر وەرگرتنی پسوولەیەک منداڵەکە بدەن بە دێرێک، تا لەوێ ئاومۆری بکەن و بڕیاری چارەنووسی داهاتووشی بدەن. بەم جۆرە منداڵەکەیان بردە دێری سانت مێری لە شەقامی سانت مارتاو لە کۆڵ خۆیان کردەوە. لەوێ ئاومۆریان کرد و ناوی جۆن پاتیست گرێنوی- یان پێ بەخشی. جا چونکە ئەو رۆژە سەرکاری دێرەکە زەوقی باش بوو، هێشتان دەستکەوتی خێرۆمەندان بنی نەهاتبوو، بڕیاری دا کە منداڵەکە نەنێرێت بۆ شاری رووا، بەڵکو لەسەر خەرجی دێر بەخێو بکرێت. بۆ ئەم مەبەستە منداڵەکە درایە دایەنێک بە ناوی ژان بویسی لەسەر شەقامی سانت دێنی و هەفتانەیەکی سێ فرانکی بەرامبەر ماندوبوونەکەی بۆ بڕایەوە.

# ٢

چەند هەفتەیەک دواتر ژان بویسی بە خۆو بە سەبەتەیەکەوە هاتە بەردەم دەروازەی دێری سانت ماری، قەشە تێریی دەرگای لێ کردەوە، پیاوێکی پەنجاساڵەی سەر نیوە ڕووتاو، کەمێک بۆنی سرکەی ترشاوی لێ دەهات، ژان بویسی سەبەتەکەی خستە سەر ئاستانەی دەرگاکەو گوتی:

- "ئەوەتا!"

تێریی خۆی دانەواندە سەر سەبەتەکەو بۆنی کرد:

- "ئەمە چیە؟"، وای زانی خۆراکێکی تێدایە.

- "ئەمە حەرامزادە زارۆکوژەکەیە، ئەوەی شەقامی ئۆفێر. تێریی بە پەنجەکانی ناوەوەی سەبەتەکەی پشکنی، تا دەموچاوی ساوا خەوتووەکەی دۆزییەوەو تەماشای کرد:

- "باشە باش! تەندروست دێتە بەرچاوان، گەشاوەو و تێرە!"

- "بەڵێ! منی هەڵلووشییەوو خۆی لە من تێر کردووە، هەتا سەر هێسکانی هەڵمژیوم! ئیتر بەسە!، لەمەودوا خۆتان دەتوانن بیژیێنن، بە شیری بزن، بە شۆربا، بە شەربەتی گێزەر. ئەو جانەوەرە هەموو شتێک هەڵدەلووشێت."

تێریی قەشە پیاوێکی لەسەرخۆ بوو، ئەوکاتەی ئەو دێرەکەی بەڕێوەدەبرد و سەرپەرشتی خێراتەکانی دەکرد، هەمیشە پارەی بەسەر هەژار و نەداراندا دابەش دەکرد. بەرامبەر ئەو چاکانەی، چاوی لەوە بوو خەڵک سوپاسی بکەن و بە شتێکی تر بێزاری نەکەن. ئەو حەزی لە وردەکاریە تەکنیکیەکان نەدەکرد، چونکە وردەکاری هەمیشە کێشەو دژواری لەپاش بوو، کێشەو دژواریش واتە سەرئێشەو تێکدانی ئارامی و ئاسوودەیی، ئەویش بەرگەی ئەمەی نەدەگرت. زۆر پەست و پەشێمان بوو، لەوەی کە دەرگای لەم ژنە کردبووەوە. لە تەهی دڵییەوە پێی خۆش بوو کە ژنە سەبەتەکە هەڵبگریت بە خۆو بە گیروگرفتی زارۆکەکەوە بگەڕێتەوە ماڵەوەو، بە ئاسوودەیی جێی بهێلێت. بە ئەسپایی خۆی ڕاست کردەوەو هەناسەیەکی قووڵی هەڵمژی، لووتی پڕ بوو لە بۆنی شیر و خورییێک

که بۆنی پەنیری لێ بێت. ئەو بۆنانە کە لە دایەنەکەوە دەهاتن و بەو ناوە پەرت دەبوون. بۆنێکی خۆش بوون.

- "من تێناگەم، تۆ چیت گەرەکە. بەڕاستی تێناگەم، تۆ دەتەوێ چی بکەیت. ئەوەی من لێی حاڵی دەبم هەر ئەوەیە، هیچ زیانێک ناگاتە ئەو زارۆکە، ئەگەر ماوەیەکی تریش بەسەر مەمکەکانی تۆوە بێت" دایەنەکە بە بۆڵەبۆڵ وەڵامی دایەوە:

- "زیان ناگاتە ئەو، دەگاتە من!... من پێنج کیلۆم کەم کردووە، پێنج کیلۆم لێ خوراوە، بۆچی؟ تەنها بۆ سێ فرانک، لە هەفتەیەکدا!"

تێریی کەمێک هەناسەی هاتەوە بەر و گوتی:

- "ئەها، من تێگەییشتم، ئێستا تێگەییشتم، دیسان مەسەلە پووڵە." دایەن وەڵامی دایەوە:

- "نەخێر!"

- "بەدی! بەدی! هەمیشە مەسەلەکە پووڵە. هەر کاتێک لەو دەرگایە دەدرێت، پەیوەندی بە پووڵ هەیە. حەزم دەکرد جارێک، تەنها جاریک دەرگا بکەمەوە، کەسیک ببینم، بۆ شتێکی تر هاتبێت. بۆ شتێک کە سەرنج ڕابکێشێت، بۆ نموونە کەمێک مێوە یان هەندێک گوێز، خۆ ئەوە پاییزەو دنیا پڕە لە شت، کەسێک شتێک لەگەڵ خۆی بێنێت، بۆ نموونە دەسکە گوڵێک. هەر نا هەر نا، با کەسێک بهاتبایە بە ڕوویێکی خۆش بیگوتبا: "سڵاوی خودات لێ بێت! قەشە تێریی، هیوای ڕۆژێکی خۆشت بۆ دەخوازم!" بەڵام دڵنیام من ئەوە هەرگیز نابینم، ئەوەی لە دەرگا دەدات ئەگەر سوالکەر نەبێت ئەوە بازرگانە، ئەگەر خۆ بازرگان نەبێت ئەوە وەستاو پیشەگەرە، ئەگەریش سوالکەر نەبێت، ئەوە لیستەی حسێباتیی پێیە. ئیتر ناتوانم بە جادەوە بڕۆم، هەر پێ دەخەمە سەر جادە، دوای سێ هەنگاو یەقەم دەگرن، هەموو پووڵیان گەرەکە!" دایەنەکە گوتی:

- "ئەوە من نیم!"

- "بەڵام با من شتیکت پێ بڵێم! تۆ تاکە دایەن نیت لەم جڤاتە، سەدان دایکی بەخێوکاری پلە یەک هەن، کە خوا خوایانەو دەپاڕێنەوە ئەو زارۆکە بخەنە سەر سنگییان، شۆربا، شەربەت یان شتێکی تری لە دەم بکەن، بۆ ئەوەی هەفتەی سێ فرانکیان بدرێتی..."

- "ئێ دە بیدەرە یەکێک لەوان!"

- "... لە لاییێکی تر ئەمە شتێکی باش نییە، ئاوا منداڵێک فڕێ بدەیتە ئێرە. کێ دەڵێت شیرێکی تری وەک شیری تۆی لێدەکەوێت، ئەو زارۆکە لە بۆنی سنگی تۆ و لێدانی دڵی تۆ ڕاهاتووە، پێویستە ئەمە بزانیت!"

ئینجا هەناسەیەکی قووڵی بەجارێک لەو هاڵاوە گەرمە هەڵمژی، کە لە دایەنەکەوە هەڵدەستاو بەوناوەدا پەرت دەبوو، ئیتر کە زانی قسەکانی هیچ کاریگەریەکیان لە ژنەکە نەکرد، ووتی:

- "ئێستا ئەو زارۆکە هەڵگرەو بیبەوە ماڵ! من قسە لەگەڵ سەرکاری دێر دەکەم، پێشنیاری ئەوە دەکەم کە هەفتانە چوار فرانکت بدەنێ." دایەن وەڵامی دایەوە:

- "نا".

- "باشە: پێنج"

- "نا" تێریی هاواری کرد:

- "ئەدی تۆ داوای چەند دەکەیت؟ پێنج فرانک پارەیەکی زۆرە! بۆ کارێکی کەم، بۆ بژێوی منداڵێکی بچووک!" دایەن وەڵامی دایەوە:

- "من بە هیچ پارەیەک ئەو کارە ناکەم! من نامەوێت چیتر ئەو جانەوەرە ببەمە ماڵەکەی خۆم!" تێریی گوتی:

- "بەڵام لەبەر چی، خانمی خۆشەویست؟" تێریی ئەمەی گوت و دیسان نەویەوەو بە پەنجەکانی ناو سەبەتەکەی پشکنی:

- "تەماشا چەند ساواییێکی ژیکەلەو خوێنشیرینە، دەڵێی گوڵە، نازریکێنێت، چەند جوان نووستووە، ئێ خۆ ئاومۆریش کراوە".

- "ئەوە شەیتان چۆتە ناو جەستەی!"

تێریی خێرا پەنجەکانی خۆی لە سەبەتەکە کێشایەوە.

- "ئەوە مەحاڵە، ئەوە شتێکە هەرگیز نەبووەو ناکرێ، شەیتان بچێتە جەستەی ساواییێکی شیرەخۆرە، شیرەخۆرە هێشتان نەبووە بە مرۆڤ، قۆناغێک پێش مرۆڤە، هێشتان گیانی تەواو دروست نەبووە، بۆیەشە شەیتان بایەخی پی نادات، ئایا ئەو زارۆکە قسان دەکات؟ هیچ شتێک لە ژوورەکەت دەجووڵێنێت؟ بۆنێکی ناخۆشی لێ دێت؟" دایەن وەڵامی دایەوە:

- "ئەسڵەن هیچ بۆنێکی لێ نایەت!"

- "ببینە، وەک تۆ دەڵێی وایە، ئەوە نیشانەیەکی رۆشنە! ئەگەر شەیتان بچووبایە جەستەی، ئەوە بۆنی کەلاکی تۆپیوی لێوە دەهات"

ئیتر تێریی تا دایەن هێور کاتەوەو قسەکانی خۆی بسەلمێنێت، سەبەتەکەی بەرزکردەوەو هێنایە ژێر لووتی خۆی و ماوەیەک بۆنی کرد. ئەوجا گوتی:

- "من هەست بە هیچ بۆنێکی ناخۆش ناکەم، بەڕاستی هیچ بۆنێکی نامۆی لێ نایەت، تەنها کەمێک بۆنی پەڕۆکەکەی نەبێت"، سەبەتەکەی بۆ دایەنەکە برد، تا ئەویش پشتگیری بۆچوونەکەی بکات. دایەنەکە بە قێزەوە سەبەتەکەی پاڵدایە دواوەو لە خۆی دوور خستەوە:

- "من مەبەستم ناو پەڕۆکەکەی نیە. راستە پیسابییەکەی بۆنی دێت، بەڵام ئەو عاجباتییە بە خۆی هیچ بۆنێکی لێ نایەت." تێریی گوتی:

- "چونکە تەندروستی باشە، منداڵی تەندروست هیچ بۆنێکی لێ نایەت! تەنها منداڵی نەخۆش بۆنیان لێ دێت، خۆ ئەوە هەموو کەسێک دەیزانێت. منداڵێک بۆنی لێ دێت کە ئاوڵەی گرتبێت، بۆنی تەرسی ماینی لێ دێت، ئەوەشی تووشی سوورەتا دەبێت بۆنی سێوی کۆنی لێ دێت، ئەوەشی تووشی مانگگرتن دەبێت بۆنی پیازی لێ دێت. ئەو منداڵە تەندروستی باشەو بۆنی لێ نایەت، ئەوە هەموویەتی. چیتی؟ پیویستە بۆنی بۆگەنی لێ بێت، منداڵەکانی خۆت بۆنیان لێ دیت؟" دایەن وەڵامی دایەوە:

- "نەخێر، منداڵی من ئەو بۆنەیان لێ دێت، کە لە هەر بێچووە مرۆڤێکی تر دێت."

تێریی بە ئاگایی سەبەتەکەی خستەوە سەر زەوی، چونکە هەستی بەوە کرد، لە ئەنجامی لاملی ئەو ژنە خەریکە تووڕەیی تینی بۆ دێنیت. زانی لە ئاکامی بەردەوامی ئەو لاسارییە پێویستی بە جووڵەی هەر دوو دەستی دەبێت، ترسا لەوەی زیانێک بە زارۆکەکە بگات. بەڵام سەرەتا هەردوو دەستی خۆی لە پشتەوە لە یەک گرێ داو ورگی خۆی لە دایەن نزیک خستەوەو پێی گوت:

- "کەواتە تۆ دەتەوێت بانگەشەی ئەوە بکەیت، گوایە دەزانیت بۆنی منداڵێکی خودا دەبێت چۆن بێت، پێشەکیش حەز دەکەم ئەوەت بە بیر بهێنمەوە، کە ئەو منداڵە ئاومۆر کراوە!"

دایەن وەڵامی دایەوە:

- "بەڵێ!"

- "دواتریش بانگەشەی ئەوە دەکەیت، ئەگەر ئەو منداڵە ئەو بۆنەی لێ نێت کە تۆ دەتەوێت لێی بێت، تۆ ژان بویسی دایەنی شەقامی سانت دێنی! ئەوا ئەو منداڵە منداڵی شەیتانە؟"

دەستی چەپی خۆی لە پشتەوەی راپسکاند و هێنایە پێشەوەو، بە شێوەیەکی هەڕەشەئامێز پەنجەی ئاماژەی خۆی لە وێنەی نیشانەی پرسیار چەماندەوەو خستییە بەر دەموچاوی ژنە.

دایەن بیری کردەوە، شتێکی راست نییە قسەکان ئاوا بەو ئاراستەیە بڕوات و بە جارێک ببێتە دانوستاندنێکی ئایینزانی، کە دیارە ئەو تێیدا دۆڕاو دەبیت. وەڵامی دایەوە:

– من ئەوەم گەرەک نەبووە، کە بڵێم شتەکە پەیوەندی بە شەیتانەوە هەیە یان نا، ئەوە پێویستە جەنابتان بڕیاری لەسەر بدەن، ئەی باوکی قەشە، تێریی، من حەددی ئەوەم نیە. من هەر ئەوەندە دەزانم، من لەو منداڵە دەترسم، چونکە ئەو منداڵە بۆنی وەک منداڵەکانی تر نیە."

تێریی بە ئاسوودەییەوە وتی:

– "ئەها"، ئەوجا دیسان دەستەکانی بە خۆی شۆڕکردنەوەو لە قسەکانی بەردەوام بوو: "کەواتە واز لە مەسەلەی شەیتانەکە دەهێنین. باشە. ئێستا پێم بڵێ، بە باوەڕی تۆ، ساواییێکی شیرەخۆرە چ بۆنێکی لێ دێت، کە لەم زارۆکە نایەت، ها؟" دایەنەکە گوتی:

– "بۆنێکی خۆشی لێ دێت". تێریی نەڕاندی بەسەریا:

– "زۆر شت بۆنی خۆشیان لێ دێت، چەپکەگوڵی لالە بۆنی خۆشی لێ دێت، گۆشتاو بۆنی خۆشی لی دێت، باخچەکانی عەرەبستان بۆنی خۆشیان لێ دێت. من دەمەوێت بزانم منداڵ چ بۆنێکی لێ دێت؟"

دایەن بیری کردەوە. ئەو زۆر باش دەیزانی کە منداڵی شیرەخۆرە چ بۆنێکی لێ دێت، ئەو شیری دابووە چەندین منداڵ، خزمەتی کردبوون، ڕایژەنیبوون، ماچی کردبوون... ئەو دەیتوانی لە شەوی تاریکدا بە بۆن بیاندۆزێتەوە. بەڵام هەرگیز بە وشە ناوی لەم بۆنانە نەنابوو. تێریی حەپاندی:

- "نا"

ئەمەی وت و بەبێ ئارامی بە پەنجەکانی کەوتە چەقەنە لێدان. دایەن هاتە قسە:

- "چ بۆنێکی لێ دێت؟ ئەوە شتێکی ئاسان نیە بە دەم بیلێیت، چونکە... چونکە، بۆنی هەموو شوێنێکیان وەکوو یەک نیە، هەرچەندە هەموو شوێنێکیان بۆنی خۆشیان لێ دێت. تێگەیشتی گەورەم، بۆ نموونە پێیەکانیان بۆنی بەردێکی گەرمی لووسیان لێ دیت، نا بۆنی مەنجەلیان لێ دێت، یان بۆنی کەرە، بۆنی کەرەی تازە، بەڵێ بە تەواوی: بۆنی کەرەی تازەیان لێ دێت... جەستەشیان بۆنی... بۆنی کێکێکی لێ دێت کە خرابێتە ناو شیر. سەریشیان، ئێرە لای سەرەوە، پشتی سەر، لەو شوێنەی کە قژ لە پنتێکدا سوڕیان خواردووە، تەماشا گەورەم ئەلیرە، ئەو شوێنەی سەری تۆ قژی پیوە نەماوە...،پتی خۆی خستە سەر سەری رووتاوەی قەشە، قەشەش تا ئێستا گوێی خۆی قوڵاغ کردبوو بۆ زنجیرەی ئەو باسە گێلاتییە پڕ

وردەکارییە، ماوەیەک هیچ قسەیەکی بۆ نەهات، سەری خۆی کەچ کردبوو، گوێڕایەلانە گوێی لێ گرتبوو:

ــ "لێرە بە تەواوی ئەلێرەیان بۆنێکی لە هەمووان خۆشتر دێت. بۆنی کارامێلی لێ دێت، بۆنێکی زۆر شیرن، بۆنێکی زۆر خۆش، جەنابی قەشە، هیچ بیری لێ مەکەرەوە، منداڵی خۆتە یان نا، ئەگەر ئێرەیانت بۆن کرد، خۆشت دەوێن، جا منداڵی خۆت بن یان هی بێگانە، گرنگ نیە، پێویستە منداڵ ئاوا بۆنیان بێت و بۆنێکی تریان لێ نەیەت. ئەگەریش هیچ بۆنێکیان لێ نێت، هیچ بۆنێک لێرە لەسەرەوەی سەریان نێت، بۆنی هەواییێکی ساردیشیان لێ نێت، هەر وەکوو ئەو منداڵە، وەکوو ئەو جانەوەرە،... ئەوا گەورەم ئێوە دەتوانن چۆن بخوازن ئاوا لێکی بدەنەوە، بەڵام من" –دەستەکانی خۆی لە ژێر مەمکەکانی خستبووە سەر یەکتری و بە قێزەوە تەماشای سەبەتەکەی ژێر پێی خۆی دەکرد، وەک ئەوەی سەبەتەکە بۆقێکی تێدا بێت– من ژان بویسی جارێکی تر ئەوەیان ناگرمە خۆم!"

باوکە تێریی، بە هێواشی سەری خۆی بەرزکردەوە، چەند جارێک پەنجەکانی بە سەرە رووتاوەکەی خۆی داهێنا، وەک ئەوەی بیەوێت قژی خۆی رێکبخات، پاشان دەتگوت بە رێکەوت پەنجەکانی خستە ژێر لووتی و، بە بیرکردنەوە کەوتە بۆنکردن. پرسی:

– "بۆنێک وەک بۆنی کارامێل...؟" ئەمەی وت و هەوڵی دا کە دەنگی خۆی بێنێتەوە سەر باری گرانی خۆی: "کارامێل، جا تۆ هیچ لە کارامێل دەزانیت؟ چ جارت خواردووە؟" دایەن وەڵامی دایەوە:

– "راستەوخۆ نەمخواردووە، بەڵام جاریکیان لە  مێوانخانەیەکی گەورە، لەسەر جادەی سانت ئۆنۆرێ دیتم چۆنیان دروست دەکرد، لە شەکری کوڵاو و سەرتوێژ، ئەوەندە بۆنی خۆش بوو، هەرگیز بۆنەکەیم لە یاد ناچێت."

– "بەڵێ بەڵێ، ئەوە وایە" تێریی ئەمەی گوت و پەنجەکانی لە کەپوی دوورخستەوە: "تکایە ئیتر بێ دەنگ بە! بۆ من دژوارە لەسەر ئەو ئاستە چیتر لەگەڵ تۆ قسە بکەم. ئێستا تێگەیشتم بە هەر هۆیەک بێت، تۆ ناتەوێت ئەو شیرەخۆرە، جۆن پاتیست گرێنوی، ببەیتەوە لای خۆت و شیری بدەیتێ، بەمەش لێپرسراویەکەی دەدەیتەوە دێری سانت ماری. من ئەوەم لەلا زۆر خراپە، بەڵام ناتوانم شتێک لەمە بگۆڕم، ئیتر تۆ لەم کارە ئازاد بووی."تێریی سەبەتەکەی هەڵگرت و هەناسەیەکی تریشی لە هالاوی گەرمی شیرە بۆن خوریەکە هەڵمژت و دەروازەکەی داخست و چووە نووسینگەکەی خۆی.

# ٣

پێتەر تێریی قەشە پیاوێکی تێگەیشتوو بوو. تەنها ئاینزانی نەخوێندبوو، بەڵکو بەرهەمی فەیلەسووفەکانیشی خوێندبووەو، لابەلاش خۆی بە رووەکزانی و کیمیاش خەریک کردبوو. هەندێک سەرنج و تێبینی رەخناوی بەرامبەر بیروباوەڕەکەی خۆی هەبوو، هەرچەندە ئەوەندەش زێدەڕۆیی نەکردبوو، وەک هەندێ کەسی تر، کە پەڕجووەکان و غەیبزانی، یان هەقیقەتی دەقە پیرۆزەکان بخاتە ژێر پرسیار. ئەگەریش هەندێکییان بە تەماشاکردنی توندگرانە، بە پێێ ژیریی، رۆشن نەدەکرانەوەو، بەڵێ تەنانەت راستەوخۆ رەت دەکرانەوە. ئەو وای پێ باشتر بوو، کە خۆی لەم کێشانە بەدوور بگرێت، ئەو کێشانە ئەویان ناڕەحەت دەکرد و دەبوونە هۆی دڵەڕاوکێ و نائارامیەکی نەگونجاو، لە کاتێکدا وا پێویست بوو، کە ئەو ژیرێتییەکەی خۆی لە پێناوی دڵنیایی و ئارامی بەکاربهێنیت. بەڵام ئەوەی کە بێ ئەملاو ئەولا ئەو بڕیاری بەربەرەکانێی دابوو، بریتی بوو لە ئەندێشەو خەیاڵاتی پڕ لە خەرافاتی خەڵکی سادە: جادووبازی و کارت خوێندنەوە، نوشتە، چاوپیسیی، سیحر، شەوەو جادووی مانگیڕی و هەموو ئەو بەندوباڵۆرانەی کە هەبوون، ئەمە لای ئەو جێگەی خەمێکی قووڵ بوو، کە دەدیترا، هەزار ساڵ دوای دامەزران و جێگیربوونی ئۆلی مەسیحایی، هێشتان ئەو خەرافات و باوەڕە کافریانە بنبڕنەببوون! هەروەهاش شێتی، بە هۆی دەست لێ وەشاندنی جنۆکەو، هاوپەیمانێتیی لەگەڵ شەیتانیش، بە لێ وردبوونەوەو سەرنجدان لێیان لە نزیکەوە، دەرکەوتووە وەکو ئەوانەی تر خەرافیاتن. هەرچەندە تێریی ئەوەندە دوور نەدەرۆیشت، کە نەهی لە بوونی خودی شەیتان، یان گومان لە دەسەڵاتەکەی بکات. بۆ بڕیاردان لە پرسێکی ئاوا، کە پەیوەندی بە بناغە دارێژراوەکانی ئاینزانی هەیە، پێویستی بە بڕیاری دەزگاو دەسەڵاتی بەرز هەیە، نەک هی قەشەیەکی سادەو بچووک. لە لایەکی تر، وەک رۆژی رۆناک دیار بوو، کاتێک کەسێکی وەکو ئەو دایەنە بێت و بانگاشەی ئەوە بکات، کە بەچکەشەیتانێکی دۆزیوەتەوە، ئەوا هەرگیز نەکراوەو نابێت ئەو کارە پەیوەندی بە شەیتانەوە هەبێت. ئەگەریش ئەو ژنە بەڕاستی باوەڕی وابێت، کە شتێکی شەیتانیی دۆزیوەتەوە، ئەوە هەر بۆخۆی بەڵگەیەکی رۆشن

بوو لەسەر ئەوەی، کە هیچ شتێکی شەیتانیی لە ئارادا نەبووە تا ئەو بێت و بیدۆزێتەوە،. چونکە شەیتان ئەوەندە خۆی گێل ناکات، وا بە ئاسانی لێ بگەڕێت، لەلایەن ژان بویسییێکی دایەن ئاشکرا بکرێت. ئەوجا بە چیش بە کەپوو! بە سادەترین ئەندامی بۆنکردن، نزمترینی هەستەکان! وەک ئەوەی دۆزەخ بۆنی گۆگرد و، بەهەشتیش بۆنی بخوور و مایرەی لێ بێت! خراپترینی خەرافییاتان، وەک هی کافرترین کافری سەردەمەکانی پێشوو، هی ئەو سەردەمانەی مرۆڤەکان وەک گیانەوەران دەژیان و هێشتان خاوەنی دیدی تیژ نەبوون، ڕەنگەکانیان نەدەناسی، بەڵام باوەڕیان وابوو کە دەتوانن بۆنی خوێن بکەن و، بەو بۆنە دۆست و دوژمن لێکتر جیا بکەنەوە، ئەو مرۆڤانەی هێشتان بە نەڕەو لووڕەی فەلامەرزە یەکترخۆرەکان و ئەو مرۆڤانەی کە مانگ پڕ دەبوو، شێوەیان دەگۆڕاو دەبوون بە گورگی چاوشین، دەورە گیرابوون، دەکەوتنە بەر تۆڵەی ئێرینیانی خودای تۆڵە، قوربانی سووتاوی بە چڕەدووکەڵیان دەبرد بۆ خودا چەپەڵەکانیان. عەجایب! پتر لە چاوان، گیلان بە بۆن دەناسێت! لەوانەیە پێویست بەوە بکات، چرای ژیری، کە خودا بەخشیویەتی، هێشتان هەزارساڵی تریش بدرەوشێتەوە، ئەوسا دوایین ماوەی ساکارترینی باوەڕان، بڕەوێتەوە.

"ئاخ، ئەدی ئەو زارۆکە بچووکە هەژارە! ئەو بەستەزمانە بێ گوناهە! لە ناو سەبەتەکەی خۆی کەوتووەو نووستووە، هیچ ئاگای لەو بەدگومانییە قێزەوەنە نیە. کە لە دژیدا هەڵبەستراوە. تۆ بۆنت لێ نایەت، ئەو بۆنەی کە پیویستە لە بەچکەمرۆڤ بێت، ئەو بێ شەرمە زاتی ئەوە دەکات، ئەو بانگاشەیە بکات. بەڵێ، ئەدی ئێمە چی دەڵێێن لەو بارە؟ پش پش!

سەبەتەکەی خستە سەرکۆشی و دەستی کرد بە ڕاژەنینی، بە پەنجەکانی منداڵەکەی نەوازش کرد، پەنجەکانی بە سەری منداڵەکە دادەهێناو ناوە ناوە دەیگوت: "پش پش!"، لای ئەو، ئەو دەربڕینە بە ناسکی کار لە منداڵی بچووک دەکات و ئارامی پێ دەبەخشێت. "تۆ پێویستە بۆنی کارامێلت لێ بێت، ئای لەو قسە بێ مانایە،

پش پش!" پاش کەمێک پەنجەکەی خۆی کێشایە دواوەو، بردیە بەر لووتی خۆی، بۆنی کرد، بەڵام هیچ بۆنێکی لێ نەدەهات، جگە لە بۆنی تورشی، کە نیوەڕۆ خۆی خواردبووی.

تێریی هەڵوێستەیەکی کەمی کرد، تەماشای ئەملاو ئەولای خۆی کرد، نەبادا یەکێک چاودێری کردبێت، سەبەتەکەی هەڵگرت و بەرزی کردەوە، لووتە گەورەکەی خۆی بردە ناو سەبەتەکە. لووتی خۆی ئەوەندە لێ نزیک کردەوە، کە قژی سوورکاوی منداڵەکە ختووکەی لووتی دا، سەری زارۆکەکەی بۆن کرد، بە هیوای ئەوەی، هەست بە بۆنێک بکات. ئەو بە تەواوی نەیدەزانی، کە سەری زارۆکان چ بۆنێکیان لێ دێت. بەڵام بێگومان بوو لەوەی کە بۆنی کارامێلیان لێ نایەت، ئەوە

لای ئەو رۆشن بوو، چونکە کارامێل بریتییە لە شەکری کوڵاو، جا چۆن دەبێت، ساوایێک تەنها شیری خواردبێتەوە، بۆنی شەکری کوڵاوی لێ بێت. لەوانەیە بۆنی شیری لێ بێت، بۆنی شیری دایەن. بەڵام ئەو زارۆکە بۆنی شیریشی لێ نەدەهات. لەوانەیە بۆنی قژی لێ بێت، بۆنی قژ و پێست، یاخود کەمێک بۆنی ئارەقەی منداڵان. تێریی بۆنی کرد و، خۆی بۆ ئەوە ئامادەکردبوو، کە بۆنی پێست، قژ، یان کەمێک بۆنی ئارەقەی منداڵان، بکات. بەڵام ئەو بۆنی هیچی نەکرد. هەموو هێزی بۆنکردنی خۆی خستە کار، بەڵام بۆنی هیچی نەکرد. لەوانەیە زارۆک بۆنی هیچیان لێ نەیەت، وا بیری کردەوە، دەبێت وا بێت. ئەگەر زارۆکێک بە خاوێنی رابگیریت، ئەوە بۆنی لێ نایەت، هەروەک چۆن ناتوانیت قسە بکات، بڕوات یان بنووسێت. ئەو شتانە وردە وردە لەگەڵ گەورەبوونی تەمەن دێنە کایەوە. خۆ ئەگەر راستیت دەوێت، مرۆڤ ئەو کاتە بۆن و بەرامەی لێ دێت، کە خۆی دەناسێت. ئەوها و هیچی تر. ئەدی هۆراس نەینووسیوە: "لاوەکە بە تەگە هات، کچەکەش گەشاوەو بۆنێکی خۆشی وەک بۆنی نێرگسی سپی لێ هات..."؟ رۆمەکانیش هەندێک تێی گەیشتبوون! کە وتووبوویان بۆنی مرۆڤ هەمیشە بۆنێکی گۆشتاویە، واتە بۆنێکی گوناهاوی. کەواتە زارۆکەیەک، کە هێشتان لە خەونیشدا بۆنی گوناهی نەکردووە، چ بۆنێکی لێ دێت؟ پش پش! هیچ بۆنێکی لێ نایەت!دیسان سەبەتەکەی بە ئارامی خستەوە سەر چۆکی خۆی و دەمێکی کەم بە ئارامی تێی ڕاما. منداڵەکە هێشتان لە خەوێکی قووڵ دابوو. چەچۆکەی راستی لە ژێر پۆشاکەکە هاتبووە دەرەوە، چەچۆکەیەکی سوور و بچکۆڵە، جارجار رادەچەنی و بەر روومەتی دەکەوت. تێریی زەردەخەنەیەکی هاتێ و، لە ناکاوێک هەستی بە ئارامییەکی زۆر کرد. بۆ چاوتروکانێک ئەندێشەکانی خۆی ئازاد کرد، بە خەیاڵی داهات، کە ئەگەر خۆی باوکی ئەو منداڵە بێت، قەشە نەبێت و هاونیشتمانییەکی ئاسایی بێت، لەوانەبوو پیشەگەرێکی رێککار بووایە، ژنێکی بۆخۆی هێنابایە، ژنێکی باوەش گەرم و خۆشی بۆن شیر، پێکەوە کوڕێکیان دەزایاند، ئێستا ئەلێرە لەسەر ئەژنۆکانی خۆی هەڵیدەپەڕاند، منداڵی خۆی، پش پش!... بەو فەنتازیایە هەستی بە بەختەوەرییەک کرد. فەنتازیاکەی شتهایێکی ڕەوا بوو. باوکێک منداڵەکەی خۆی لەسەر ئەژنۆکانی خۆی هەڵدەپەڕێنێت، پش پش! ئەمە وێنەیەکی زۆر دێرینە، ئەوەندەی دنیا دێرینە، هەمیشەش وێنەیەکی راست و نوێیە، تا ئەو کاتەی جیهان دەمێنێت، ئاخ بەڵێ! تێریی برێک لە دڵەوە گەرم هەڵگەڕاو هەستی بە خۆشییێکی سادە کرد. لێرەدا بوو کە منداڵەکە واگا هات. یەکەمجار لووتی واگا هات. لووتە بچووکەکەی جووڵایەوە، بەرەو سەرەوە راکشاو بۆنی ئەو ناوەی هەڵمژی. هەوای هەڵدەمژی و بە هەناسەدانەوەی کورت کورت دەیدایەوە دەرەوە، وەک نیوە پژمینێک. پاشان وەک

ئەوەی قێزی بووبێتەوە، لووتی خۆی گرژ کرد و چاوەکانی کردەوە. ڕەنگی چاوەکانی ڕەنگێکی دیاری کراو نەبوو، لە نێوانی بۆرێکی وەک گوێچکەماسیی و ڕەنگی بەردەشییردا بوو، بە چەرمێکی لیچ داپۆشرابوون، وا دەردەکەوت کە هێشتان زۆرباش نەبینێت. تێریی زەینی بۆ ئەوە چوو، کە پێچەوانەی لووتی، چاوەکانی هەر هەستییان بەو نەکرد. لە کاتێکدا چاوە خامۆشەکانی بێ ئامانجێکی دیار، خێل هەڵگەڕابوون، وا دەردەکەوت کە لووتی خەریک بوو بە دوای ئامانجێکی دیار سێرەی دەگرت، تێریی بەتەواوی لەوە دڵنیا بوو، کە ئەوە ئەو، تێریی، خۆیەتی بووە بە ئامانجی سێرەگرتنی ئەو لووتە. هەردوو دەفەی ئەو لووتە وردیلە، لە دەوری دوو کونۆچکەی ورد، لە ناوەندی سەری منداڵەکە، هەڵدەمسان وەک خونچەیەکی گەش بووەوە، یان باشتر وەک پەڕی رووەکێکی بچووکی گۆشتخۆر، ئەوەی کە لە باخچەی رووەکەکانی پاشا، دەبینرێت. تەواو وەک ئەو رووەکە، هەڵمژەهێزێکی، یان هێزێکی هەڵلوشینی سەیر، لەو لووتەوە خۆی پێشان دەدا. وەک ئەوە وا بوو، کە منداڵەکە بە لووتی تەماشای تێریی بکات و زۆر بە سافی ئەو ببینێت و سەرنجی بداتێ، دیتنێک روونتر لە توانای دیتنی چاو، وەک ئەوەی شتێک لە لووتی منداڵەکە گیر بوو بێت، شتێک کە لەم، لە تێرییەوە، دەرچووبێت و ئیتر لە دەست دەرچووبێت و توانای گێڕانەوەو شاردنەوەی نەبێت... منداڵە بێ بۆنەکە، بێ شەرمانە ئەوی بۆن دەکرد، ئاوها! ئەو منداڵە بۆنەکانی ئەوی هەڵدەمژی! تێریی لە ناکاوێک، بە جارێک خۆی بۆگەن هاتە بەرچاو، بۆنی ئەرەق، بۆنی سرکە، بۆنی تورشی، بۆنی جلە نەشۆراوەکانی. خۆی ڕووت و ناشیرن هاتە بەرچاو، وەک ئەوەی لەلایەن کەسێکەوە تەماشا بکرێت و بپشکنرێت، بەڵام ئەو کەسە هیچی خۆی پێشانی ئەو نەدات. وا دەردەکەوت، کە ئەو منداڵە بە تەوژمی بۆنکردنی، پێستی تێریی کونبەدەر دەکات و ، تا قووڵاییترین دیوی ناوەوەی، بۆنی تێریی هەڵدەمژێت. ناسکترین هەست، پیسترین ئەندێشە، بەو لووتە فزوولە وردیلە، ئاشکرا دەبن، بەو لووتە، کە هێشتان نەڕسکاوەو نەبووە بە لووتێکی راستەقینە، بەڵکو تەنها بریتیە لە پۆقژەیەک، لە ئەندامێکی لۆچداری هەڵایساوی، لەرزیوی وردیلە. تێریی سەری سوڕما. بێزی بووەوە. لووتێ خۆی کێشایە دواوە، وەک ئەوەی خۆی لە شتێکی بۆن ناخۆش دوور بخاتەوەو، نەیەوێت ئەو شتە هیچ پەیوەندییێکی بەوەوە هەبێت. ئەو ئەندێشەیەی کە بۆی هاتبوو، ئەو شتە لە گۆشت و ئێسقانی ئەو بێت، ئیتر بەسەر چوو، دیمەنی جوانی سادەی باوک و کوڕ و دایکێکی بۆنخۆش ڕەشبووەوە. وەک ئەوەی، کە تارای ئەو ئەندێشە خۆشەی لێ هەڵبزڕێت، ئەو فانتازیایەی بۆ خۆی و منداڵەکە بە جوانی سازی کردبوو: بوونەوەرێکی نامۆ، سارد، کەوتبووە سەر ئەژنۆکانی، گیانەوەرێکی ناحەز. ئەگەر بێت و ئەو کەسایەتییێکی تایبەتی وا

له خواترس و، هۆشمەند نەبووایە، ئەوا بە فڕکەیەک، لەبەر قێزبوونەوە، وەک جاڵجاڵۆکەیەک تووڕی هەڵدەداو لە خۆی دوور دەخستەوە.

یەکپێ هەستایە سەرپێ و سەبەتەکەی لەسەر مێزەکە دانا. ئەو ویستی خۆی لەم شتە دەرباز بکات، تا دەکرێت زوو، تا دەکرێت زوو، گەر بکرێت دەسبەجێ.لەو کاتەدا بوو، زارۆکەکە دەستی کرد بە زریکاندن. چاوەکانی خۆی قوچاند، دەمە سوورەکەی خۆی بەش کردەوە، یەک بەدەنگی خۆی و بێ وچان دەستی بە زریکاندن کرد، بە شێوەیەک خوێن لە دەمارەکانی تێریی مەیی. دەستی خۆی درێژ کردو سەبەتەکەی راژەند و نەڕاندی: "پش پش"، تا منداڵەکە هێور بێتەوە، بەڵام منداڵەکە هێندەی تر قایم نەڕاندی، دەموچاوی تەواو شین هەڵگەڕا، دەتگوت ئێستا لەبەر نەڕەنەڕ دەتەقێت. لای بەن! تێریی بیری کردەوە، بۆ چرکەیەک هاتە خەیاڵی کە بڵێت: "ئەو شەیتانە لا بەن!" بەڵام دانی بەخۆدا گرت و خۆی وێک هێنایەوە... لای بەرن، ئەو جانەوەرە، لای بەرن ئەو منداڵە دژوارە! بەڵام بۆ کوێ؟ ئەو چەند دایەن و هەتیوخانەیەکی ناس دەکرد لە ناوچەکە، بەڵام ئەوانە لەو نزیک بوون، بۆ ئەو وەک پێستی خۆی نزیکبوون، ئەو دەیویست ئەو شتەی پتر لێ دوورخرابایەوە، ئەوەندە دوور، کە گوێی لە دەنگی نەبووایە، ئەوەندە دوور، کە نەتوانرابایە، هەموو رۆژێ بیهێننەوە بەر دەرگای، ئەگەر بکرابا، دەبووایە بنێردرابایە بۆ جڤاتێکی تر، بۆ سنووری بەڕێوەبەرایەتی جڤات و دێرێکی تر، بۆ ئەو بەرەکەی تر، بەڵام لە هەمووی باشتر ئەوە بوو، رەوانەی ئەودیوی شوورەی شار بکرابایە، بۆ فۆبۆورگ سانت ئەنتوان. ئەوەبوو ئەو جەستە زریکەدارە نێردرا بەرەو ئەوێ، دوور دوور بەرەو رۆژهەڵات، بۆ ئەو بەری باستیل، بۆ ئەو جێگەیەی شەوان خەڵک دەرگاکانی خۆیان قوفڵ دەدا. ئاوها، تێریی سەلتەی قەشاتی خۆی هەڵکردو پڕی دایە سەبەتەکەو بە نەڕە نەڕ ڕای کرد، بەناو کوچەو کۆڵانەکاندا ڕایکرد، ڕایکرد بۆ جادەی فۆبۆورگ سانت ئەنتوان، دوور، دوور، بەرەو دەرەوە تا شەقامی شارۆن، نزیکە تا کۆتایی، بۆ ئەو شوێنەی کە ئەو لە نزیک دێری مادلین دێ ترێنێ، شارەزای ناونیشانێک بوو، بە ناوی مادام گایارد، ئەوەی کە هەموو منداڵێکی، لەهەر تەمەنێک بووایە، بە پارە دەگرتە خۆی، تا ئەو کاتەی کەسێک هەبووایە، پارەی بەخێوکردنەکەی بدابایە، ئەویش منداڵەکەی، کە هێشتان هەر دەیزریکاند، دایە ئەو، پێشەکی پارەی ساڵێکی بۆ داو بە هەڵاتن گەڕایەوە شار، کە گەیشتەوە دێرەکەی خۆی، بە پەلە جلەکانی خۆی فڕێ دا، وەک ئەوەی شتێکی لەکەدار فڕێ بدات، خۆی لە تەپلی سەرەوە تا ژێر پێی شووشت و چووە حوجرەکەی خۆی و خزایە بن جێ، چەندین جار نیشانەی خاچی کێشاو، زۆر دوعای خوێند، تا کەمێک ئارام بووەوەو هێدی هێدی بە یەکجاری

خەوی لێ کەوت.مادام گایارد هێشتان نەببوو بە سی ساڵ، بەڵام ژیانی خۆی ژیا بوو، ئاردی خۆی بێژتبوو، کەپەکی خۆی ڕێژتبوو. تەمەنی بە چاو هەر بە قەد تەمەنی ڕاستی خۆی دیار بوو، لە هەمانکات دوو بە قەد تەمەنی خۆی، بگرە سێ و سەدیش بە قەد تەمەنی خۆی پیر دەهاتە بەرچاوان، باشترە بڵێین، مۆمیای کچێک چۆنە، وا بوو، لە ناوەوەش لە مێژ بوو مردبوو. کە منداڵ بوو، باوکی ماشەیەکی لە تەختی هەنیەی دابوو، ماشەکە بە سەرەوەی ڕەگی لووتی کەوتبوو، ئیتر لەو کاتەوە هەستی بۆنکردنی لەدەستدابوو، نەک هەر ئەوە بەڵکو هیچ هەستێکی نەما بوو، بەرامبەر هەست و سۆزە گەرمەکانی مرۆڤ، یان سارد و سرپەکانی مرۆڤ، بگرە بەرامبەر هەموو ئازار و مەینەتەکانیش. بەزەیی، ناسکی و خۆشەویستی، بەو لێدانە لای ئەو ببوون بە شتی نامۆ، هەر ئاواش ترس، خۆشحاڵی، بێ چارەیی و بەدبەختی، لای ئەو هەمووی نامۆ ببوون، هەستی بە هیچ نەدەکرد، دواتر کە لەگەڵ پیاوێک جووت بوو، پاشانیش کە منداڵەکانی زایاند، هەر هەستی بە هیچ نەکرد. هیچ پەژارەیەک داینەگرت و هیچ پرسەیەکی دانەنا بۆ مردووەکانی، هیچ خۆشییەکیشی بەوانە نەهات، کە بۆی مابوونەوە. کە مێردەکەی لێی دەدا، تەقەی سەری دەهات، کە مێردەکەشی لە هۆتێل دییۆ بە نەخۆشی ڕشانەوە مرد، هەستی بە هێچ بارسووکبوونێک نەکرد. تەنها دوو شت بە ئاستەم سەرنجی ئەویان ڕادەکێشاو پێیان ئاشنا بوو، ئەوانیش هاتن و چوونی ژانەسەرەکەی بوون، مانگانە کە ژانەسەرەکەی دەیگرت، بە سووکی پەستی دەکرد، دووەمیشییان کە ژانەسەرەکەی، بەریدەدا، دەنا ئەو ژنە مردەلە هەستی بە هیچ نەدەکرد. لە لاییکی تر، کە لەوانەیە ئەویش هەر بە هۆی مردنی هەستەکانی سۆز و بەزەیی بێت، مادام گایارد هەڵوێستێکی بێ ئەملاو ئەولای هەبوو بۆ نیزام و دادپەروەری. لە نێوان ئەو منداڵانەی کە بەو سپاردرابوون، هیچ جیاوازییەکی نەدەکردو کەسیانی پێش کەسیان نەدەخست و کەسیانیشی لەبەر خاتری ئەوانەی تر فەرامۆش نەدەکرد. ڕۆژی سێ ژەم خۆراکی دەدا بە هەریەکەیان، قەپاڵێکیشی پتر نەدەدا بە هیچیان. بچووکەکانی ڕۆژێ سێ جار قۆنداغ دەکرد، بەڵام تەنها تا پێیان دەنایە تەمەنی دووساڵی، ئیتر دواتر هەر یەکێکیان خۆی پیس بکردبایە، ئەوا بێ پێشگلەیی شەقازللەیەکی وەردەگرت و ژەمە خواردنێکی لێ کەم دەکرایەوە. بە تەواوی نیوەی ئەو پارەی کە وەری دەگرت، بۆ منداڵەکانی خەرج دەکرد و بە تەواویش نیوەکەی تری بۆ خۆی گلدەدایەوە. لەو کاتانەی کە هەرزانی دادەهات، هەوڵی نەدەدا دەستکەوتی خۆی زۆرتر بکات، بەڵام لە کاتەکانی گرانیش، ئەگەر مەرگ و مردنیشی لێ کەوتبایەوە، یەک قڕانی خۆی لەسەر دانەدەنان. ئەگەر نا ئەو کارە ئەوەندەی نەدەهێنا، ئەو خۆی پێوە خەریک بکات. ئەو پێویستی بە پارە هەبوو. ئەو حسێبی خۆی بە

تەواوی ڕاگرتبوو. دەیویست بۆ کاتی پیری خانەنشینییەک بە کڕین بۆ خۆی مسۆگەر بکات، جگە لەمەش دەیویست ئەوەندەشی دەستبکەوێت، کە لە ماڵی خۆی بمرێت و وەک مێردەکەی لە هۆتێلی دییێ قاچەکانی درێژنەکات، هەرچەندە ئەو مردنی مێردەکەی وا بە هەند وەرنەگرتبوو، بەڵام، لەم جۆرە مەرگە بە کۆمەڵە، لەگەڵ سەدان مرۆڤی نەناسی تر، چاوترساو ببوو. ئەو دەیویست بەشی ئەوەندەی هەبێت، کە بتوانێت بۆ خۆی بە تاقی تەنێ و بە تایبەت بمرێت، بۆیەشە پێوستی بە نیوەی تەواوی کرێی کارەکەی هەبوو بۆ خۆی. ڕاستە زستانی وا هەبوو، لە دوو تاخمی مێوانە بچکۆڵەکانی سێ چوارێکی لێ دەمردن، لەگەڵ ئەوەش، ئەو ڕێژەی مردنە زۆر باشتر بوو لە چاو مردنی منداڵان لەلایەن زۆربەی دایەنە تایبەتەکانی تر، هەروەهاش لە خانەکانی منداڵانی سەر بەدەوڵەتیش، یان سەر بە دێر و کڵێساکان، کە زۆبەی جاران نۆ لە دەی منداڵەکانیان دەمردن، بەڵام دانەدامان، چونکە منداڵی دۆزراوەو سێوی کەم نەبوون، زۆر هەبوون جێیان بگرنەوە، لە پاریس ساڵانە دە هەزار منداڵ لە دایک دەبوون، منداڵی سێوی و بیژی. بۆیە ئەگەر هەندێ جار دایەن دەستنەکەوتبایە، دەبوو بە کێشە. بۆ گرێنوی بچکۆلانە خانەکەی مادام گایارد، دوو شەش بوو، دەنا لەوانە بوو لە هیچ شوێنێکی تر، بە زیندوویی ڕزگاری نەبووایە. لای ئەو ژنە کەمئەندێشەیە گرێنوی گەشایەوە. ئەو کەوتبووە ناو دامودەزگاییکی جێگیر. هەرکەسێک وەک ئەو لە ناو زبڵ و پاشەڕۆک لەدایکببێت و ڕزگاری ببێت، وا بە ئاسانی واز لە دنیا ناهێنێت. ئەو دەیتوانی بە درێژایی ڕۆژ شۆربای ئاوئاسا بخوات، ئەو بە ڕۆنترین شیریش دەیبردە سەر، ڕزیوترین سەوزەو بۆگەنترین گۆشتی پێ دەکەوت. لە ژیانی منداڵیدا، لە نەخۆشییەکانی سۆریکە، زگچوون، ئاوڵە، کولێرا ڕزگاری ببوو، لە کەوتنە ناو بیرێکی شەش مەتر قووڵ، سووتانی سک و سینگ بە ئاوی کوڵاو، لەوانە هەموو دەربازی ببوو. هەرچەندە جێبرین و لۆچ و شەق و کەمێک پێ سەقەتی پێوەمابوو، کە تووشی لەنگینی کردبوو، بەڵام ئەو ژیاو نەمرد. وەک بەکتریاییێکی بەرگەپەیداکردوو، چیڕ ببوو، یاخود وەک گەنەیەکی وا بوو، کە بە ئارامی خۆی بەسەر درەختێکەوە مات دابێت و بە تنۆکە خووێنێکی زۆر بچووک بژیت، کە پێش چەندین ساڵ هەڵی مژتبێت. تەنها بڕۆکەیەکی زۆر کەم خۆراک و چەند تیلمە و جل بۆ سەرجەستەی بەس بوو بۆ ئەو. گرێنوی هیچی گەرەک نەبوو بۆ گیانی. هەستکردن بە دڵنیایی، نەوازش و ئاوڕلێدانەوە، دەست بەسەرداهێنان، بەزەیی و سۆز و خۆشەویستی، یان هەموو شتێکی لەو بابەتە، جا هەرچیان پێ بووترێت، ئەوەی کە گوایە منداڵان پێویستییان پێ هەیە، بۆ گرێنوی بە تەواوی پێویست نەبوون. پتر وا دەکەوتە بەرچاوی ئێمە، کە ئەو هەر لە سەرەتای ژیانییەوە، خۆی وای کردبوو، کە پێویستی بەو شتانە نەبێت، بۆ

ئەوەی بتوانێت دەربازببێت و بژیت. زریکەی دوای زانی، زریکەکەی ژێر مێزی شەقوپەقکردنی ماسی، کە بە هۆیەوە خۆی خستەوە بیری خەڵک و دایکی خۆی بۆ سەر سێدارە نارد، زریکەیەکی زاماکیی ئاسایی نەبوو، بۆ راکێشانی هاوسۆزی و هەستی بەزەیی و خۆشەویستی بەلای خۆیەوە، بەڵکو زریکەیەکی بیرلێکراوە بوو، نزیکە پیاو حەز دەکات بڵێت، زریکەیەکی هۆشیاری تەواو بە لێکدانەوە بوو، کە بە هۆیەوە ئەو نەوزادە ***دژی*** خۆشەویستی و هەروەهاش ***بۆ*** ژیان، بڕیاری لەسەر دابوو. دەنا لەو بارودۆخە دژوار و نالەبارەی کە ئەوی لێ لەدایکبوو، تەنها بێ بوونی هیچ سۆزێکی خۆشەوستی و ویستێکی ژیان، توانای ئەو زریکەی هەبوو، دەنا ئەگەر ئەو چاوی لە خۆشەویستی و ژیان بووبایە، ئەوا، بێ گومان، لەو نەهامەتی و بەدبەختییە، رزگاری نەدەبوو. ئەو دوو ڕێگەی لەبەردەمدا بوو، زریکاندن، یان بێ دەنگبوون و هەڵبژاردنی رێگەی یەکسەری، لەدایکبوون– مردن، بێ ئەوەی بتوانێت لاڕێگەی پەڕینەوە بەسەر ژین هەڵببژێرێت، بەوەش دەیتوانی کۆمەڵێک سەختی و دژواری لەکۆڵ خۆی و دنیا بکاتەوە. بەڵام بۆ ئەوەی کەسێک ئاوا خاکیانە واز لە ژیان بهێنێت، پێویست بوو هەر بەزگماک خاوەنی کەمۆکەیەک هەستی چاکەو دۆستایەتیی بێت، بەڵام گرێنوی ئەو کەمۆکەشی نەبوو، هەر لە سەرەتاوە مۆن و رووگرژ بوو. هەر دەتگوت تەنها بە هۆی غەززین و لاملی، بۆ هێنانی دەرد و بەڵا بڕیاری ژیانی دابوو.

بێگومان ئەو وەک کەسێکی گەورە بڕیاری خۆی نەدا، وەک کەسێک کەم یان زۆر پێویستی بە ئەقل و ئەزموون هەبێت، بۆ ئەوەی لە نێوان کۆمەڵێک ڕێ، یەکێکیان هەڵببژێرێت. بەڵکو ئەو بڕیارەکەی خۆی بە شێوەیەکی ڕەمەکی و ڕووەکی دابوو، تەواو وەک بڕیاری دەنکە فاسۆڵیایێکی تووڕدراو، کە ئایا چەکەرە دەربکات و بڕوێت، یان باشترە هەروا لە خۆی بگەڕێت.

یاخود وەک گەنەکەی سەر درەختەکە، کە ژین هیچ دەرفەتێکی تری بۆ نەهێشتبۆوە، جگە لەوەی کە بۆ هەمیشە بچێتە سووڕی سڕبوون. ئەو گەنە ناشیرنە، کە جەستە ڕەنگ بۆرە قورقوشمییەکەی خۆی وەک گۆیێک گرمۆلە دەکات، تا کەمترین رووبەری جەستەی بکەوێتە دەرەوە، چەرمی خۆی لووس و گرژ دەکات، تا چ گەرداوێک کاری لێ نەکات، هیچی ناوەوەی خۆی پێشانی دەرەوە نادات. ئەو گەنەیە کە بە تایبەت خۆی وێک دێنێتەوەو خۆی بچووک دەکاتەوە، بۆ ئەوەیە نەبینرێت، بۆ ئەوەی کەس نەیبینێت و نەیپلیشێنێتەوە. ئەو گەنە تاک و تەنهایە، کە خۆی لە ناوەخۆ کۆکردۆتەوەو خۆی بە دارەکەوە قرمساندووە، کوێر و کەڕ و لار، بۆن دەکات، بۆن دەکات، چەند میل دوور، بۆنی خوێنی ئەو گیانەوەرانە دەکات، کە گوزەر دەکەن، بەڵام ئەو بە هێزی خۆی هەرگیز نایانگاتێ. ئەو گەنەیە دەتوانێت خۆی بەربداتەوە، خۆی بەربداتەوە سەر زەمینی دارستانەکەو بە شەش قاچە

وردەکەی چەند میللیمەترێک بۆ ئەم لاو ئەو لا بخزێت، پاشان لە ژێر چرووەکاندا گیان لەدەست بدات، ئەوە مەخابن نیە بۆ ئەو؟ خواش ئەوە نازانێ. بەڵام ئەو گەنە لامله کەلله ڕەق و قێزەونە، خۆ مات دەکات و دەمێنێتەوە، دەژی و چاوەڕوان دەکات. چاوەڕوان دەکات تا ئەو کاتەی، ئەو ڕێکەوتەی کە زۆر بە دەگمەن هەڵدەکەوێت، دێتە پێشەوەو، خوێنی جەستەی گیانەوەرێک راستەوخۆ دێتە ژێر درەختەکە، دێتە بەردەمی، ئەوجا خۆی بەردەداتەوەو بە چنگەکانی خۆی ئەو گۆشتە نامۆیە کون دەکات و گازی لێ گیردەکات...

گرێنویی منداڵ، گەنەیەکی ئاوا بوو. لەناوەخۆی بە قۆزاغەکراوی دەژیاو چاوەڕوانی کاتێکی باشتری دەکرد. جگە لە پاشەرۆکی خۆی، هیچی تری نەدەدا ئەو دنیایە. نە زەردەخەنەیەک، نە هاوارێک، نە تروسکەیەکی چاوەکانی، هیچی نەدەدا، تەنانەت بۆنی خودی خۆی نەدەدا بە دنیا. هەر ژنێکی تر بووایە، ئەو بەچکە دێوەی رانەدەگرت. بەڵام مادام گایارد وا نەبوو. بەڵێ ئەو بۆنی نەدەکرد، تا بزانێت ئەو منداڵە بۆنی نایەت، ئەو چاوەڕوانی هیچ شتێکی رۆحی لەم نەدەکرد، چونکە بۆ خۆشی رۆحی کلیل درابوو.

بەڵام منداڵەکانی تر یەکسەرە هەستیان بەمە کردبوو، کە گرێنوی چ بابەتێکە. هەر لە رۆژی یەکەمەوە، دەرکیان بەوە بردبوو کە ئەو منداڵە نوێیە، شتێکی سەیر و نائاساییە. ئەو سندوقەیان لە خۆ دوورکردەوە کە ئەوی تیا بوو، لە کاتی خەوتندا لەجاران پتر لەیەکتری نزیک دەکەوتنەوەو پشتیان بە یەکتری وەدەنا، وەک ئەوەی ژوورەکەیان ساردتر بووبێت. ساواکان هەندێ جار بە شەو دەیانزریکاند، وەک ئەوەی تەزووەباییێکی سارد بە ناو ژوورەکەدا هەڵبکات. هەندێکی تر خەونیان دەدیت، لە خەونەکانیان وایان دەزانی شتێک بەربینگی گرتوون و هەناسەگیریان دەکات. جارێک گەورەکانیان ویستیان پێکەوە بیخنکێنن. دۆشەک و لێفەو کایان خستە سەر دەموچاوی و خشت و بەردیان خستە سەر . .. کاتێک مادام گایارد بۆ سبەینێ لە ژێر ئەم شتانەی دەرهێنا، هەموو جەستەی گەچرا و پەسترا بوو، شین هەڵگەڕا بوو، بەڵام نەمردبوو. جارێکی تریش بێ ئەنجام هەوڵیان دا لە ناوی بەرن. بەڵام هەرگیز هەوڵیان نەداو نەوێران راستەوخۆ بیخنکێنن،

دەستی خۆیان بخەنە سەر ئەوک و دەم و لووتی و هەناسەبڕی بکەن، نەیاندەویست دەستیان بە پێستی بکەوێت. وەکو جالجالۆکەیەک بێزیان لێ دەبووەوەو نەیان دەویست بە دەستی خۆیان بیفلیقێننەوە.

که گرێنوی گەورەتر بوو، ئیتر ئەوان وازیان لە کوشتنی هێنا. دیارە ئەوانیش رەچاوی ئەوەیان کردبوو، کە ئەو کەسە هی لە ناوبردن نەبوو. لە جیاتی ئەوە خۆیان لێ دوور کردەوە، خۆیان تێ نەدەگەیاند، هەرچۆنی بوو، خۆیان لەوە دەپاراست کە جەستەیان بەر جەستەی ئەو بکەوێت.

ئەوان رقیان لە گرێنوی نەدەبووەوە. ئێرەییشیان پێ نەدەبرد، یان چاویان لە خۆراکی وی نەبوو. هیچ هۆییێک نەبوو، لە خانەکەی گایارد، ناچاری ئەو هەستانەیان بکات. تەنها بوونی وی لەوێ، جاڕسی دەکردن. ئەوان نەیاندەتوانی هیچ بۆنێکی ئەو بکەن، لێی دەترسان.

## ٥

لە راستیدا گرێنوی هیچ شتێکی وای نەبوو، جێگەی ترس بێت. کە تەمەنیشی بەرەو سەرەوە چوو، کەلەشێکی وا گەورەو بە هێزی نەبوو، راستە ناشیرن بوو، بەڵام ئەوەندەش ناشیرن نەبوو، پیاو زەندەقی لێ بچێت. کەسێکی چەتوون و دەستوەشێنیش نەبوو، سەرەڕۆ و ئاژاوەچیش نەبوو، پاشقوڵی لە کەسیش نەدەگرت، شەڕی بە کەس نەدەفرۆشت. خۆشی خۆی لاتەریک دەگرت. زیرەکاتیەکەشی وا نەبوو، جێگەی ترس بێت. کە تەمەنی بووە سێ ساڵ ئەوجا توانی لەسەر دوو قاچ بووەستێ، یەکەمین پەیڤی بە چوارساڵی لە زار هاتە دەرەوە، ئەو پەیڤەش "ماسی" بوو، ئەویش لە چرکەساتی هەڵچوونێکی لە ناکاو، ئەو وشەی لێ دەرچوو، وەک دەنگدانەوە، کاتێک ماسیفرۆشێکی سەر شەقامی شارۆن لە دوورەوە هاتبوو، گازی بۆ فرۆشتنی کەرەسەکانی خۆی دەکرد. پەیڤەکانی داهاتووی، کە دەربیڕین بریتی بوون لە "ئاخوڕی بزنان"، "کەڵەم"، "جاک لۆرەر" ئەوەی دواییان ناوی باخچەوانی کچەکەی لاکروا بوو، لە نزیکی ئەوان بوو، کە جار جار دەهاتە لای مادام گایارد، هەندێ کاری سەخت و دژواری بۆ جێبەجێ دەکرد، شانازیشی بەوە دەکرد، کە ئەو هەرگیز لە ژیانی دا، بۆ تاقە جارێکیش خۆی نەشۆردووە. گرێنوی زۆر کەم دەمەپەیڤ و ئاوەڵناو تەواوکەرەکانی دەردەبڕی. جگە لە "ئا" و "نا" پەیڤەکانی تری زۆر درەنگ بۆ یەکەمین جار لە ژیانیدا دەربڕین. ئەو تەنها پەیڤە سەرەکیەکان، بەڵێ تەنها ناوی تایبەتی شتەکانی، هی ڕووەکەکان، گیاندار و مرۆڤەکان و هی خۆی دەردەبڕی، ئەوەش ئەو کاتە کە ئەو شتانە، ڕووەک، گیاندار، یان مرۆڤ، بە بۆنی خۆیان، خۆیان بەسەردا زاڵ کردبا.

مانگی ئادار بوو، لەسەر کۆمەڵێک دار چناری کەڵەکەبوو روونیشتبوو، دارەکان لەبەر گەرما قرچەقرچیان بوو، ئەو کاتە بۆ یەکەم جار بوو، کە وشەی "دار"ی لەدەم دەرچوو. پێشتر سەدان جار داری دی بوو، سەدان جار پەیڤی داری بیستبوو. دەشیزانی دار چیە، خۆ لە زستاندا دەنێردرایە دەرەوە، بۆ ئەوەی دار بێنێت. بەڵام هێشتان دار لای ئەو نەببوو بەو شتە گرنگە، خۆی

پێوە ماندوو بکات، ناوی بهێنێت. کەچی ئەوە لەو ڕۆژەی مانگی ئادار ڕوویدا. دارە کەڵەکەبووەکان وەک تەختێک لە لای باشووری عەمبارەکەی مادام گایارد لەسەر یەک داندرابوون، لە بن ساپیتەیەک، لێژنە دارەکەی سەرەوە بۆنێکی برژێنەری شیرینی لێ دەهات، بۆنێکی قەوزەیی لە قووڵایی دارەکەڵەکەبووەکان دەهاتە دەرەوە، لە دیواری عەمبارەکەش، کە لە داری کاژ دروستکرابوو، بۆنێکی سووکی زەمەقی لێ دەهات.گرێنوی لەسەر دارەکان دانیشتبوو، قاچەکانی لەسەر دارەکان درێژکردبوو، پشتی خۆی بە دیواری عەمبارەکە وەنابوو، چاوی خۆی قوچاندبوو، ئارام، بێ جووڵە. هیچی نەدەدیت، چی نە دەبیست و هەستی بە هیچ نەدەکرد. تەنها بۆنی دارەکانی هەڵدەمژی، کە لە چوار دەوری وی بڵاو دەبوونەوەو لە بن گێسوانەکە پەنگیان دەخوارەدوە. ئەو بۆن و بەرامانەی نۆش دەکرد، لێی دەخواردنەوە، لە خۆی هەڵدەسوون، تا بنەوەی بنەوەی خانۆچکەکانی پێستی، خۆی ببوو بە دار، ببوو بە بووکۆکەیەکی دار، وەک "پینۆکیۆ"یەک کەوتبووە سەر لێژنە دارەکان، وەک مردووێک، تا پاش ماوەیەکی زۆر، نزیکە دوای نیو دەمژمێر، ئەوجا پەیڤی "دار"ی لە دەم دەرپەڕی. وەک ئەوەی پڕبووبێت لە دار، تا بنگوێکانی، وەک ئەوەی تا گەردەنی ئاخنرابێتە ناو دار ، وەک ئەوەی زگ و دەم و لووتی پڕبووبێت لە دار، ئاوا ڕشاوەو وشەی داری هێنایەوە. ئیتر ئەو وشە ئەوی واگا هێنایەوە، رزگاری کرد، لە کاتێکدا خەریک بوو بە بۆنی ئەو هەموو دارە، دەخنکا.

ڕاپەڕی و لەسەر دارە کەڵەکەبووەکان خزیە خوارەوەو بە دووڵاقە دارینەکەی لەوێ دوور کەوتەوە. چەند رۆژێک دواتریش هەر لەژێر کاریگەری بۆنی دارەکان رەفتاری دەکردو منگە منگی دەهات، کاتێک بیرەوەری ئەو بەسەرهاتە بە توندی لە مێشکی دەدا، ئەوا لەبەرخۆیەوە، وەک ئەوەی سوێند بخوات دەیگوت: "دار، دار".ئەو ئاوا فێری قسە بوو. بەو وشانەی کە هیچ شتێکی بۆنداریان وەسف نەدەکرد، واتە بە پەیڤە نابەرجەستەکان، ئەو گەورەترین گیروگرفتی هەبوو بەرامبەر زاراوە سروشتی و مۆڕالیەکان. ئەو نەیدەتوانی فێریان ببێت و لێێ تێکەڵ و پێکەڵ دەبوون، کە گەورەش ببوو، حەزی نەدەکرد بەکاریان بهێنێت، ئەگەریش بەکاری هێنابان، زۆربەی جاران بە هەڵە بە کاری دەهێنان: ماف، ویژدان، خودا، شادی، بەرپرسیارێتی، شەرمەزاری، سوپاسگوییی...هتد. ئەو شتانە چیان دەگەیاند، لای ئەو هەر ئاشکرا نەبوون و نەبوون، هەر لە ژێر پەردە مانەوە.لە لایەکی تر، هەر زوو پەیڤ و وشەدانی زمانی ئاسایی، بەشی ناولێنانی ئەو هەموو جۆرە بۆنانەیان نەدەکرد، کە ئەو وەکو بۆنەزاراوە یان وەک فاکتەرەبۆنییەکان لە ناو دەروونی خۆی کۆی کردبوونەوە. چونکە ئەوەندەی پێ نەچوو، کە ئەو هەر تەنها داری بۆن

نەدەکرد، بەڵکو بۆنەکانی داری دارمێشوولە ، دار هەرمێ، داری کۆن، داری نوێ، داری ناسک، داری ڕەق و داری قایمی لێکتر جیا دەکردەوە، تەنانەت بۆنی تاک تاکە چینەکانی داری دەناسی، هی تلیشەدار، هی داری چەماو، ئەوانەی وەکو شتی دیار بە بۆن لێکتر جیا دەکردەوە، بە جۆرێک کە خەڵکی تر نەیاندەتوانی، ئەمانە بە چاو لێکتر جیا بکەنەوە. بۆ شتەکانی تریش هەر ئاوا. ئەو شەربەتە سپییەی کە هەموو بەیانییێک مادام گایارد دەیدایە منداڵەکانی، پێیان دەگوت شیر، کەچی بە پێی هەستی بۆنی گرێنوی، هەر ڕۆژە تام و بۆنێکی هەبوو، بە پێی ئەوەی ئەو شلەیە چەند گەرم بوو، لە چ چێڵێک وەرگیرابوو، چێڵەکە چی خواردبوو، چەندیان کەرە لە شیرەکە هێشتبووە... دووکەڵ، ئەو دووکەڵە سپیە گەشەی، کە لە خولەکێک، بگرە لە چرکەیەکدا خۆی دەگۆڕێت و لە یەکەیەکی نوێی تێکەڵەبۆنێک وەک دوکەڵی ئاگر، دەردەکەوێت، ئێمە تەنها یەک ناومان بۆی هەیە "دووکەڵ"... هەرواش زەوی، دیمەن، هەوا، کە هەنگاو بە هەنگاو و لە هەناسەیەکەوە بۆ هەناسەیەکی تر، بە بۆن و بەرامەی تر پڕدەکرێن و بەوەش گیانی پێناسەیەکی تر دەگرنە خۆ، گوایە گەرەکە هەر بەو سێ وشە پێناسە بکرێن، ئەو هەموو بەدحاڵی بوونە بێ مانایە لە نێوانی هەژاری زمان و ئەو سامانە بێ ژمارەی کە لە مەملەکەتی بۆنەکان بە بۆن دەناسرانەوە، وایان لە گرێنویی لاو دەکرد، کە هەر بە ڕاستی گومان بخاتە سەر مانای زمان. بۆیەشە هەر ئەو کاتە زمانی بەکار دەهێنا، کە ناچاری هەڵسوکەت بووایە لەگەڵ مرۆڤەکانی تر.

لە تەمەنی شەش ساڵیدا هەموو شتەکانی دەوروبەری خۆی بە فاکتەرەبۆنییەکان لە زەینی خۆی تۆمار کربوو. هیچ شتێک لە ماڵەکەی مادام گایارد نەما بوو، هیچ شوێنێک لە ڕوێ دێ چارنۆی ژووروو نەما بوو، هیچ مرۆڤێک، بەردێک، درەختێک، پنچکێک، پەرژینێک، تەنانەت قانێکی بچووکیش نەمابوو، کە ئەو بە بۆن شارەزایان نەبووبێت و بە بۆنەکەیان نەیانناسێتەوەو هەر یەکەیان وەک بوونێکی تاک و تەنهاو بێ نموونە، لە مێشکی خۆیدا نەیپاراستبن. هەموو بۆنە تایبەتیەکانیانی کۆکردبووەوەو بۆ کاتی پێویست لە بیرەوەری خۆیدا هەڵی گرتبوون، ئەوەندە ڕۆشن، ئەوەندە ساف، ئەوەندە بێ پایان، کە نەک هەر تەنها ئەو کاتە بە بیری دەهاتنەوە، کە دووبارە بۆنی کردبان، بەڵکو بە ڕاستی بۆنەکانیانی بۆ دەهات، کە دووبارە بهاتبانایەوە خەیاڵی. بەڵێ، پتر لەمەش، تەنانەت تەنها بە ئەندێشە، تێکەڵی یەکتری دەکردن و بۆنی نوێی لێ ساز دەکردن، بەم جۆرە بۆنێ نوێی لە ناوەوەی خۆیدا دەئافراند، ئەو بۆنانەی کە هێشتان لە واقیعدا بوونیان نەبوو. وەک ئەوەی کە خاوەنی گەورەترین وشەدانی بۆنەکان بێت، ئەوەی کە خۆی پێیان ئاشنا ببوو، ئەوەش بەهرەی ئەوەی پێ بەخشی بوو، کە بتوانێت بە ئاسانی، بێ سنوور بڕێکی

زۆر پێکهاتەی نوێی بۆنەکان بئافرێنێت، ئەوەش لە تەمەنێک، کە هێشتان منداڵە هاوتەمەنەکانی تری وەک خۆی، بەو پەیڤانەی کە زۆر بە دژواری، بۆ وەسفکردنی جیهان، فێری ببوون، ئەو پەڕەکەی دەیانتوانی بە لاروپتی رستەیەکی ئاسایی کەمێک درێژ، دەرببڕن. شیاوترین نموونەی بەراوردکردن بۆ بەهرەکەی گرێنوی، لەوانەیە ئەو منداڵە پەرجووە مۆسیقاڕە بێت، کە تەنها بە گوێ گرتن، هەموو ئاواز و هارمۆنی و ئەلف و بێی یەکە یەکەی تۆنەکان فێرببوو، دواتر دەیتوانی خۆی ئاواز و هارمۆنی نوێ دابنێت، بە جیاوازی ئەوەی کە ئەلف و بێی بۆنەکان بە ژمارە زۆر زۆرتر و لەیەکتر جیاوازتر بوون لە تۆنەکانی مۆسیقا، دواتر بە جیاوازی ئەوەی کە بەهرەی ئافراندن لای ئەو منداڵە عاجباتیە، گرێنوی، تەنها لە ناو خودی خۆی پیادەدەکراو جگە لە خۆی، کەسی تر نەیدەتوانی سەرنج بداتە کارەکەی. گرێنوی رۆژ دوای رۆژ پتر بەرامبەر دەرەوەی خۆی دادەخرا. پتر لە هەموو شتێک حەزی لەوە بوو کە لە ناو بورگ سانت ئەنتۆین بۆخۆی بە تەنها هاتوچۆ بکات، بەناو باخەکانی سەوزەوات، بەناو بێستانەکان، بەناو ڕەزەکان، بەسەر چیمەنەکان. هەندێ جار شەوان نەدەگەڕایەوە ماڵەوە، بە درێژایی  هەموو رۆژەکە سەرنگوم دەبوو.  بەرگەی ئەو سزایە دارکاریەشی دەگرت، کە لەسەر ئەمە تووشی دەبوو، بێ ئەوەی ئێش و ژانی ئەو دارکاریەش پێشان بدات. بەندکردنی لە ماڵەوە، کەمکردنەوەی خواردن لێی، سزای کاری بێگاری، نەیاندەتوانی ئاکاری بگۆڕن. بۆ ماوەی ساڵ و نیوێک ناوبەناو سەردانی خوێندنگەی بۆنسێکۆی دەکرد، ئەوەی قەشەکانی کڵێسای نۆتردام، بێ ئەوەی هیچ کاریگەرێیکی لێدەربکەوێت.  کەمێک فیرِی خوێندنەوەی حونجەیی ببوو، فێریش ببوو ناوی خۆی بنووسێت، دەنا چی تر فێر نەببوو. مامۆستاکەی بە کەم ئەقلی لە قەڵەم دابوو. بەڵام بە پێچەوانە، مادام گایارد، سەرنجی بۆ ئەوە چوو بوو، کە ئەو کوڕە هەندێ بەهرەی دیاری کراو و تایبەتمەندێتی خۆی هەیە، کە زۆر نائاسایین، ئەگەر نەڵێین کە لەسەرەوەی سروشتیی ئاسایی بوون: بۆ نموونە ئەو ترسەی کە منداڵان لە تاریکی و شەو هەیتیان لای ئەو نەبوو، هەمیشە دەتوانرا بۆ هەر کارێک لە هەر کاتێک رەوانەی سەرداب بکرابایە، لە کاتێکدا منداڵەکانی تر بە هەڵگرتنی فانۆسیش، بە دژواری دەوێران بچن، یان بۆ دەرەوە، بۆ عەمبار، بو هێنانی دار، لە تاریکیی شەوی ئەنگوستەچاو. ئەو قەت چرای لەگەڵ خۆیدا نەدەبرد، ئەو شتەی بۆی چوو بوو، بێ گرفت دەیدۆزیەوە دەیهێنا، بێ ئەوەی دەستی خۆی بە هەڵە بۆ شتێکی تر ببات، بێ ئەوەی ساتمەیەک بکات، یان خۆی بە شتێک دابدات. لەوەش عەنتیکەتر، کە بە تەوای بۆ مادام گایارد دەرکەوتبوو و بە تەواوی باوەڕی پێ هێنابوو، ئەوە بوو، کە ئەو کوڕە توانای ئەوەی هەبوو، کە لە پشتی کاغەزان، لە پشتی قوماشان، بەڵێ تەنانەت لە پشتی دیواری ئەستوور و دەرگای

قفڵدراو، شتان ببینێت. ئەو دەیزانی چەند منداڵ لە ژووری خەو دان، بێ ئەوەی چووبێتە ژوورەوە. ئەو دەیزانی کرمێک خۆی لە ناو قەڕنابیتێک حەشارداوە، پێش ئەوەی قەڕنابیتەکە پارچە پارچە بکرێت. جارێکیشیان، کە مادام گایارد پارەکانی خۆی وا باش شاردبووەوە، کە ئیتر خۆشی نەیدەتوانی بیاندۆزێتەوە، شوێنی شاردنەوەکەی گۆڕی بوو، گرێنوی، بێ ئەوەی بۆ چرکەیەکیش بیر بکاتەوە، ئاماژەی بۆ شوێنێک کرد، لە پشت کاریتەی دووکەڵکێشەکە، گایارد تەماشای کرد، پارەکە لەوێ بوو! تەنانەت توانای پێشبینی هەبوو. جارێکییان زۆر پێش هاتنی میوانێک، گوتی وا میوانێک دێت، یان دەیگوت، وا رەهێڵەو بارانێک بەڕێوەیە، بێ ئەوەی بچووکترین پەڵەی هەور بە بەری ئاسمانەوە ببینرێت، ئەوەندەی نەدەبرد هەور پەیدا دەبوون و گەواڵە دەیگرماند و رەهێڵە دەستی پێ دەکرد. دیار بوو، کە ئەو، ئەو شتانەی هیچی بە چاو نەدەدیت، بەڵکو بە وردبۆنکردنی لووتی، پەردەی لەسەر ئەو شتانە ڕادەماڵی: کرمی دەروونی قەڕنابیتەکە، پارەی پشت کاریتەکە، مرۆڤی پشتی دیوارەکان، کە بە درێژایی چەندین رێگە دوور بوون، مادام گایارد ئەو شتانەی لە خەونیشدا نەدەدیت، ئەگەریش لێدانی ماشەکەش هیچ زیانێکی پێ نەگەیاندبایە. ئەو لەوە دڵنیا بوو، کە ئەو منداڵە زیرەک بێت، یان نازیرەک، خاوەنی ڕوویەکی تریشە. بەڵام چونکە دەیزانی دووڕووەکان بەڵاو مەرگیان بە دوواوەیە، ببوو بە نیگەرانییەک بۆ ئەو، لەوەش نیگەرانکەر تر، کە مادام گایارد نەیدەتوانی بەرگەی بگرێت، ئەوە بوو، کە ئەو دەیزانی لەگەڵ کەسێک لە ماڵێکدا دەژیت، کە ئەو کەسە بەهرەی ئەوەی هەیە، کە پارە شاردراوەکانی لە میانی دیوار و کاریتەکان، بە ئاسانی ببینیت، هەر لەو کاتەوە، کە دەرکی بەو بەهرە مەترسیدارەی ئەو کوڕە برد، ئیتر دەیویست خۆی لێ رزگار بکات، ئەوەش زۆر باش ڕێکەوت، نزیکە هەر لەو کاتەدا بوو، کە تەمەنی گرێنوی ببوو بە هەشت ساڵ، دێری سانت مێری، بێ ئاشکراکردنی هۆیەکەی، کرێی ساڵانەی بەخێوکردنەکەی وەستاند. مادام بێ ئەوەی دێرەکە ئاگادار بکاتەوە، لە نیوە چاکەی خۆی هەفتەیەکیش پتر چاوەڕوانی کرد، ئەوجا کە کرێی بەخێوکردنەکەی هەر بۆ نەهات، دەستی کوڕیژگەی گرت و لەگەڵ خۆی بردی بۆ شار.

لە شەقامی مۆرتێلۆری، نزیک رووبارەکە، کابراییەکی دەباغچی دەناسی، ناوی گریمال بوو، هەمیشە پێویستی بە هێزی کاری لاوان هەبوو، نەک بۆ کاری ئاسایی شاگردیی، بەڵکو بۆ کاری کەم و پیس، وەک کاری داڕنینی گۆشت لە پیستەی بۆگەن، تێکەڵکردنی ئاوەرۆکی ژەهراوی ماددەکانی دەباغیی و ڕەنگەکان، هەڵگرتنی ماددە سووتێنەرەکان، کە زۆر مەترسیدار بوون و خەتەری مەرگییان پێوە بوو، وەستایێک، کە هەستی بە بەرپرسیارێتی کردبایە، نەیدەویست شاگردە هینبووەکانی بەم کارانە خەسار بکات، بەڵکو هەرچی و پەرچی، بێکار و رووت و هەمووشت لەدەستچووەکان، خۆڕی و

بەرەڵلا، منداڵی بێ خاوەن، ئەوانە ئەگەر شتێکیشیان بەسەر بهاتبایە، کەس نەبوو لێینان بپرسێتەوە. بێگومان مادام گایارد چاکی دەزانی، کە گرێنوی لە کارگە دەباغییەکەی گریمال، وەک هەر مرۆڤێکی تر، شانسی ئەوەی نەبوو، بە زیندوویی دەرباز ببێت. بەڵام ئەو، ئەو ژنە نەبوو، کە خەم لەمە بخوات. ئەو ئەرکی خۆی جێبەجێکردبوو. کاری بەخێوکردنی وی کۆتایی هاتبوو. ئیتر پاشتر چی بەسەر ئەو منداڵە دادەهات، پەیوەندی بەم نەبوو. خۆ ئەگەر دەرچوو، ئەوە باشە، ئەگەر مرد، ئەویش هەر باشە. گرنگ ئەوەیە، کە هەموو شت بە پێی یاسا بڕوات بەڕێوە. بەو جۆرە بە نووسینی ئیمزاکراو، کوڕیژگە درایە دەست جەنابی گریمال. لە بەرامبەریشی گایارد پازدە فرانکی سەرقفڵانە بۆخۆی وەرگرت و بەرەو ماڵەوە بۆ ڕوێ دێ چارنۆ گەڕایەوە. کەمترین ئازاری ویژدان چیە، هەستی پێ نەدەکرد. بە پێچەوانە، نەک هەر هەستی بە ڕاستی کارەکەی دەکرد، بەڵکو وای دەزانی کارێکی زۆر ڕەواو دادپەروەرانەی کردووە، چونکە مانەوەی منداڵێک، کە هیچ کەس کرێی بەخێوکردنەکەی نەگرێتەخۆی، ئەوا بۆخۆی دەبێتە بار لەسەر منداڵەکانی تر، تەنانەت دەبووە بار لەسەر خودی خۆی، کە ئەوەش مەترسی بۆ دوارۆژی منداڵەکانی تر دەبوو، تەنانەت مەترسی بۆ پاشەڕۆژی خۆشی دەبوو، واتە مەرگی تایبەتی خۆی، بە تەنها لە خانەی خۆی، کە تاکە ئارەزووی ژیانی بوو، دەکەوتە بەر مەترسی. چونکە ئێمە لێرە لەو بەشە، مادام گایارد بەجێدەهێلین و جارێکی تر نایبینینەوە، دەمانەوێت بە چەند ڕستەیەک دوارۆژەکانی ژیانی بخەینە بەرچاو. هەرچەندە مادام لە منداڵییەوە لە دەروونی خۆیدا مردبوو، بەڵام لە بەدبەختی خۆی زیندوو مایەوە تا زۆر زۆر پیر بوو، لە ساڵی ١٧٨٢، نزیکەی لە تەمەنی حەفتا ساڵیدا، وازی لە کارەکەی خۆی هێنا، وەک پێشتر نەخشەی بۆ کێشابوو، خانەنشینییێکی بۆ خۆی کڕی، لە ماڵۆکەکەی خۆی دانیشت و چاوەڕوانی مەرگی کرد. بەڵام مەرگ هەر نەهات و هەر نەهات. لە جیاتی مەرگ شتێکی تر هات، کە هیچ کەس لەسەر ئەو زەمینە، نەیدەتوانی حسێبی بۆ بکردبایە، ئەویش شۆڕش بوو، واتە گۆڕانی کوتوپڕ و خێرای هەموو بارە کۆمەڵایەتی و ئەخلاقیەکان. لە سەرەتا ئەو شۆڕشە هیچ کاریگەرییێکی لەسەر ژیان و چارەنووسی تایبەتی مادام گایارد نەبوو. بەڵام ئێستا کە تەمەنی نزیکەی دەبوو بە هەشتا شاڵ، لەهیکرا بەرپرسی موچەی خانەنشینەکەی، ناچارکرا ڕا بکات و کۆچ بکات بۆ هەندەران، ماڵ و سامانەکەی دەستی بەسەرداگیراو بۆ کارگەیەکی شەرواڵدروویی، هەمووی هەڕاج کرا. ماوەیەکی کەم ئاوا مایەوە، وەک ئەوەی کە ئەو گۆڕانە، ساکارترین کاریگەری لەسەر ژیانی مادام گایارد نەبووبێت، وا بوو، چونکە لەوکاتەوە کارگەی شەرواڵدرووەکە موچەکەی لە

کاتی خۆیدا بۆ دەنارد. بەڵام ئەو ڕۆژە هاتە پێشەوە، کە ئیتر موچەکەی بە پارەی ڕەقی سکە بۆ نەدەهات، بەڵکو بە کاغەزی بچووکی چاپکراو، ئیتر ئەوە کۆتایی ماددی ژیانی مادام بوو.دوو ساڵ دواتر موچەی خانەنشینیەکەی بەشی ئەوەی نەدەکرد، کە داری سووتانیشی، پێ بکڕێت. بۆیە ناچار بوو خانووەکەی بفرۆشێت، خانووەکەی بە نرخێکی زۆر کەم فرۆشت، چونکە لە ناکاو جگە لەو، هەزاران کەسی تر هەبوون، کە ناچاری فرۆشتنی خانووەکانیان بوون، دیسان پارەی خانووەکەی بەو کاغەزۆکە هیچانەی سەردەم وەرگرت، دوای دوو ساڵی تر، ئەو پارەیەش نرخی وا دابەزی، وەک ئەوەی چ بەهاییێکی نەبێت، لە ساڵی ١٧٩٧ تەمەنی بەرەو نۆهەت ساڵان دەچوو، ئیتر تەواوی ئەو سامانەی کە بە زەحمەت و بە ڕەنجی خۆی، کۆی کردبووەوە، هەمووی لەدەست چوو، لە ژوورێکی چکۆلەی مۆبیلکراو دەژیا، لە روێ دێس کۆکوێل. ئەوسا تازە بە تازە، دە تا بیست ساڵ درەنگتر، مەرگ لێ نزیک کەوتەوە، ئەویش لە شێوەی کوڵکێکی درێژدادڕ، کە لە گەرووی مادام هاتبوو، لەسەرەتادا چەشەی خواردنی نەهێشت، پاشان دەنگیشی بڕی، ئاوا توانای دەربڕینی یەک پەیڤیشی نەما، کاتێک گواستیانەوە بۆ هۆتێل دیۆ. لەوێ بردیانە هەمان ئەو هۆڵەی، کە بەسەدان نەخۆشی تری لێ بوو، هەمووی وەک خۆی لەسەرەمەرگدا بوون. هەمان ئەو هۆڵەی کە مێردەکەشی تێیدا مردبوو، لەسەر تەختێکی هاوبەش ڕاکشا، کە پێنج مێیینەی تری پیری زۆر نامۆی لەسەر ڕاکشابوو، بە قەڕەپەستانێ خرابوونە پاڵ یەکتری و جەستەیان پێکتر دەکەوت، ئینجا مەرگ لێی گەڕا سێ هەفتە، بە بەرچاوی خەڵک و بە ئاشکرا، گیان بدات. پاشان خرایە ناو تابووتێک و بزماررێژکرا، دەمژمێر چواری بەیانی، لەگەڵ پەنجا لاشەی تر فڕێ درایە سەر عارەبانەیەک و لەگەڵ زرنگە زرنگێکی ناخۆشی زەنگوڵەیەک بردیانە گۆڕستانی نوێی کلامارت، میلێک دوور لە دەروازەی شارەکە، لەوێ لە گۆڕێکی بە کۆمەڵ، بۆ هەمیشە بە ئارامی ڕاکشا، لە ژێر چینێکی ئەستوور، لە گلەگەچی خاو.

ئەوە لە ساڵی ١٧٩٩ بوو. سوپاس بۆ یەزدان کە مادام هیچی لە بارەی ئەو چارەنووسەی خۆی نەدەزانی، کاتێک کە لە ساڵی ١٧٤٧ بەرەو ماڵەوە دەچوو، گرێنوی و چیرۆکەکەی ئێمەی بەجێدەهێشت، دەنا لەوانەبوو هیچ باوەڕی بە ڕەوایی و دادپەروەری نەمابایە، ئەو شتەی لای ئەو تاکە مانای ژیان بوو.

# ٦

لە یەکەمین تەماشای خۆی بۆ مۆنزیور گریمال، نەخێر لەگەڵ یەکەمین هەناسەیدا، کە لەگەڵ بۆنی جەستەی بۆنی گریمال هەڵیکێشا، گرێنوی تێگەیشت، کە ئەو پیاوە لە دەستی دێت، لەسەر تاکە سەرپێچییەک لە ژێر لێداندا بیکوژێت. ژیانی هەر بە قەد ئەو کارانە نرخی هەیە، کە دەتوانێت بۆی راپەڕێنێت، ئیتر بوونی ئەو تەنها لەو سوودانە پێکهاتووە، کە گریمال ئەوی پێدەپێوێت. بۆیە گرێنوی خۆی دایەدەست و ملی خۆی کەچ کرد، بێ ئەوەی بۆ تاکە جارێکیش هەوڵ بدات ناڕەزایی دەرببڕێت. رۆژ دوای رۆژ، دیسان، هەموو وزەی تۆران و لاملی خۆی بردەوە ناو قۆزاخەکەی خۆی، تەنها بۆ ئەوەی بەکاردەهێنا، بتوانێت وەکو گەنەیەک، مات ببێت و ئەو قۆناغی بەستەڵەکە ببڕێت، بە چیڕی، نەداری و نەدیاری، بە نەمری و نەژی چاوەڕوانی کەمترینترووسکەی هیوای ژیان بکات، بەڵام نەهێڵێت ئەو چرا کزەی ژیانی، بۆ هەمیشە بکوژێتەوە. لەو کاتەدا گرێنوی ببوو بە نموونەیەک بۆ ملکەچی و گوێڕایەڵی، هیچی داوا نەدەکرد، گوێڕایەڵی هەموو فەرمانێک بوو، هەموو خواردنێکی بە خۆشییەوە دەخوارد. وەک منداڵێکی ژیر، لێ دەگەڕا ئێواران لە عەمبارێک بەندی بکەن، ئەو عەمبارە کەوتبووە لاییەکی کارگەکە، ئامراز و کەلوپەلی لێ هەڵدەگیراو خاوەپێستەی خوێکراوی تێدا هەڵدەخسترا. لێرە لەسەر عەردی رەق و تەق دەنووست، بە رۆژ تا رۆناکایی مابایە کاری دەکرد، زستانان هەشت سەعات و هاوینان چواردە، پازدە، شازدە سەعات کاری دەکرد: گۆشتی لە پێستە دادڕنی، ئەو پێستانەی بۆگەنێکی کوشندەیان لێ دەهات، ئاونمی دەکردن، مووی لێ دەڕنین، کالکی دەکردن، پاکی دەکردنەوە، رایدەخستن، دەرمانی خۆشکردنی تێ هەڵدەسوون، داری دەشکاند، داری سەروو و تیرووی لە تەلاش پاک دەکردەوە، دەچووە ناو چاڵە پڕ جەفتاوەکان، کە پڕ بوون لە هالاوی زوورێنەوەر، چۆن سەرکارەکانی فەرمانیان پێ دەدا، ئاوا پێست و تەلاشەکانی دەخستە سەریەکتری و مازووی فلیقاوی بەسەرەوەدەکردن، ئەو پێستە لەسەریەک کەڵەکەبووانەی، کە دیمەنێکی سامناکیان هەبوو، بە خۆڵ و گەڵاو چڵی داری سەروو دادەپۆشی، چەند ساڵێ دواتر، هەڵی دەکۆڵینەوەو، چەرمە مۆمیابووەکانی بۆ خۆشکردن لە چاڵەکان دەهێنایەوە دەر.

خۆ ئەگەر خەریکی شاردنەوەو هەڵکۆڵین و دەرهێنانی پێستەکان نەبووایە، ئەوا خەریکی ئاوکێشان دەبوو. بە درێژایی چەندین مانگ، بە دوو سەتڵ، ئاوی لە رووبارەکە دەکێشایە سەرەوە، رۆژێ سەدان سەتل، چونکە ئەو کارگەیە بێ سنوور پێویستی بە ئاو هەبوو بۆ شووشتن، بۆ خووساندن، بۆ کوڵاندن، بۆ ڕەنگکردن. بە هۆی ئاوکێشان، بە درێژایی چەندین مانگ جلی وشکی بەبەر خۆیەوە نەدەبینی، پێستی ساردو سڕ هەڵدەگەڕاو وەک کلینکس ناسک دەبوو. ساڵێک دوای ئەو کارە، کە پتر لە کاری ئاژەڵ دەچوو، وەک لە هی مرۆڤ، تووشی نەخۆشی سپڵ بوو، ئەو نەخۆشیە سامناکەی دەباغەکان، بە گشتی کەس لەو نەخۆشییە بە زیندوویی رزگاری نەدەبوو. ئیتر گریمال دەستی لێ شووشت و بە دوای جێگرێک دەگەڕا، کە لە جێێ ئەو کار بکات، واش نەبوو، بەمە گریمال تووشی پەرۆشی نەبووبێت، چونکە ئەو هەرگیز کرێکارێکی لە گرێنوی کاراتر و بێ خەمتری نەدی بوو. بەڵام بە پێچەوانەی هەموو چاوەڕوانیەکان گرێنوی لەم نەخۆشییە رزگاری بوو نەمرد. تەنها، لە پشتی گوێکانی، لەسەر گەردەنی، لەسەر لاروومەتەکانی، چەند جێبرینێکی گەورەی کوڵک و دوومەڵی رەش مانەوە، پێشتر بۆخۆی چەند ناشیرن بوو، ئەو جێبرینە رەشە گەورانە، ئەوەندەی تر ناشیرنیان کرد. بەڵام بەم نەخۆشییە قازانجێکی بە نرخی دەستکەوت، ئەویش پەیداکردنی بەرگرییبوو لە لەشی، دژی نەخۆشی سپل، ئیتر لەو کاتەوە بە دەستی ڕووتی شەقاربردوو و خوێناوی خۆی گۆشتی لە بۆگەنترین و پیسترین پێست دادەڕنی، بێ ئەوەی جارێکی تر تووشی مەترسی ئەوە ببێت، ئەو نەخۆشییە بگرێتەوە. بەمەش ئیتر ئەو نەک هەر جیاوازی لەگەڵ شاگرد و سەرکارەکانی تر هەبوو، بەڵکو لەگەڵ هەموو ئەوانەش کە رۆژێ لە رۆژان جێگەی ئەویان دەگرتەوە. ئیتر لەبەر ئەوەش، کە چیتر نەدەتوانرا بە ئاسانی جێگەی ئەو پڕبکرێتەوە، وەک دەمەکانی پێشتر، نرخی کارەکانی پتر بوون و بەمەش نرخی ژیانیشی زیادی کرد. لەنکاوڕا چیتر ناچاری ئەوە نەبوو، لەسەر عاردی ڕەق و تەق بنوێت، بەڵکو رێگەی درا تەختێکی دار لە ژووری عەمبارەکە بۆخۆی دابمەزرێنێت، پووشیان دایێ تا لەسەری رووبکات، پۆشاکێک بۆ خۆداپۆشین. چیتریش لە کاتی خەودا دەرگایان لەسەر کلیل نەدەدا. خواردنیشیان پتر دەدایە. چیتر گریمال وەک گیانەوەرێکی بێ کەڵک تەمەشای نەدەکرد، بەڵکو وەک ئاژەلێکی سوودبەخشی ناوماڵ. کە تەمەنی بوو بە دوازدە ساڵ، گریمال رێگەی دا کە نیوەی رۆژی یەکشەمموان کار نەکات و پشوو بدات، کە بوو بە سێزدە ساڵ بۆی هەبوو رۆژانی هەفتە، ئێوارە دوای کار سەعاتێک بۆخۆی بڕواتە دەرەوەو چی دەکات بیکات. ئەو سەرکەوت، چونکە ئەو دەژیا، هەندێک ئازادی هەبوو، ئەوەندەی بەس بوو، تا پتر بژیت. چاخی سڕبوونی کۆتایی هات. گرێنوی گەنە دووبارە چالاک بووەوە. شنەی بەیانیەکی تازەی هەڵمژت. زەوقی ڕاو دایگرت. ئیتر گەورەترین مەیدانی بۆن و بەرامەکانی بۆ کرایەوە: شاری پاریس.

## ٧

وەک ئەوە وابوو کە لە بەهەشتدا بێت.  هەر بە تەنها گەڕەکە نزیکەکانی سانت جاک دولا بوشوری و سانت ئوستاژ بەهەشتێک بوون بۆ ئەو. لە شەقامە لاچەپەکانی سانت دونی و سانت مارتا خەڵک وا بە چڕی لە پاڵیەکتریدا دەژیان، خانووەکان ئەوەندە بە تەنگی چنرابوونە پاڵ یەکتری، پێنج، شەش نهۆم بەرز، مرۆڤ ئاسمانی نەدەدیت، هەوا لە ژێرەوە، وەک هەوای زێرابە شێدارەکانی، پەنگاوی دەخواردەوەو لە بۆندا دەمەیی. بۆنی مرۆڤ و گیاندارەکان تێکەڵی یەکتری دەبوون،  هی هالآوی خۆراک و نەخۆشییەکان، هی ئاو و بەرد، هی مشکی و پێستە، هی سابوون و نانی تازە برژاو، هی هێلکە، کە لە سرکەدا دەیان کولآند، هی هەڕشتەو سفری ساف و سپی کراوە، هی کرێم و بیرەو رۆنەماسی، هی چەوری و کای تەڕ و وشک. هەزاران و سەدان هەزار بۆن و بەرامە، شۆربایێکی نەدیاریان پێکهێنابوو، کە هەموو گۆشەو کونتۆچکەیەکی کووچەکانی پڕ کردبوو، کەمێک بەسەر سەربانەکاندا بڵاودەبووەوە، بەڵام هەرگیز لەسەر زەوی نەدەجوولا. ئەو خەڵکەی کە لەوێ دەژیان، جگە لە بۆنی ئەو شۆربا نادیارە، هەستێکی وایان بە هیچ بۆنێکی تر نەدەکرد، ئەو شۆربابۆنە لەوانەوە سەری هەڵدابوو، هەمیشە لێیان دەخواردەوەو دەخواردەوە، ئەوە ئەو هەوایە بوو، کە ئەوان هەڵیان دەمژی و پێی دەژیان، بۆ ئەوان وەک جلێکی گەرم بوو، کە دەمێک بوو پۆشیبوویان، ئیتر لێی راهاتبوون و پێستیان هەستی بەو بەرگە نەدەکرد، هەستیان بە بۆنەکەی نەدەکرد. بەڵام بۆ گرێنوی وەک ئەوە وا بوو، کە یەکەمین جاری بێت بۆنیان بکات. ئەو نەک هەر تێکڕای بۆن و بەرامەکانی یەکپارچە بە تێکەڵی هەست پێ دەکرد، بەڵکو بە شێوەیەکی شێکراوە، بەش و بەشۆکە دوور دوورەکانیشی تاکە تاکە هەست پێ دەکرد. لووتە هەستیارەکەی ئەو گلۆرە هالآو و بۆگەنەی وەردەگرت و دەزوولە دەزوولەی بۆنە بنچینەکانی شێ دەکردنەوە، تا ئەو ڕادەیەی کە چیتر  شێ نەدەکرانەوە، پاشان سەرلەنوێ ئەو دەزوولە بۆنانەی تێکەڵ بە یەکتری دەکردن و دووبارە  دەیڕستن و دەیچنینەوە.

خۆشییەکی بێ ڕادەی وای لەمە وەردەگرت، کە ناتوانرێت بە زمان باسی بکرێت. زۆرجاران وەک ئەوەی گۆد بووبێت، بەرامبەر دیواری ماڵێک دەوەستا، یان خۆی دەپەستایە گۆشەیەکی تاریک، بە چاوی قوچاو، زاری نیوەکراوە، لووتی هەڵمساو، ئارام وەک ماسییێک کاتێ کە لە ئاوێکی گەورەی تاریکی ئارام، ڕاودەکات. ئیتر کە سەری دەزوولەیەکی ناسکی هالآوەبۆنێکی بەر دەکەوت، توند دەیگرت و بەری نەدەدا، جگە لەو دەزووله بۆنەش، هیچ بۆنێکی تری هەڵنەدەمژی، دەیگرت و رایدەکێشایە ناوەوەی خۆی و، بۆ هەمیشە لە ناوەوەی خۆیدا دەیهێشتەوە. جا با ئەگەریش کۆنەبۆنێکی لای ئەو ناسراو، یان هاوچەشن بووایە، بەڵام لەوانەش بوو، بۆنێکی تەواو نوێی ئەوتۆ بووایە، کە بە ئاستەم، یان بەهیچ جۆرێک لەوانەی تر نەچووبایە، کە پێشتر بۆنی کردبوون، وە یاخود چاوی پێ کەوتبوون: وەک بۆنی ئاوریشمـێکی ئوتوکراو، بەرامەی چای جاترە، بۆنی پەشمە ئاوریشمێکی بە زیوچن، بۆنی تەپەدۆری شووشەیەک، کە کەمێک شەرابی تێدا بووبێت، بۆنی شانەیەک، بە ئارامی ئەو بۆنانەی بە قوڵابی ئەشق و ئارەزوو، ڕاودەکردو لە ناوخۆیدا پاشەکەوتی دەکردنەوە. کە لە هەڵمژینی بۆنی چڕەشۆربای بۆنی کوچەکان پڕ و تێر دەبوو، ئیتر دەچووە قەراغە بادارەکان، ئەو شوێنانەی هەوایان لێ دەجووڵاو بۆنەکانیان سووکتر بوون، بۆنەکان تێکەڵی با دەبوون و بڵاودەبوونەوە، نزیکەی وەک عەترێک: لە مەیدانی هالن، لەو شوێنەی کە هێشتان رۆژ لە ناو بۆنەکانی ئێوارانیدا بەردەوام دەمایەوە، بە چاو نەدەدیترا، بەڵام زۆر بە رۆشنی، وەک ئەوەی، کە هێشتان بازرگان و فرۆشیارەکان لە بەزم و هەرای خۆیاندا بن، وەک ئەوەی هێشتان سەبەتەی پڕ لە سەوزەو قەرتارەی پڕ لە مێوەو سندووقی پڕ لە هێلکە لە مەیدانەکە داندرابن، گۆزەی پڕ لە شەراب و سرکە، تووڕەگەی پڕ لە بەهارات و گونیەی پڕ لە پەتاتەو ئارد، سندووقی بزمارڕێژکراو، بە پێچ و بورغی قایمکراو، مێزی گۆشت، سەرمێزی پڕ لە قوماش و قاپ و قاچاغ و سۆڵ و پێڵاو و سەدان شتی تر، کە بە رۆژ لە مەیدانەکەدا دەفرۆشران... تەواوی ئەو ماجەرایە، تا وردترین و بچووکترین شت، کە لە دوای خۆیان، بۆنی خۆیان لە ناو هەوادا بەجێدەهێشت، گرێنوی هەموو بازاڕەکەی وەک خۆی بە بۆنکردن دەبینی، ئەگەر بتوانین وا بڵێین. زۆر بە وردی بۆنی دەکردن، وەک ئەوەی تەمەشایان بکات، ئیتر وردە وردە ئەو بازاڕەکەی وەک راستیەک و بە شێوازێکی بەرزتر دەهاتە بەرچاو: وەک رۆح و بیری بوونەوەرێک، کە بارودۆخی ئەو دەمە کاری لێ نەدەکردن، هەراو هۆریا، رۆناکی، جەنجاڵی مرۆڤەکان وەک ئەوەی هەر بەڕاستی لەوێ بن وابوو.

یان دەچوو بۆ ئەوێ، بۆ ئەو شوێنەی کە سەری دایکییان لێ پەڕاند، بۆ مەیدانی گریڤێ، کە وەک زمانێکی گەورە شۆڕبببووەوە ناو رووبارەکە، لێرە لە کەناری ئاوەکە، کەشتییەکان وەستابوون، یاخود بە ستوونەکانەوە، لەنگەرکرابوون، بۆنی خەڵووز و دانەوێڵەو کاو شێ دەهات.

لە رۆژئاواوەش بەو دەروازەیە کە رووبارەکەی پێدا دەهات و شاری شەق دەکرد، باییَکی سارد دەهاتە ناو شارو لە دەشتەکانەوە بۆنی گیاو چیمەنەکانی نۆیلی لەگەڵ خۆی دەهێنا، بۆنی دارستانەکانی نێوان سانت گێرمیان و ڤێرسیلای و شارە دوورەکانی رۆئون و سێئان، تەنانەت هەندێ جار هی دەریاکانی لەگەڵ خۆیدا دەهێنایە ناو شار. دەریا بۆنی کەشتییێکی چارۆگەداری لێ دەهات، کە ئاو و خوێ و خۆرێکی سارد خۆیان پێیەوە هەڵواسیبێت. ئەو بە ساکاری بۆنی دەریای دەکرد، لە هەمانکاتدا بۆنێکی گەورەو بەرفراوانی بێ نموونە، بە شێوەیەک گرێنوی چاوی لەوە دەپۆشی، ئەو بۆنە تایبەتە دەزوولە دەزوولە شێ بکاتەوە، بۆن ماسیی، بۆنی خوێ، بۆنی ئاو، بۆنی قەوزە، بۆنی تازە، تا دوایی، ئەو حەزی دەکرد بۆنەکانی دەریا وەک خۆی پێکەوە هەڵبمژێت، هەمووی پێکەوە لە ئەندێشەی خۆی دەپاراست، بە دابەشنەکراوی چەشەی لێ وەردەگرتن. ئەو بۆنی دەریای ئەوەندە پێ خۆش بوو، هیوای دەخواست رۆژێ لەرۆژان، جارێک ئەو بۆنە بە ساف و بێ گەردی و بێ تێکەڵبوونی بۆنەکانی تر، ئەوەندە زۆر هەڵبمژێت، تا پێی سەرخۆش دەبێت. دواتریش کە لە گێڕانەوەکانی خەڵک بیستی، دەریا چەندە گەورەیە، مرۆڤ دەتوانێت بە درێژایی چەندین رۆژ بە کەشتی بەسەریا گوزەر بکات، بێ ئەوەی وشکاتییێک ببینێت، ئیتر هیچ ئەندێشەیەک لای ئەو لەوە خۆشتر نەبوو، کە لەسەر کەشتییێک، لە بڵندایی لەناو سەبەتەی ستوونی پێشکۆکەی، دابنیشێت و لە ئاسمانەبۆنی بێ مەرزی دەریا لە شەقەی باڵان بدات، لە راستیدا ئەمە چ بۆنێک نەبوو، بەڵکو هەڵکێشانی هەناسەیەک بوو، دانەوەی هەناسەیەک بوو، کۆتایی هەموو بۆنەکان بوو، کە لە خۆشییان خۆی لەو هەناسەیەدا دەتواندەوە. بەڵام هەرگیز نەدەبووایە ئەو بگاتە ئەو مرازە، گرێنوی کە ئێستا لە مەیدانی گریڤی، لەسەر کەناری رووبارەکە، وەستابوو، چەندین تیلمە شنەبای دەریای بە لووتدا کەوتبوو، هەڵیمژتبوون و دابوونیەنەوە، نەدەبووایە هەرگیز لە ژیانی خۆیدا، دەریا، خودی دەریا، زەریای گەورەو مەزن، ئەوەی کەوتۆتە رۆژئاوا بە چاو ببینێت و خۆی تێکەڵی ئەو بۆنە بکات.گرێنوی بۆنی ئەو دیوی گەڕەکی سانت ئوستاژ و هۆتێلی ڤیلاشی بەزوویی و بە تەواوی هەڵمژی، بە شێوەیەک لە شەوی ئەنگوستەچاویشدا رێگەوبانی لێ گوم نەدەبوو. ئیتر مەیدانی ڕاوەبۆنی بەربەرینتر بوو، لە سەرەتا بەرەو رۆژئاوا، بەرەو فۆبۆخ سانت ئۆنروێ ، پاشان بەرەو هەورازی شەقامی سانت ئەنتوان تا ئەوبەری باستیل، بۆ گەڕەکی سۆربون و بۆ ناو فۆبۆخ سانت ژێرمە، بۆ ئەو شوێنەی

خەڵکە داراو دەولەمەندەکانی تێدا دەژیا. لە نێوانی دەروازە میلدارە ئاسنینەکاندا بۆنی چەرمی پەیتووکەکانی هەڵدەمژی، بۆنی پۆدرەی بارۆکەی لاوە پێشخزمەتچییەانک، لە باخچەکانی پشتەوەی دیوارە بڵندەکان بۆنی گوڵە مێخەک و سۆرگوڵ و شەونمی تازە بڕاوەی هەڵدەمژت. هەر لێرەش بوو، بۆ یەکەمین جار لە ژیانیدا، گرێنوی بۆنی عەتری، بە مانای وشە، هەڵمژی: بۆنی لاوەندە، یاخود بۆنی گوڵاو، ئەو گوڵاوەی کە لە ئاهەنگ و بۆنە تایبەتیەکاندا دەکرایە ناو ئاوپڕژێنی ناو باخچەکان، بەڵام بۆنی عەتری ئاڵۆزتر و گرانبەهاتریش، تێکەڵ بە ڕۆنی لیمۆ و ڕۆنی گوڵی دەمەشێر، نیلۆفەر، یاسەمین، دارچین، ئێواران وەک چەپکە عەترێکی سەنگین لە پشتەوەی پەیتووکەکانەوە، دەهاتن و بەو ناوە بڵاودەبوونەوە. ئەو هەموو بۆنە خۆشانەی لای خۆی تۆمار دەکرد، وەک چۆن بۆنە سەرەتاییەکانیشی لای خۆی تۆمارکردبوون، لەبەر ئەوە نا کە ئەو بۆنانەی لا زۆر نایاب و عەنتیکە بن و سەرسام بێت پێیان، بەڵکو ئەو مەراقی هەموو بۆنێکی نوێ بوو. لە ڕاستیدا ئەو لەوە گەیشتبوو، کە مەبەست لە بەکارهێنانی عەترەکان، بریتییە لە مەستکردن و ڕاکێشانی سەرنج و هەستەکان، هەروەها ئاشنای ئەو زاخ و پێکهاتانەش ببوو، کە ئەو عەترانەیان لێ سازکرابوو، وەلێ هەموو پێکەوە تۆزێک ئاڵۆز و لێڵ دەردەکەوتن، وا دەردەکەوت کە ئەو پێکهاتانە پتر شێلدراوی ناویەکتری ببوون، نەک خرابووبنە سەر یەکتری و پێکهاتە گشتییەکەیان پێکهێنابێت، هەروەها دەیزانی، کە دەتوانرێت بۆنی تری خۆشی زۆر جیاوازتر لەمانە بهێنرێتە بەرهەم، ئەگەر بێت و هەمان ئەو پێکهاتانەی بخەنە بەردەست، کە ئەمانەیان لێ سازکرابوو.ئەو پێشتر لە ڕێگەی گوڵ و بەهاراتەکانی بازاڕ، ئاشنای زۆر لەو جۆرە پێکهاتە بنچینەییانە ببوو. تەنها هەندێکیان بۆ ئەو نوێ بوون، ئەوانەشی لەو بۆنە پچڕ پچڕ و تێکەڵاوانە دەردەهێناو بێ ناو لە ئەندێشەی خۆیدا پاشەکەوتی دەکردن: عەنبەر، میسک، گوڵەپاچولی، گیاکەڵەی لیگنوم سانتالیوم، لیمۆ، گیای ڤێتیڤێریا، مایرە، بنێشتی بخوور، گوڵەبیرە، جێلی سەگڵاو...

ئەو بۆنەکانی بژار نەدەکرد، چ بۆنێک باشەو چ خراپە، ئەو جارێ هێشتان جیاوازی لە نێوانیاندا نەدەکرد. ئەو هەر شەیداو مەرەقی بۆنی نوێ بوو. بێ ئەملاوئەولا، ئامانجی ڕاوەکەی ئەو بریتی بوو لەوەی، کە ببێتە خاوەنی هەموو ئەو بۆنانەی کە لە جیهان و مەملەکەتی بۆنەکاندا بوونیان هەیە، گرنگ ئەوەیە بۆنەکە بۆ وی نوێ بێت و پێشتر پێێ ئاشنا نەبووبێت. بۆنی ماینێکی ئەرەقکردوو لای ئەو وەک بۆنی ناسکی کەسکی خونچەیەکی خرپن بوو، بۆنی بۆگەنی پندێک یان قالۆچەیەک لای ئەو، کەمتر نەبوو لەو بەرامەی کە لە گۆشتی چەورو سوورکراوەی گوێرەکەیەک، کە لە ئاشبەزخانەی خانەکان دەهاتە دەرەوە. ئەو هەموو، هەمووی لووش دەکردن، هەمووی بۆ

ناوەوەی خۆی هەڵدەمژی. بەڵام لە ئاوێتەی متبەقی بۆنەکانی ئەندێشەیدا، کە هەمیشە بە بەردەوامی، پێکهاتەبۆنی تری دەخستە سەر، هێشتان ئامانجی جوانیی، باڵادەست نەبوو. ئەوەی ئەو دەیئافراندن هەمووی نەخشی ئاڵۆز و سەیر و نامۆ بوون، سازی دەکردن و دووبارە تێکی دەدانەوە، وەک منداڵێک، کە بە قوڕ وداروچکە گەمە بکات، دەولەمەند لە داهێنان و، چاڵاک لە تێکدان، بێ ئەوەی ئامانجێکی ئافراندنی تێدا دەربکەوێت.

# ٨

لە یەکی ئەیلوولی ١٧٥٣، لە ساڵرۆژی هاتنەسەرتەختی پاشا، ئاگرێکی مەزن لە پاریس لە پۆنت رۆیال کرابووەوە، ئاگرەکە بە قەد ئەو ئاگرە مەزن و سەرنجڕاکێش نەبوو، کە لە رۆژی زەماوەندی پاشا کرابووەوە، یان وەک ئەو ئاگرە ئەفسانەییەی کە لە رۆژی لە دایکبوونی شازادە کرابووەوە، بەڵام ئەویش بە قەد خۆی ئاگرێکی سەرنجڕاکێش بوو. بازنەی ئاگرپرژێنی وەک رۆژیان لە ستوونەکانی کەشتی قایم کردبوو، پەیکەری ئاژەڵیان لەسەر لێوی پردەکان دانا بوو، بە پروشک و ئاگری سەر قۆچەکانیان رووبەرەکەیان ئەستێرەباران دەکرد. لە کاتێکدا تەقوهۆڕی راکێت و تەلقەتەنوور و تۆنترۆقە لەهەموو لایەکەوە گوێی کەڕ دەکرد، راکێت بڵند بڵند بۆ هەوا بەرزدەبوونەوە، هێلی سپی و درەوشاوەیان لەسەر پەردەی رەشی ئاسماندا دەنەخشاند. حەشاماتێکی چەندین هەزاران کەس، لەسەر پردەکان و لەم بەر و ئەو بەری ڕووبارەکە کوببوونەوە، تەماشای ئەو بەزم و ڕەزمەیان دەکردو چەپڵەیان لێ دەداو هەزاران ئۆ و هێ و ئەها دەنگی دەدایەوەو، هورایان دەکێشاو، تەنانەنەت بژی بژیشیان بۆ پاشا دەگوت، هەرچەندە پاشا سی و هەشت ساڵ لەمەوبەر هاتبووە سەر تەختی پاشایەتی و، لەمێژبوو ترۆپکی خۆشەویستی خۆی لای گەل بەجێهێشتبوو، بەڵام کاریگەری ئەو ئاگرانە ئاوا بوو.

گرێنوی لە سێبەری پاڤیلیۆنی دوفلۆر، لە کەناری دەستە راست، بەرامبەر پردی رۆیال قوڕ و قەپ وەستا بوو. نە چەپڵەی لێ دەداو نە هاواری دەکرد، تەنانەت کە راکێتەکانیش بەرز دەبوونەوە تەماشای نەدەکردن. ئەو بەو هیواو باوەڕەوە هاتبوو، کە دەتوانێت بۆنی شتهاییێکی نوێ، هەڵبمژێت، بەڵام زوو بۆی دەرکەوت، کە ئەو ئاگرباران و تەقوتۆقە چی نوێیان لی هەڵناهێنجرێت. ئەو هەموو ئاگرپژێن و گوڕی و پڕوشک و پشکۆو هاوار و فیتەو گرم و هۆڕە، تەنها تێکەڵەیەکی مۆنۆتۆنی نەگۆڕ لە بۆنی گۆگرد و رۆن و ترشی ناتریک لە دوای خۆی بە جێدەهێڵن.

ئەو خەریک بوو لە بێزارییان ئەو ئاهەنگە بە جێبهێڵێت و، بە پاڵ گەلەری لۆڤەر، بەرەو ماڵ بچێتەوە، لەو کاتەدا بوو کە با شتێکی لەگەڵ خۆیدا بۆ هێنا، شتێکی وردیلەو، بە ئاستەم سەرنجراکێش، زۆر کەم، ئەتۆمی بۆنێک، نەخێر، زۆر وردتر، باشترە بڵێین سۆسەکردنی بۆنێک،

نەک بۆنێکی ڕاستیی. بەڵام سۆسەکردنێکی ڕاستیی، بۆ بۆنێک کە هەرگیز پێشتر بۆنی نەکردبوو. دیسان گەڕایەوە سەر دیوارەکە، چاوی قوچاندو لووتی کردەوە. بۆنەکە ئەوەندە وردو ناسک و نائاسایی بوو، بۆی نەدەگیرا، دووبارە لووتی پڕ دەکرد و هەڵیدەمژیەوە، بۆنی باڕووتی تەلقەتەنوورەکان ئەو بۆنۆکە ناسکەیان دادەپۆشی، بۆنی دەرهاویشتەی ئەو هەزاران هەزار جەستەمرۆڤە ڕێگەیان لێ دەگرت، بە هۆی هەزاران هەزار بۆن و بەرامەی شارەکە، ئەو وردکە بۆنە پارچە پارچە دەبوو، دەپلیشاوە. بەڵام لە ناکاوێک دیسان دەهاتەوە، تیلمێکی زۆر بچووک و بەس، چرکەساتێک بۆنێکی نایاب و خۆشی بۆ دەهات و دیسان خێرا بزر دەبووەوە. گرێنوی هەستی بە ئازارێک دەکرد، بۆ یەکەمین جار لە ژیانیدا تووشی شتهاییێک دەبوو، کە تەنها هەر سیمای مەراقێکی ڕووت نەبوو، کەڵکەڵەی بوو بێت، بەڵکو ئەوجارە بەڕاستی دڵی بوو، کە ئازاری پێوە دەچەشت. زەینی بۆ ئەوە چوو، کە ئەو بۆنە تایبەتە کلیلی ڕێکخستنی هەموو بۆنەکانی ترە، ئەگەر کەسێک لەو بۆنە نەگات، ئەوا هیچ لە بارەی بۆنەکان نازانێت. ئەو، گرێنوی ئامادەبوو، ئەگەر نەتوانێت، ئەو بۆنە بەدەستبهێنێت، قیریسیا لە ژیانی خۆی بکات،. پێویست بوو ئەو بۆنە بەدەستبهێنێت، نەک لەبەر تەماعی هەبوون، بەڵکو بۆ ئارامکردنەوەی جۆشی دڵی.

لە هەژمەتان خەریکبوو تێکبچێت. هێشتان ئەوەشیی بۆساخ نەکرابووەوە، کە ئایا ئەو بۆنە لە کام لاوە دێت. هەندێ جار چەند خولەکێکی پێ دەچوو، ئەوجا دیسان تیلمێکی بۆنەکە دەهاتەوە ئارا، هەر جارێک کە بۆنەکە پەیدا دەبوو، تووشی ترسێکی دژوار دەبوو، حەزی دەکرد، بۆ هەمیشە بۆنەکە سەرنگووم ببێت. تا لە ئاکامدا بە دوودڵی بڕوای بەوە هێنا، کە بۆنەکە لەم بەری ڕووبارەکەوە، لە شوێنێک، لەلای باشووری ڕۆژئاواوە دێت.

لە دیواری پاڤیلیۆنی دوفلۆر دوووڕکەوتەوەو، خۆی نقوومی ناو ئاپۆڕەی خەڵک کرد، چووە سەر پردەکە بەرەو ئەوبەر ڕێگەی گرتە بەر. چەند هەنگاوێکی دەهاویشت هەڵوێستەیەکی دەکرد، لەسەر پەنجەکانی پێێ دەوەستا، تا لە هەورازی سەری مرۆڤەکانەوە هەوا بۆن بکات، لەسەرەتا لە تەنگەتاوی هیچی بۆن نەدەکرد، بەڵام پاشان دیسان سەرەداوی بۆنەکەی دۆزییەوە، بۆنەکەی هەڵمژی، تەنانەت ئەوجارە بۆنەکە پتەوتر بوو لە پێشوو، زانی کە ڕێگاکەی ڕاستە، بە قەرەپەستی خۆی لە ناو تەق و هۆڕ و حەشاماتی تەماشاچییان پەستا، کە هەموو چاویان بڕیبووە ئاسمان بۆ ڕۆناکی گڕو پڕوشکی ئاگری ڕاکێتەکان، جارێکی تریش بە بۆنی چڕەدووکەڵی تیژی باڕووت، بۆنەکەی لێ گوم بوو، تەنگەتاو بوو، بە پەستان بەرەو پێشەوە دەچوو، خۆی لەناو خەڵکەکە

دەپەستا، بە چەند دەقیقەیەکی بێ کۆتایی، گەیشتە ئەو بەر، بەردەم مێوانخانەی دو مەیی کەناری مەلەکی و شەقامی سێنە...

ئەلێرە راوەستا، خۆی کۆکردەوەو بۆنی کرد، بۆنەکەی دۆزیەوەو توند گرتی. بۆنەکە وەک چەپکێک بە شەقامی سێنە دەهاتە خوارەوە، زۆر بە رۆشنی، هی ئەوە نەبوو هەڵەی تیدا بکات، بەڵام هێشتان بۆنەکە زۆر ناسک بوو، زۆر وردیلە بوو. گرێنوی هەستی بەوە کرد، کە چۆن دڵی لێی دەدا، دەیزانی ئەو لێدانی دڵە هی ماندووبوونی رێگاکە نیە، بەڵکو ئەوە دڵە، بە ناچاری، بە کاریگەری ئەو بۆنە وا توند لێ دەدات. بیری کردەوە، کە شتێک بێنێتەوە بیری خۆی، ئەمەی ئێستای لەگەڵدا بەراورد بکات، بەڵام شتێکی وای پێشتر نەدیبوو، هیچی نەهاتە خەیاڵ، ئەمە بۆنێکی فریشە، بۆنێکە تازەییی تێدا هەیە، بەڵام نەک وەک تازەیی بۆنی نارنج و لیمۆ، نەک وەک تازەیی بۆنی بخوور، یان هی گەڵای دارچین، یان پونگ، یان سپیدار، یان کافوور، یان کاژ، یان هی بارانی بەهارە، یان بای سەر بەستەڵەک، یان هی کانیاو... لە هەمانکاتدا ئەو بۆنە گەرمیەکی پێوەیە، بەڵام نەک وەک گەرمی لیمۆ و پرتەقاڵ، داری سەروو، گوڵە هێرۆ، نەک وەک گەرمی یاسەمین، یان هی نێرگز، هی داری ساج، یان هی شەوبۆ... ئەو بۆنە تێکەڵەیەک بوو، لە بۆنی پەرتبووی ناجێگیر و، بۆنی گران و سەنگین، نەک تێکەڵەیەک، بەڵکو یەکەیەک لە هەردووکیان، بەڵام، کەم، سووک، سەقامگیر و هەڵگرتە، وەک پارچەیەک ئاوریشمی تەنکی درەوشاوە... دیسانیش وەک ئاورپیشمێک نا، بەڵکو وەک شیرێکی وەک هەنگوێنی شیرین، کە بسکوێتی تێدا توابێتەوە، هەرچەندە بشمانەوێ، شیر و ئاورپیشم ناچنەوە سەر یەک: شیر و ئاورپیشم! ئەوە بۆنێکی بەرجەستە نیە، ناگیرێت، وەسفی ناکرێت، بە هیچ شێوەیەک رێکناخرێت، لە راستیدا ئەوە شتێکە ناکرێت هەبێت. کەچی بە ئاشکرا هەبوو. گرێنوی شوونی بۆنەکەی هەڵدەگرت، بە دڵێکی کاس و پڕ لە تاسە، چونکە ئەو سۆسەی ئەوەی کردبوو، کە ئەوە خۆی نیە کەوتۆتە دوای بۆنەکە، بەڵکو بۆنەکەیە کە ئەوی توند گرتووە، بە دوای خۆی کێشی دەکات.

بە هەورازی شەقامی سێنە سەرکەوت، کەس لەسەر جادەکە نەبوو. ماڵەکان هەموو چۆل و ئارام بوون. خەڵکەکە هەموو لە خوارەوە لە سەیری رۆکێتبازی و ئاگریاری بوون. چیتر بۆنی حەشاماتی خەڵک، دووکەڵی تیژی باروت، بێزاریان نەدەکرد. جادەکە بۆنی بۆنە ئاساییەکانی لێ دەهات، بۆنی ئاو، پاشەرۆک، جورج، پاشماوەی سەوزەوات. بەڵام لەسەرەوەی ئەوانە، بۆنێکی ناسک سەقامی گرتبوو، کە بە رۆشنی ئەو چەپکە بۆنە بوو، کە ئەوی رێنمایی کردبوو. دوای چەند هەنگاوێکی کەم، ئەو کەمە رۆناکییەی کە لە ئاسمانەوە دەپرژایە خوارەوە، لە لایەن خانووە

بەرزەکانەوە هەڵڵووشرا، ئیتر گرێنوی لە تاریکاییدا دەڕۆیشت. پێویستی بەوە نەبوو هیچ ببینێت، چونکە بۆنەکە بە سەلامەتی ڕێنمایی دەکرد. دوای پەنجا مەترێک بەرەو دەستە ڕاست وەرچەرخایەوە، چووە سەر شەقامی ماری، کە هێشتان تاریکتر بوو، کوچەیەکی تەنگ، بە قەد بازووێک بەرین دەبوو یان نا. لەوێ بۆنەکە زۆر بەهێزتر نەبوو لە پێشوو. تەنها هەندێک سافتر بوو، وردە وردە پاراوتر دەبوو، چەند پاراوتر دەبوو، ئەوەندە هێزی ڕاکێشانەکەی زۆرتر دەبوو. گرێنوی بێ ئیرادەی خۆی، بێ ویستی خۆی دەڕۆیشت. لە شوێنێک بۆنەکە زۆر بە توندی بەرەو دەستە راست رایکێشا، لە ناوەڕاستی دیواری ماڵێک بەرەو ژوورەوە. دەروازەیێکی نزم بەرەو حەوشەی پشتەوە دەچوو. وەک شەوڕۆیەک، وەک ئەوانەی خەودەبینن و بە نووستوویی هەڵدەستنە سەر پێ ڕێ دەکەن، گرێنوی چووە ناو دەروازەکە، هەنگاوی نایە ناو حەوشەی پشتەوەی خانووەکە، لە گۆشەیەک سووڕایەوە، گەیشتە حەوشەیەکی تری بچووکتر، ئیتر ڕۆناکییەکە لێرە بوو: شوێنەکەی تەنها چەند هەنگاوێک لەم دوور بوو. میچێکی داری لار بەسەر دیوارەکە بۆ پێشەوە هاتبووە خوارەوە. لە ژێرەوە مۆمێک بە سەرڕووی مێزێک وەنووسابوو. کچێک لە تەنیشت ئەو مێزە دانیشتبوو، هەڵووژەی پاک دەکردەوە. هەڵووژەکانی لە سەبەتەیەکی دەستەچەپی هەڵدەگرت، بە چەقۆیەک لەتی دەکردن، ناوکەکانی دەردەهێنان، دەیهاویشتنە ناو پەقرەجێک. تەمەنی سێزدە، چواردە ساڵان دەبوو. گرێنوی وەستا بوو، تەماشای دەکرد. ئیتر زانی چاوگی ئەو بۆنە ناسکە چیە، ئەو بۆنەی کە ئەو نیو میل دوور، لەم بەری ڕووبارەکەوە بۆنی کردبوو: ئەوە ئەو حەوشە پیسەی پشتەوە نەبوو، بۆنی ئەو هەڵووژانەش نەبوو، ئەوە ئەو کچە بوو، کانی ئەو بۆنە ئەو کیژە بوو.ساتەوەختێک ئەوەندە سەرسام و پەشۆکاو ببوو، هەر بەڕاستی هاتە خەیاڵی، کە لە ژیانیدا هیچ شتێکی لەم کیژە جوانتری نەدیوە. لە کاتێکدا کە تەنها لە پشتەوە، تارمایی کچەکەی لەبەردەم ڕۆناکی مۆمەکە دەدیت، بەڵام بێگومان ئەو مەبەستی وا بوو، کە لە ژیانیدا بۆنێکی لەمە خۆشتری بۆن نەکردووە. بەڵام خۆ ئەو بۆنی مرۆڤی دەناسی، چەندین هەزار بۆنی پیاو و ژن و منداڵانی بۆن کردبوو، نەیدەویست باوەڕ بەوە بکات، کە دەکرێت مرۆڤێک بۆنێکی ئەوەندە ناسک و نایابی لێ بێت. بە شێوەیەکی گشتی مرۆڤەکان ئەگەر بۆنێکی ناخۆشیان لێ نێت، ئەوا بۆنێکی ئەوتۆیان لێ نایەت، کە شایانی باس بێت. منداڵان بۆنێکی بێ بۆنیان لێ دێت، پیاوان بۆنێکی میزاوی و بۆنی ئەرەق و پەنیریان لێ دێت، ژنانیش بۆن چەوری ترشاو و ماسی بۆگەن. بە گشتی مرۆڤەکان بۆنێکی ناخۆش و قێزەوەنیان لێ دێت... بۆیە ئەوە یەکەمجاری بوو، گرێنوی باوەڕ بە کەپووی خۆی نەکات و پێویستی بە یارمەتی چاوەکانی ببێت،

تا بزانێت ئەوەی کە بۆنی دەکات چیە. ئەو پەشۆکاویە زۆری نەکێشا، چونکە بەڕاستی تەنها پێویستی بە چاوقوچانێک هەبوو، بۆ ئەوەی بە چاو، بە دیتن خۆی لەمە دڵنیا بکات و بێ ئەملاوئەولا مل بۆ سەرنجەکانی هەستی بۆنکردنی خۆی کەچ بکات و دان بەلووتی خۆیدا بنێت. تەنها بۆنی کرد، ئەوە بۆنی ئەو کیژە بوو، بۆنی مرۆڤێک بوو، بۆنی ئەرەقەی بن هەنگڵی ، چەوری پرچی، بۆنی ماسییانەی ئەندامی مێینەی، هەمووی بۆن کردن، ئەو بۆنانەی زۆر پێ خۆش بوون. بۆنی ئەرەقی جەستەی، بۆنێکی تازەی وەک بۆنی بای دەریا بوو، چەوری قژی، بۆنێکی شیرینی وەک بۆنی رۆنی گوێزی لێ دەهات، شەرمگای بۆنێکی وەک بۆنی شەرابی گوڵەزەئبەقەی لێ دەهات، پێستی بۆنێکی وەک بۆنی زەردەلووی لێ دەهات...، داڕشتەی ئەم هەموو پێکهاتانە، پێکەوە بۆنی عەترێکی لێ دەهات، عەترێکی هارمۆن، عەترێکی هاوسەنگ، عەترێکی ئەوەندە سیحراوی، کە هەموو ئەو عەترانەی ئەو تا ئێستا بۆنی کردبوون، هەموو ئەو کوشک و تەلارە بۆنییانەی کە ئەو بە یاری کردن لە ناوەوەی خۆی، سازی کردبوون، لە بەرامبەر ئەو هەرەسیان دەهێناو بە جارێک بێ مایەو بێ مانا دەرکەوتن. سەدان هەزاران بۆن لە بەرامبەریدا دەتوانەوەو شەرمەزار دەبوون. ئەو بۆنە بوو ئەو پرەنسیپە باڵایە، ئەو نموونە نموونەییە، کە دەبووایە بکرێت بە سەرمەشق بۆ دامەزارندن و بۆ رێکخستنەوەی هەموو بۆنەکانی تر. ئەوە ترۆپکی جوانیی بوو، جوانیی پاراو و بێ گەرد. گرێنوی تێگەیشت، کە ئەگەر نەتوانێت ببێت بە خاوەنی ئەو بۆنە، ئیتر ژیانی ئەو هیچ مانایکی نابێت. پێویستە شارەزای ئەو بۆنە ببێت، بە وردترین لق و چلەکانی، بە رەگ و موولوولەی ریشەکانی ئاشنا ببێت، تەنها بیرەوەری کۆپێکهاتەی ئەو بۆنە بۆ ئەو بەس نیە، بەمە بە تەنها دڵی دابین نابێت. ئەو دەیویست پەڕەی گرنج گرنج و شێواوی رۆحی رەشی خۆی بە مۆری ئەو بۆنە خودابیە مۆربکات، دەیوست زۆر بە وردی شێی بکاتەوە، ئاوێتەکانی ئەو پێکهاتە سیحراویە، تا بەشەکانی ناوەوەی، تا ڕەگ و ریشەکانی ورد ورد لە ئەندێشەی خۆی تۆمار بکات. دەیویست ئاوێزەی ئاوێتەکانی ئەو بۆنە ببێت و بۆخۆی بیانکات بە پێوەری بیرکردنەوەو بۆنکردنی ژیان. بە ئەسپایی لێی چووە پێش، هێدی هێدی لێی نزیک کەوتەوە، گەیشتە ژێر میچەکە، تەنها یەک هەنگاوی مابوو پێی بگات ، لەجێی خۆی وەستا، کیژە ئاگای لەم نەبوو.پرچێکی سوور، کراسێکی بۆری بێ قۆڵ. باسک زۆر سپی، دەست زەرد بە ئاوی هەڵووژە لەتکراوەکان. گرێنوی لە پشتەوە لەسەر سەری وەستابوو، خۆی بەسەردا چەماندەوە، بۆنی کچەکەی بە تەواوی و بە بێگەردی، بێ تێکەڵی هیچ بۆنێکی تر، هەڵمژی، کو بۆنەکە لە گەردەنی، لە قژی، لە دەرزی کراسەکەی، هەڵدەستا ئاوا، وەک خۆی هەڵیدەمژین، چۆڕی دەکردنەوە ناو هەناوی خۆی، وەک

شنەبایێکی نەرم. هەرگیز ئەوەندە هەستی بە بەختەوەری نەکردبوو. بەڵام ساردییێک کچەکەی داگرت.ئەو هێشتان گرێنوی نەدیبوو. بەڵام هەستی بەشتێک کرد، شتێکی سامناک، ساردییێکی تایبەت، وەک چۆن مرۆڤ لە ناکاو تووشی سامگرتنێک بێت، ئاوا. وەک ئەوەی بایێکی سارد لەسەر پشتی هەڵیکردبێت، وەک ئەوەی کەسیک دەرگاییێکی کردبێتەوە، تەزووەبایێکی زۆر ساردی لێ هاتبێتە ژوورەوە. چەقۆکەی دانا، مەچەک و بازووی خستە سەر سینەی و خۆی وەرسووڕاندەوە.کە چاوی بە گرێنوی کەوت لە ترسان تاسا، هێدمی گرتی، زانی کە ئەو پیاوە کاتێکی زۆری لەبەردەمدا بووە، دەست لە هەوکی وەرینی. هەوڵی هاوارکردنی نەدا، لە جێگەی خۆی نەبزووت، هیچ بزووتنەوەیەکی نەکرد بۆ بەرگریکردن لە خۆی. گرێنویش سەیری ئەوی نەدەکرد. ئەو دەموچاوە کە دەتگوت خونچەگوڵی کراوەی هاوینەیە، ئەو دەمە سوورە، ئەو چاوە کەسکە پڕشەدارە، گرێنوی هیچی نەدەدیت، چونکە ئەو کاتەی خەریکی خنکاندنی کچەکە بوو، چاوەکانی خۆی توند قوچاندبوو، ئەو هەر لە خەمی ئەوەدا بوو، کە هیچ بۆنێکی کچەکەی لە دەست نەچێت. کە کچەکە گیانی لەدەستدا، خستیە سەر عەردەکە، خستیە سەر ناوکە هەڵووژەکان، کراسەکەی لەبەر هەڵزڕاند، لافاوی بۆنی جەستەی تەوژمی هێنا، کورپێژگەی نقوومی بۆنی خۆی کرد. گرێنوی دەموچاوی خۆی خستە سەر پێستی، کونەلووتەکانی وەک دەف کرابوونەوە، لە جەستەی کچەی هەڵدەسووی، لە زگەوە بەرەو سنگ و مەمکی، بەرەو گەردەنی، دەموچاوی، بۆ ناو قژی، دیسان دەگەڕایەوە بەرەو زگی، بەرەو ژێرەوە بۆ سەر شەرمگای، بۆ سەر ڕانەکانی، بۆ سەر قاچە سپی و سۆڵەکانی. لە سەریەوە تا پەنجەکانی پێی بۆن دەکرد، هەموو بۆنە ماوەکانی هەڵدەمژی و کۆی دەکردنەوە، هی چەناگەی، هی ناوکی، هی لۆچەکانی بن بازووی.

ئەوەندەی هەڵمژی تا کچە سیس بوو، پاشان ماوەیەک لەسەر چیچکان لە تەنیشتی دانیشت، تا خۆی کۆبکاتەوە، چونکە ئەوەندە پڕببوو لە بۆنی کچە، نەیدەویست هیچی لێ بڕژێت. دەبووایە جارێ دەرزەکانی ناوەوەی خۆی کەڵێنبڕ بکات، ئەوجا هەستایەوە سەرپێیان، مۆمەکەی کوژاندەوە.

لەو کاتەدا بوو، کە وردە وردە خەڵک بەرەو ماڵ دەهاتنەوە، دەنگی هوراو بژی بژی، لە شەقامی سێنە بەرز دەبووەوە. گرێنوی بە ناو تاریکیدا خۆی خشاندە ناو کوچەکە، بەرەو شەقامی پوتی ئۆگوستە شۆڕبووەوە خوار، بە تەریبی لەگەڵ شەقامی سێنە بەرەو رووبارەکە چوو. هێندەی نەبرد تەرمی کچە دۆزرایەوە. قیژەو هاوار دەستی پێ کرد. چرا پێ کران. پاسەوان هاتن. دەمێک بوو گرێنوی گەیشتبووە ئەوبەری رووبارەکە.

لەم شەوەدا عەمباری خەوەکەی وەک کۆشکێک و تەختەخەوەکەی وەک کۆشی ئاسمان دەهاتە بەرچاوی. تا ئەو کاتە نەیزانی بوو، بەخت و بەختەوەری لەو ژیانەدا چیە. تەنها چەند بارێکی دەگمەنی دیبوو، کە تێیاندا دەرکی بە تارمایی سووکە ئاسوودەییەک کردبوو. بەڵام ئێستا لە خۆشییاندا موچرکی دەهاتێ، لە خۆشییان نەیدەتوانێ بخەوێت. وەک ئەوە وابوو، کە جارێکی تر لە دایکبووبێت، نەخێر نەک جارێکی تر، وەک ئەوە وابوو کە تازە بۆ یەکەم جار لەدایکبووبێت، چونکە تا ئێستا تەنها وەک ئاژەڵێک هەستی بە بوونێکی تارماوی خۆی دەکرد. بەڵام لەم ڕۆ بەدواوە، وەک ئەوە وابوو، کە تازە بۆی ئاشکرا بووبێت، بەڕاستی ئەو کێیە: واتە مرۆڤێکی بلیمەتەو، ژیانیش ماناو ئامانجێکی هەیەو شتی مەزنتری تێدایە: بۆ نموونە یاخیبوون و شۆڕشکردن نرخیان کەمتر نیە لە جیهانی بۆنەکان، ئەوەی کە ئەو بە تەنها خاوەنی هەموو کەرەسەکانیەتی: واتە لووتێکی تایبەت و هەستیار و بێ وێنە، ئەندێشەیەکی تیژی نائاسایی، لە هەموانیش گرنگتر، داڕشتەبۆنی کیژێک لە شەقامی ماری، ئەو ئاوێتە سیحراویەی کە هەموو ئەو پێکهاتانەی تێدایە، کە بۆ سازکردنی بۆنێکی مەزن، عەترێکی مەزن پێویستن: ناسکی، هێز، بەردەوامی، هەمەجۆر و حەپەسێنەر، جوانییێک کە خۆی لەبەر رانەگیرێت و هەموو گیانێک حەیران بکات. ئیتر ئەو قیبلەنامەی ژیانی ئایندەی خۆی دۆزیبووەوە. ئەویش وەکوو هەموو بلیمەتە سامناکەکان، کە ڕووداوێکی دەرەکی، ڕێگاییێکی راست دەئاخنێتە ناو پێچە ئاڵۆز و پڕ لە گێژاوەکانی رۆحیان، ئیتر گرێنویش وازی لەو ئاراستەیە نەهێنا، ئەوەی ئەو وەک ئاراستەی چارەنووسی خۆی، باوەڕی پێ هێنا بوو. ئێستا ئەوەی بۆ رۆشن ببووەوە، کە بۆچی ئەوەندە چیڕ و سەرسەختانە خۆی بە ژیان هەڵواسیوە: دەبێت ئەو ئافرێنەرێکی بۆنەکان بێت. نەک هەر ئافرێنەرێکی ئاسایی، بەڵکو گەورەترین عەترسازی هەموو سەردەمەکان. هەر لەو شەوەدا بوو، کە سروشی بۆ هات، بە واگایی، پاشانیش لە خەو، لە ئاقارێکی وێرانی فراوانی بیرەوەریەکانی، ملیۆنان ملیۆن خشتەبۆنی لەبەردەست دابوو، ئەزمایشی دەکردن و نەخشەی بۆ دەکێشان و بە پێێ نەخشەسازییەکی تایبەت رێکی دەخستن: باشەکان بۆ سەر باشەکان، خراپەکان بۆ سەر خراپەکان، نەمرەکان بۆ نەمرەکان. لە هەفەتەکانی دوا تر ئەو رێکخستنە هەر پاراوتر و وردتر دەبوو، کەتەلۆگی بۆنەکان هەر دەولەمەندتر و جۆراجۆرتر دەبوو، هەرەمی بۆنەکان رۆشنتر دەبوو. زۆر زوو توانی دەست بە کاری ئاواکردنی یەکەمین تەلاری بۆنەکان بکات، ئەوەی کە بە وردی نەخشەی بۆ کێشابوو: خانوو، دیوار، پەیژە، ژێرزەمین، دیوە نهێنییەکان... رۆژ دوای رۆژ پەرەی پێ دەدا، جوانتری دەکرد، دەیڕازاندەوە، تەواوتری دەکرد، باشترین و خۆشترین شێوەبۆنی دەخستە ناو کەڵووەکانی ناوەوەی.

بەوەی کە ئەو بەرزی و باڵاییە، ئەو مەزنییە، هەر لە سەرەتاوە، بە کوشتنی کەسێک دەستی پێ کرد، ئەگەریش بە ئاگاییەوە، بوووبێت، بەتەواوی بێ باک بوو، لای گرنگ نەبوو. ئەو هەر نەیدەتوانی وێنەی کچەکەی شەقامی ماری بێنێتەوە بیری خۆی، دەموچاوی، جەستەی. خۆ ئەو باشترین شتی کچەکەی لای خۆی پاراستبوو، کردبوونی بە مولکی خۆی: ئامانج و شێوازی بۆنەکەی.

# ٩

لەو سەردەمەدا لە پاریس دەستەیەک عەترسازی باش هەبوون. شەشیان لە کەناری دەستەراستی رووبارەکەدا دەژیان، شەشیان لە کەناری دەستە چەپ، یەکێکی یەگجار باشیش لە نێوانیان دا هەبوو، بەتەوای لەسەر پردی ئۆشۆنژ، ئەو پردەی کە کەناری دەستە راستی بە دولا سیتێ، دورگۆکەی رووبارەکە، دەبەستەوە. ئەو پردە ئەوەندە لە خانووە چوارنهۆمییەکانی ئەوبەرو ئەوبەر نزیک بوو، کاتێک کە مرۆڤ بەسەریدا دەپەڕییەوە، لە هیچ لایێک چاوی بە رووبارەکە نەدەکەوت، بەڵکو وات دەزانی لەسەر جادەیەکی ئاسایی تا بلێ قەشەنگ دەڕۆی، کە لەسەر بناغەیەکی قایم دارێژرابێت. لە راستیدا پردی ئۆشۆنژ بە جوانترین جێگەی بازاڕەکە دەزاندرا. بەناوبانگترینی فرۆشگاکان لەوێ بوون. زێڕینگرەکان، دارتاشەکان، باشترین بارۆکەساز، چەرمدروو، کە باشترین گۆرەوی و جلی چەرمییان بەبەرهەم دەهێنا، سازگەی چوارچێوە، فرۆشگای پۆتینی سوارچاکیی، گورنگ و تەنتەنەچن، دارێژگەی قۆپچەی زێڕ و، بانکەکان، هەموو لەوێ کۆبببوونەوە. خانوو و فرۆشگای جۆزێف باڵدین عەترساز و پەنجەوانەدرووش کەوتبووە ئەو شوێنە. کەبەنگێکی قەشەنگ، کە بۆیەی کەسکی لێ درابوو، باڵی بەسەر جامخانەی فرۆشگاکە داهێنا بوو، لە تەنیشتییەوە ئالاییێکی باڵدینیی هەڵواسرابوو. هەمووی زێڕ بوو، شووشەیەکی زێڕین، کە چەپکێک گوڵی زێڕینی لێ ڕووابوو، مافورێکی سووریش لەبەردەم دەرگاکانی راخرابوو، ئەویش وێنەی ئالاییێکی باڵدینی لەسەر نەخشکرابوو، کە بە سیمی زێڕین چنرابوو. کاتێک دەرگاکان دەکرایەوە، زەنگوڵەیەکی ئێرانی دەزنگایەوە، دوو ماسیگری زیوین، لە دەنووکەکانیانەوە، دەستیان دەکرد بە ڕژتنی وەنەوشاو بۆ ناو جامێکی زێڕین، ئەو جامەش هەر لە شووشە دروستکرابوو، ئالای باڵدینیشی لەسەر نەخش کرابوو.

لە پشتی کانتۆڕێکدا کە لە دارێکی کاڵی درەختی سەروو سازکرابوو، باڵدین[1] خۆی وەستا بوو. پیاوێکی پیر و رەقەڵە، دەتگوت ستوونە لەوێ چەقاوە، باڕۆکەیەکی پۆدرەزێڕینی لەسەر بوو، بەروانکەیەکی زێڕچنیی لەبەردابوو. بە تەمێک لەو دونیا گوڵاوەی کە هەموو رۆژێک بەخۆیدا دەپرژاند، چواردەوری گیرا بوو، بەو بۆنە، مەست و حەیران ببوو، هەست و خەیاڵی لەو ناوە نەمابوو، هێندە بێ هەست و خوست وەستابوو، دەتگوت پەیکەرێکی خۆیەتی. تەنها کاتێک زەنگوڵەی دوکانەکە دەزرنگایەوە، ماسیگرەکانیش ئاویان هەڵدەڕشت، کە ئەمانەش زۆر ڕوویان نەدەدا، لە ناکاوێک وەک ئەوەی گیانی بێتەوە بەر دەژیایەوە، وەک ئەوەی پەیکەرەکەی بچێتەوە باریەک و بچووک و ورد بێتەوە، بە پشتی چەماوە، بە پەلە لە پەنای کانتۆڕەکەوە خۆی بەرەو پێشەوە دەهێناو، خێرا فەرموو فەرمووی لە موشتەری دەکرد، ئەوەندە خێرا لە پشتی کانتۆڕەکە دەهاتە پێشەوە، بە زەحمەت تەمی گوڵاوی دەوروبەری، بە دوای دا دەهات. فەرموو، فەرمووی لە موشتەری دەکرد، داوای لێ دەکردن دابنیشن، بۆ ئەوەی باشترین بۆن و میکیاجەکانی فرۆشگاکەیان پێ بناسێنێت. باڵدین هەزاران جۆر بۆن و بۆیەو کرێمی ئارایشتکردنی هەبوو، پێکهاتەکانیان گرنگترین بەرامەی سروشتییان لەخۆدا گرتبوو، رۆنی گوڵان، تینکتور، ئاوی گیاکەڵەو ڕووەکەکان، دەرهاویشتەی گیانەوەران، هەتوانەکان، چەسپی درەختەکان، داو و دەرمانەکانی تر، بە وشکی، بە شلی، یان لە شێوەی شەمێ، رۆن، هەویر، پۆدرە، سابون، کرێم، سپرێی، رەنگی قژ، خەنە، کرێمی سمێل، قەترەی بالووکە، پلاستەری ئارایشت تا ئاوی گەرماو، شیری پێست، خوێی بۆندار، کۆلۆنی و بێ ژمار عەتری رەسەن. بەڵام باڵدین بەو بەرهەمە کلاسیکییانەی ئارایشتسازی وازی نەدەهێنا، بەڵکو چاوی لەوە بوو، کە هەموو شتێکی بۆنداری ئەو دنیایە لە فرۆشگاکەی خۆی کۆبکاتەوە، یاخود هەر شتێک کە دوور و نزیک پەیوەندی بە بۆن و بەرامەوە هەبێت. لەبەرهەندێش لە پاڵ مێخەک و چیلکەی بخوور و مۆمی بۆنخۆش ، تەواوی بەهاراتەکان، زەردەچەوە، کاری، رەیحان، رازیانە، دارچین، پونگ، جاترە، زیرە، شروب، لیکور، ئاوی مێوەکان، شەرابی قوبرس، شەرابی مەلەگاو کۆرنیس، قاوە، چا، بەلەچەک و مورەببا، هەنجیر، شەکرۆکە، چوکلێت، کاستانیا، تەنانەت کەبەرشۆری بەری کەبەر، ئاروو، پیاز، ماسی توینی خوێکراو. ئەوجا شەممۆری بۆنخۆش، کاغەزی عەتراوی نامە، مەرەکەبی خۆشەویستی، کە

---

[1] لە راستیدا ناوی ئەو کەسەی "بالدینی"یە، من کردوومە بە بالدین، بۆ بانگکردن و خوێندنەوە خۆشترە

بۆنی رۆنی سۆرگوڵی لێ دەهات، نامەدان لە پێستی ئیسپانی، خامەگر لە داری سپی سەندەل، باولۆکە لە داری جنۆکە، بخووردانی سفر، چەندین جۆر شووشەی کریستاڵی بۆن و هەتوان داو و دەرمان کە هەموو بە دەرخۆنەی بەردی کارەب سوێندرابوون، دەستەوانەی بۆندار، دەستەسڕ، بالیفۆکەی دەرزی، کە پڕکرابوون لە گەڵاگوێزی بۆنخۆش، تاپێتەی عەترکراو بە هەڵمی میسک، لە هەر هۆدەیەک دانرابان، ئەو هۆدە سەت ساڵ پڕ دەبوو لە بۆن.بێ گومان ئەو شتانە هەمووی لە جادەکەوە، یان لەسەر پردەکەوە، بە زریق و باق نەدەکەوتنە بەرچاوان، بەڵکو لەبەر نەبوونی ژێرزەمینێک، گەنجینەی خانووەکەو هەموو ژوورەکانی نهۆمی یەکەم و هەموو ئەو دیوانەی نهۆمی زەمینی، کە کە کەوتبوونە لای رووبارەکە، کرابوونە کۆگا، هەر لەبەر ئەوەش بوو، گێژاوێک لە بۆن و بەرامەی تێکەڵ و پێکەڵ خانووەکەی باڵدینی داگیرکردبوو. جا سەبارەت بەوەی باڵدین تەنها باشترین جۆری بۆنەکانی دەکڕی، بەرگەگرتنی کاریگەری ئەو هەموو بۆنە پێکەوە، ئاسان نەبوو، وەک ئەوەی گوێ بگرێت لە ئۆرکێسترایەکی هەزار سەری، کە تێیدا هەر موزیکژەنێک ئاوازێک بژەنێت. بەڵام باڵدین و کرێکارەکانی بەرامبەر ئەو گێژاوە کولببوون، وەک ئامۆژکارێکی موزیکی پیر، کە بە گشتی گوێیان گرانە، ژنەکەی باڵدینش کە لە نهۆمی سێیەمدا دەژیاو و بە سەختی بەربەرەکانێی هەڵکشانی کۆگاکەی دەکرد بەرەو سەرەوە، ئەویش هەستی بەو هەموو بۆنە نەدەکرد وپێیان نارەحەت نەدەبوو. بەڵام کاتێک موشتەرییەک بۆ یەکەم جار دەهاتە فرۆشگاکەی باڵدین، ئەو تێکەڵە بۆنە توند و تیژە، وەک مستەکۆڵەیەک بە دەموچاوی دەکەوت و ئیتر هەر یەکێک بە جۆری خۆی هەڵوێستەی دەکرد، سوور هەڵدەگەڕاو تەنگەتاو دەبوو، یان مات دەبوو، هەر چۆنی بوو، ئەوەندە کاس و گێژ دەبوو، هەر لە بیری دەچوو، کە بۆچی هاتووە. پیاوە جوامێرەکان کە دەهاتنە ژوورەوە، دادەمان، ژنەکانیش وەک نیوە شێتبوونێک، یان وەک ئەوەی زەندەقیان بچێت، هەڵدەچوون و لە هۆشخۆیان دەچوون، ئیتر تەنها بە تیژترین بۆنی رۆنی گوڵە مێخەک و ئەمۆنیاک و سپرای کافوور واگا دەهاتنەوە. ئیتر لە بارودۆخێکی ئاوادا شتێکی سەیر نەبوو کە زەنگە ئێرانیەکانی دەرگای دوکانەکەی جۆزێف باڵدین هەمیشە زۆر کەم دەزرنگایەوەو ماسیگرەکانیش هەمیشە کەم گوڵاویان هەڵدەڕشت.

# ١٠

چەندین سەعات بوو باڵدین وەک ستوونێک وەستا بوو، چاوی بەرامبەر دەرگا لە ئەبڵەق دامابوو، لە ناکاوێک لە پشتی کانتۆڕەکەوە بانگی کرد: "چێنیر! باڕۆکەکەت لەسەر کە!" چێنیریش لە نێوانی تەنەکەکانی ڕۆنی زەیتوون و ڕانەبەرازە هەڵواسراوەکانی بایۆن دەرکەوت، ئەو شاگردەی باڵدین تۆزێک لە خۆی کەمتەمەنتر بوو، بەڵام ئەویش هەر پیاوێکی بەساڵا چوو بوو، چێنیر هاتە پێشەوە بۆ ناو بەشە ڕێکترەکەی فرۆشگا. باڕۆکەکەی لە گیرفانی بەروانکەکەی دەرهێناو خستییە سەری. ئەوجا باڵدین پێی گوت: "من بۆ چەند دەمژمێرێک دەچمە ژووری کارەکەم، هیوادارم بە هیچ جۆرێک ئیزعاج نەکرێم"

"ئەها، تێدەگەم! جەنابتان عەترێکی نوێ سازدەکەن."

باڵدین: بەڵێ! ڕاست دەکەن. بۆ بۆنداركردنی پێستێکی ئیسپانی، بۆ گراف فێرهامۆنت. ئەو داخوازی عەترێکی تەواو نوێ دەکات. ئەو داوای شتێک دەکات وەک... وەک... وا بزانم پێی دەڵێن "ئامۆر و پسوشە"، بەڵێ وەک "ئامۆر و پسوشە"، ئەوەی ئەو داوای دەکات، دەڵێن گوایە هی ئەو کابرایەیە، ناوی چیە، تۆ بڵێ! ئەوەی ئەو شوێنە، ناوی چیە،... ئەو شوێنە... ئا، ئەوەی شەقامی سانت ئۆندرێی ئاخ، هین ناوی چیە... هین...

چێنیر: پلیسیێ.

باڵدین: بەڵێ. پلیسیێ، ڕاستە. ناوی ئەو ... وایە "ئامۆر و پسوشە"ی پلیسیێ، خۆ دەزانی ئەوە چیە؟

چێنیر: بەڵێ بەڵێ، بەدی بەدی. ئێستا پیاو بۆنی ئەمە لە هەموو شوینێک دەکات. لە هەموو جادەو کووچەو کۆڵانێک بۆنی ئەمە دێت. بەڵام ئەگەر لە من دەپرسیت، شتێکی وا نیە! هی ئەوە نیە، بە هیچ شێوەیەک بەراوردی بکەیت لەگەڵ ئەوانەی کە جەنابتان بەرهەمی دێنن، جەنابی باڵدین.

باڵدین: بێگومان نا.

چێنیر: ئەو عەترە، "ئامۆر و پسوشە" بۆنێکی یەگجار ئاسایی لێ دێت.

باڵدین: بۆنێکی عادی؟

چێنیر: تەواو عادی، وەک هەموو هەرامەکانی پلیسیێ. من پێم وایە کە ڕۆنی لیمۆی تێدایە.

باڵدین: بەڕاستیتە؟ چی تریش؟

چێنیر: لەوانەشە ئەرۆمای گوڵەنارنجیشی تێکرابێت. لەوانەشە ڕەنگاوی گوڵبەندی شاخیشی تێکرابێت. بەڵام لەمەیان دڵنیا نیم.

باڵدین: بۆ من ئەو شتە هیچ گرنگیەکی تێدا نیە.

چێنیر: بێ گومان.

باڵدین: بۆ من بە قەد موویێک گرنگ نیە کە پلیسیێ فەندی چی لە ناو عەترەکەی خۆی کردووە. هەر نامەوێ جارێکیش بۆنی بکەم و سەری خۆمی پێ بهێشێنم.

چێنیر: ڕاست دەفەرموون، جەناب.

باڵدین: وەک جەنابتان دەزانن، من هەرگیز سوود لە عەتری تر وەرناگرم، من عەتری خۆم، خۆم سازی دەکەم.

چێنیر: جەناب، دەزانم.

باڵدین: عەترەکانی خۆم، لە من لەدایک دەبن!

چێنیر: دەزانم.

باڵدین: من دەمەوێت، شتێک بۆ گراف فێرهامۆنت بئافرێنم، کە بەڕاستی مرۆڤ مەست بکات.

چێنیر: من باوەڕی تەواوم بەوە هەیە، جەنابی باڵدین.

باڵدین: تۆ سەرپەرشتی دوکانەکە دەکەیت. من ئارامیم گەرەکە. هەموو شتێکم لە یەقە بکەرەوە، چێنیر...

ئیتر باڵدین چیتر وەک ستوون نەمایەوە، لە شوێنی خۆی خزیی، وەک چۆن پیرێک دەجووڵێتەوە ئاوا، تەواو وەک ئەوەی دارکارییان کردبێت، بە هێواشی بەسەر پلیکانەکە بەروە نهۆمی یەکەم چوو، بۆ ژووری کارکردنی.

چێنیر چووە پشتی کانتۆرەکە، بۆ شوێنەکەی ئەو. بە تەواوی وەکو وەستاکەی لەوێ وەستا، بە چاوی ئەبڵەق ڕامایە دەرگا. ئەو دەیزانی لە چەند دەمژمێری داهاتوو چی ڕوودەدات: دەیزانی هیچ شتێک لە ناو دوکانەکە ڕوونادات، بەڵام لەسەرەوە، لە ژووی کاری باڵدین، وەک هەمیشە دەقەومێ. ئەوسا باڵدین بەروانکە شینەکەی کە وەک جل بە گوڵاو تەڕ دەبێت، لەبەردەکاتەوە، لەسەر مێزی نووسینەکەی دادەنیشێت و چاوەڕوانی ئیلهامێک دەکات، ئەو ئیلهامەشی بۆ نایێت. بە پەلە بەسەر تاقچەکان هەڵدەگەڕێت، کە سەدان کەموولەی ئەزمایشکردنیان بەسەرەوەیە، بێ

هیوا، شەلم کوێرم، شتەکان تێکەڵێ یەکتری دەکات. تێکەڵەیەکی ناسەرکەوتوو. ئینجا جنێو دەدات، نەفرەت دەکات، پەنجەرە دەکاتەوەو بە هەمو هێزی خۆی تێکەڵەکە بۆ خوارەوە، بۆ ناو رووبارەکە تووڕ هەڵدەدات. ئەوجا شتێکی تر تاقی دەکاتەوە، لەمەشیان سەرناکەوێت، ئەمجارە دەنەڕێنێ و پەلدەکوتێ، لە ژوورەکەی کە بۆنی بەنجی لێ دێت، تووشی خووی هاوار و نەڕاندن دەبێت. لە دەمژمێر حەوتی ئێوارە، بە مەلوولی دێتە خوارەوە. بە لەرز و بە گریە دەڵێت: "چێنیر، ئیتر من لووتم نیە، چیتر ناتوانم عەتر بهێنمە ئەو دنیایە، من ناتونم پێستی ئیسپانی بۆ گراف بنێرم، من تێ چووم، دۆڕام، من لە ناوەوە مردووم، من دەمەوێ بمرم، تکات لێ دەکەم چێنیر، بە هانام وەرە، یارمەتیم بدە با بمرم!" چێنیریش پێشنیاری ئەوەی بۆ دەکات، کە کەسیک بنێرێتە لای پلیسیێ، بۆ ئەوەی شووشەیەک عەتری "ئامۆر و پسوشە"ی بۆ بنێرێت، باڵدین پێشنیارەکەی قەبوڵ دەکات، بەڵام بە مەرجێک، هیچ کەسێک بەم ئابڕووچوونە نەزانێت، چێنیر سوێندی بۆ دەخوات، ئەوجا، شەوێ، بە نهێنی پێستە ئیسپانییەکە بۆ گراف فێرهامۆنت بەو عەترە بیانییە بۆندار دەکات. ئەوە روودەدات و شتێکی تر ناقەومێ. بەڵام چێنێر هیوای ئەوەی دەخواست ئەو شانۆگەرییە زوو رووبدات و ببڕێتەوە. چیتر باڵدین عەترسازیکی گەورە نەبوو. بەڵێ کاتێ خۆی، لەسەردەمی لاوی، کە تەمەنی ئەوسا سی، چل ساڵێک دەبوو، ئەو بوو کە عەتری "سۆرگوڵی باشوور"ی ئافراند و هەروەهاش "چەپکەگوڵی باڵدین"، ئەوانەش مۆدەیان بە تەواوی نەمابوو، نەدەفرۆشران، ساڵێک دواتر پتر دە بەقەد خۆیان رۆنتر کرابوونەوەو لە جیاتی ئاو لە حەوزی کافوورەکان بەکاردەهێنران. حەیف بۆ ئەو، چێنیر بیری کردەوەو تەماشاییێکی ئاوێنەی کرد، تا بزانێت بارۆکەکەی رێک لەسەر کردووە، ئەفسوس بۆ پیرە باڵدین، بە داخەوە بۆ بازرگانییە جوانەکەی، ئەمە دەیهێنێتە خوارەوە، بە داخەوەش بۆ من، چونکە تا ئەویش دادەبەزێنرێت، من زۆر پیر دەبم و کەڵکی هەڵگتنەوەی دوکانەکەم نامینێت...

## ١١

جا بە راستی جۆزێف باڵدین بەروانکە بۆندارەکەی خۆی داکەند، بەڵام تەنها وەک خوویێک کە لێی ڕاهاتبوو. دەنا لە مێژ بوو ئەو بە بۆنی گوڵاو چیتر بێزار نەدەبوو، دەیەها ساڵ بوو ئەو بەروانکە گوڵاوایەی لەبەر دەکرد، هێندە لێ ڕاهاتبوو، چیتر هەستی بە بۆنەکانی نەدەکرد. دەرگاکانی ژووری کارەکەکەشی داخست و بە هێمنی کەوتە بیرکردنەوە، بەڵام نەچوو لەسەر مێزەکە دابنیشێت و خەیاڵپلاوانە چاوەڕوانی ئیلهامێک بکات، ئەو زۆر باشتر لە چێنیر دەیزانی، کە هیچ ئیلهامێکی بۆ نایێت، چونکە لە رابردووش چ جاران ئیلهامی بۆ نەهاتبوو. راستە ئەو پیر ببوو، لە کەڵک کەوتبوو، ئەوەش راست بوو، کە چیتر ئەو عەترسازێکی مەزن نەبوو، بەڵام ئەوەشی دەزانی، کە ئەو هەرگیز لە ژیانیدا عەترسازێکی مەزن نەبووە. عەتری "سۆرگوڵی باشوور"ی بە میرات لە باوکیەوە بۆ مابووەوە، ڕەچێتەی "چەپکەگوڵی باڵدین"شی لە بازرگانێکی گەڕۆکی بەهاراتفرۆش، کڕیبوو، کە خەڵکی گێنوا بوو. عەترەکانی تریشی بریتی بوون لە تێکەڵە باوە کۆنەکان. ئەو هەرگیز شتێکی لە ژیانی خۆیدا دانەهێنابوو، بەڵام بەهرەی ئەوەی هەبوو، کە زۆر بە دیققەت و پوختەیی، بۆنە هەبووەکان هەڵبهێنجێ و لە شووشەدا بیانپارێزێت، وەک ئاشبەزچییێک بوو، کە بە کارە رۆتینییەکانی ئاشبەزخانەو بە رەچیتەی باش، ئاشبەزخانەیەکی مەزن بەڕێوەببات، بەڵام هەرگیز چێشتێکی تایبەت بە خۆی دانەهێنابێت. ئەو بەزم و رەزمی ئەزمایشگاو، تاقیکردنەوەو، سروش و ئیلهامبازی و نهێنیکارییەش کە خۆی پێ ئالۆز دەکرد، لەبەر ئەوە بوو، چونکە ئەمە مەرجێکی پێویست بوو بۆ پیشەی "عەترساز و پەنجەوانەدروو"یی. عەترساز، خۆی بۆ خۆی نیوە ئالشیمیستێکە، وەک ئەوانەی لە سەردەمی کۆندا، لە لابۆرەکانیان دەیانویست ئاوی حەیات سازبکەن و مەعدەن بکەن بە زێڕ، عەترسازیش ئاوا پەڕجوو دەئافرێنێت. ئەوە چاوەڕوانی خەڵک بوو لێیان! کە ئاوا باش بان! باڵدین هەر خۆی دەیزانی، کە پیشەکەی ئەویش، پیشەیەکە وەک هەموو پیشەکانی تر، تاکە شتێکیش کە شانازی پێوەدەکرد، هەر ئەو زانینەی بوو. ئەو هەرگیز نەیدەویست ببێتە کەسێکی داهێنەر. داهێنان لای ئەو شتێکی گومانلێکراو بوو، چونکە هەمیشە ماناى داهێنان بریتییە لە شکاندنی رێساکان، دەرچوون لە نەرێتەکان. ئەو هەر بیریشی

لەوە نەکردبووەوە، کە عەترێکی نوێ بۆ گراف فێرهامۆنت دابهێنێت. نەشی دەهێشت ئێوارێ چێنیر لەبەری بخوێنێت، بۆ ئەوەی بچێت شووشەیەک عەتری "ئامۆر و پسوشە"ی پلیسییێ بۆ پەیدابکات. چونکە پێشتر ئەو عەترەی لا هەبوو. لەسەر مێزی نووسینەکەی دانرابوو، لەبەردەم پەنجەرە، لە شووشەیەکی دەمەوان لووس. چەند رۆژێک پێشتر کڕیبووی. بێگومان بەخۆی نەیکڕیبوو. خۆ نەدەبوو ئەو بەخۆی بچێتە لای پلیسییێ، بۆ ئەوەی عەترێکی لێ بکڕێت! بەهۆی کەسێک، ئەو کارەی کردبوو، کەسەکەش بەهۆی کەسێکی تر، دەبووایە ئەو کارە  بە نهێنی و بەو ئاگاییە بە ئەنجام بگەیەنێت، ئەوە شتێکی پێویست بوو. بەڵام نەیدەویست هەروا بە ئاسانی ئەو شووشە عەترە لە بۆندارکردنی پێستە ئیسپانییەکە خەرج بکات، ئەو قیچە عەترە هەر بەشی ئەوەشی نەدەکرد، شتێکی خراپتری لە ئەندێشەدا بوو: ئەو دەیویست ئەو عەترە کۆپی بکات.

ئەوەش ئەوسا قەدەغە نەبوو. بەڵام شتێکی بێ ڕادە کرێت و کەم بوو. بچیت بە دزی لاسایی عەتری عەترسازێکی پێشبڕکێکارت بکەیتەوەو، پاشان بەناوی خۆت بیفرۆشیتەوە، ئەمە کارێکی شەرم و ئابڕوتکێن بوو. لەوەش نەنگتر ئەوە بوو، ئەوەت لێ ئاشکرا ببێت، بۆیەشە قەت نەدەبووایە چێنیر هیچ لەم بارە بزانێت، چونکە چێنیر کەسێکی زۆربڵێ بوو، هیچ شتێکی لە زمان ڕانەدەوستا.

ئاخ، کارێکی چەند خراپە، پیاو خۆی دانەری یاسا بێت و، ناچاریش بێت، ڕێگاییێکی ئاوا چەوت بگرێتە بەر! چەند خراپە، ئەو شتە پڕ نرخەی کە هەیەتی، ڕوومەتی خۆی، نامووسی خۆی، ئاوا پیس و لەکەدار بکات! بەڵام دەبووایە ئەو چی کردبایە؟ هەرنەبێ موشتەرییەکەی گراف فێرهامۆنتە، بە هیچ شێوەیەک ڕێی تێ ناچێت ئەو دۆڕاو بێت. خۆی موشتەری نەماوە، زۆر کەم موشتەری ڕووی تێ دەکات. ئەو دەبووایە بازاڕی فرۆشگاکەی وەک سەرەتای ساڵەکانی بیست گەرم بکاتەوە، وەک سەرەتای بەزربوونەوەی لە کارەکەیدا، ئەو کاتەی کە بە دەستگێڕی و سووڕانەوە بە جادەکاندا دەستی پێ کرد. هەر خوا دەزانێت، کێ ناڵێت جۆزیف باڵدین، خاوەنی گەورەترین عەترخانەی پاریس، لە باشترین شوێنی بازاڕی پاریس، لە ڕووی داراییەوە ناکەوێتە سەر رینگ و، ناچارنابێت، دیسان زەمبیل هەڵبگرێت، دەستتگێڕ بە ماڵاندا بسووڕێتەوە. ئەوەی قەت پێ خۆش نەبوو، ئەو تەمەنی شەست ساڵی بڕیوە، جا بەو پیرییە بچێتە ژووری ساردی پێش فرۆشگاکان، یان لە ژێر چەتری دووکانەکاندا چاوەڕوان بکات، بۆ ئەوەی هەزاران گوڵاو و ئاوی گیاکەڵان پێشانی خەڵک بدات، یان بە هەتوانی دژەژانەسەردا هەڵبڵێت. سەرەڕای ئەوەش لەو شوێنانە پێشبڕکێکردنێکی زۆر قێزەوەن لە ئارادایە.  لەو شوێنانە بوو، ئەو نەدیدکەیە، برۆوێ، ئەوەی شەقامی دۆ فینە، خۆی بەوە هەڵدەکێشا، گوایە خاوەنی گەورەترین بەرنامەی کرێمە لە ئەورووپا، یان کالتۆ، ئەوەی شەقامی

موکونستێی، گوایە یەکێک بووە لەوانەی، کە بەرهەمەکانی خۆی ناردووە بۆ کۆشکی ئەمیرەی ئەرتێزیا، یان ئەو کابرا ناجینسە، ئەنتۆن پلیسیێ، ئەوەی سەر شەقامی سانت ئۆندرێی ئاخ، ئەوەی کە لە هەر کەژێک بۆنێکی نوێی دەخستە بازاڕو هەموو دونیا بۆی شێت دەبوو.

پلیسییێکی ئاوها دەیتوانی تەواوی بازاڕ بشڵەژێنێت. ساڵێکیان مۆدە مۆدەی "ئاوی هەنگاری" بوو، باڵدین بۆ ئەوەی موشتەریەکانی رازی بکات، ئەو ساڵە، ئەمەی بە ئاوی لالەو لیمۆ و رووەکی شەونمەی دەریا بە ڕێ کرد، ئەوجارە پلیسیێی عەتری "هەوای میسک"ی خستە بازاڕ، کە بۆنێکی زۆر تیژی میسکیی بوو، ئیتر لە ناکاوێک هەموو کەسێک بە ناچاری دەبووایە بۆنی ئاژەڵ هەڵبمژێت، باڵدینش توانی شەونمەدەریاکەی خۆی بکاتە ئاوی قژ و، لالەکانیش بکاتە کیسەبۆن. لە بەرامبەر ئەمەدا پلیسیێ بۆ ساڵی ئایندە بڕێکی گونجاو لە میسکی پشیلە و جێلی سەگلاوی راسپارد و هاتە خەیاڵی، عەترێکی بە ناوی "گوڵەکانی دارستان" هێنا بەرهەم، دەستبەجێ ئەوەی بۆ بوو بە سەرکەوتنێکی تر. باڵدینش دوای هەوڵێکی درێژخایەن، یاخود دوای دانی بەرتیلێکی زۆر، ئەوجا توانی بزانێت، کە "گوڵەکانی دارستان" لە چی پێکهاتووە، بەڵام تا ئەو حەلە، پلیسیێ بە عەتری "شەوی تورکی" یان "بەرامەی لیسابۆن" یان "چەپکە گوڵی دێلا کۆر" یان هەر شەیتان بە خۆی دەزانێت بە چی تر، ئاهەنگی دەگێڕا. هەرچۆن بوو، ئەو پیاوە، بە بەهرەی جلەونەگیری خۆی لە داهێناندا، ببوو بە مەترسییێک بۆ تەواوی پیشەگەر و عەترسازەکان. خەڵک خۆزگەی بە سەپاندنەوەی یاسا کۆنەکان دەخواست، یاسای پیشەگەران، هەروەها یاساکانی دراکۆنی، ئەوانەی سنووریان بۆ پیشەگەران دانابوو، لە دژی ئەم کابرا مەرز بەزاندووە، لە دژی ئەو قەیرانکارەی بازاڕی عەتر. ئەوسا مۆڵەتی کاریان لێ دەسەندەوە، کارەکەیان لێ قەدەغە دەکرد...، ئەسڵەن دەبووایە جارێ بچێتە خولی فێربوون! چونکە ئەو کابرایە، ئەو پلیسیێە هیچ وانەیەکی فێربوونی لە بواری عەترسازی و پەنجەوانەدروویی نەخوێندبوو، باوکی لە سرکەسازێک پتر شتێکی تر نەبوو، خۆشی هەر سرکەکوڵێن بوو، شتێکی تر نەبوو. تەنها لەبەر ئەوەی وەک سرکەکوڵێنێک مافی ئەوەی هەبوو، دەست لە ئەرەق و ئەلکهول بدات، توانی بە دزییەوە خۆی بخزێتە ناو مەیدانی عەترسازی و وەک ئاژەڵێک تیایدا بگەوزێ. ئاخر کەی و لە چ دەورانێک ئەمە بووە، کێ لە هەر کەژێکی نوێ، پێویستی بە عەترێکی نوێ هەیە؟ ئایا ئەمە پێوست بوو؟ خەڵک جاران بە ئاوی وەنەوشەو بە چەپکە گوڵێکی سادە زۆر خۆشحاڵ دەبوون، لەوانە بوو، لە هەر دەساڵ جارێک کەمێک گۆڕانکاری تێدا کرابا. هەزاران ساڵ مرۆڤ بە بخوور و مایرە، بە چەند دانە پۆدرەو کرێم و هەتوانێک، بە رۆن و وشکەبەهارات، ئاسوودەو رازی بوون. کاتێکیش شارەزای دەزگای دڵۆپاندن

بوون، به دڵۆپاندنی ئاوی گیاکەڵەو گوڵ و داروچکە، رۆنی ئێتیری بۆنداریان لێ داچۆڕاندن، بە گوشەری داری بەڕوو، تۆ و ناوک و توێکڵی بەرەکانیان دەگوشی و دەیان توڵاندنەوە، یان زۆر بە ئاگاییەوە بە زەیتی پالێوراو، شیریان لە پەڵکی گوڵان دەگرت، ئەوسا ژمارەی جۆری عەترەکان بە پەنجەی دەست دەژمێردران، کەسێکی وەک پلیسیێ، هەر جێگەی نەدەبووەوە، چونکە ئەوسا بەرهەمهێنانی کرێمێکی سادە، بەهرەی گەرەک بوو، ئەو بەهرەیەی کە ئەو سرکەچیە لە خەویشدا نەیدەدیت. هەر ئەوە نەبوو، هەڵماندن و دڵۆپاندن بزانیت و بەس، پێویست بوو بزانیت هەتوان بگریتەوەو دەرمانسازیش بیت، دەبووایە لە یەککاتدا، شیمیازان و پیشەگەر و بازرگان و مرۆناس و باخچەوان بیت. دەبوایە توانای ئەوەت هەبووایە چەوری گورجیلەی بەران و بەزی مانگا، وەنەوشەی ڤێکتۆریاو هی پارما، لێکتر جودا بکەیتەوە. دەبوایە زمانی لاتینی باش بزانیت. پیاو دەبووایە بزانێت، کەنگینێ گوڵی هێلیۆترۆپ دەچنرێت، کەی گوڵی پێلارگۆنیوم پێدەگات، بشزانێت کە رۆژئاوابوو، گوڵی یاسەمین عەتری خۆی لەدەست دەدات. پلیسیێ بە قسەی خۆی هیچ سەرەدەری لەو شتانە دەرنەدەکرد. وابزانم قەت پاریسی بەجێنەهێشتبوو، هەرگیز لە ژیانیدا گوڵی گەشاوەی یاسەمینی نەدیبوو. باسی ئەوەش هەر مەکە، کە تەنها خاوەنی زەرەیەک ئەو کار و توانا زۆر و زەوەندەبوو، کە پیاو پێویستیەتی بۆ ئەوەی بتوانیت لە سەدان هەزار گوڵەیاسەمین، تەنها چۆڕێکی زۆر کەم لە شیری ئەو گوڵە، یان چەند دڵۆپێک لە پاراوی عەترەکەی دابچۆڕیت. لەوانەیە بتوانێت تەنها ئەمە بکات، لەوانەیە بتوانێت تەنها یاسەمین وەک شلەیەکی زۆر چڕ لە ناو شووشۆکەکەی بناسێتەوە، کە رەنگێکی قاوەیی تێری هەیەو لەتەنیشت شووشەکانی تری ناو دۆڵابەکەی دانراوە، ئەو شووشانەی کە پڕن و، بە تێکەڵاوکردنیان ئەو مۆدێلە عەترانەی لێ سازدەکردن. نەخێر، کەسێکی لمووزبەرزی وەک پلیسیێ نەیدەتوانی لە سەردەمەکۆنەکانی پیشەگەری دەستیی، قاچ بخاتە سەر ئەرز. هیچ جۆرە توانایێکی ئاوای تێدا نەبوو: لە ڕووی کەسایەتییەوە، لە ڕووی پەروەردەو فێربوونەوە، لە ڕووی دەستپێوەگرتن، لە ڕووی سادەییەوە، لە ڕووی هەستکردن بە بەرپرسیارییەتیەکانی پێشەگەری و خۆبەستنەوە بە مەرجەکانی. تاکە سەرکەوتنی لە بواری عەترسازی دەگەڕایەوە بۆ ئەو نهێنییە کە دوو سەت ساڵ لەمەوبەر لە لایەن بلیمەتی ئیتالیایی ماوری فرانگیپانی، دۆزرایەوە! نهێنی تواندنەوەی ماددەی عەتری لە رۆحی شەراب. فرانگیپانی پۆدرەبۆنەکەی خۆی لەگەڵ کحول تێکەڵ کردو، بەمەش بۆن وبەرامەکەی گۆڕی بۆ عەترێک لە باری شلە، کە بۆن و بەرامە لەخۆگرتووەکەی پەخش دەکرد.

بەمەش توانی بۆن لە مادده رزگار بکات، بۆنی کرده خەیاڵ، بۆنی کرده بۆنێکی پاراو، بە کورتی: عەتری ئافراند. ئەمە چ کارێک بوو کردی! چ داهێنانێکی گەورەی سەردەمی خۆی بوو! لە راستیدا ئەوە تەنها لەگەڵ بەرهەمە مەزنەکانی ڕەگەزی مرۆڤ بەراورد دەکرێت، وەک دۆزینەوەی نووسین لە لایەن ئاشووریەکان، ئەندازەی ئۆیکلیدی، فیکرەکانی ئەفلاتون، هەوەها گوڕینی ترێ بۆ شەراب لەلایەن یۆنانییەکان. بەڕاستی کارێکی مەزن بوو!بەڵام ئەمەش وەک هەر بەرهەمێکی تری مەزنی بیری مرۆڤ،  هەر تەنها رۆناکی بەخش نەبوو، بەڵکو سێبەرێکی تاریکیشی هەبوو، لەگەڵ خۆشی و چاکەکانی، بێ هیوایی و چەرمەسەریشی هێنا بۆ مرۆڤایەتی. بە داخەوە ئەو دۆزینەوە مەزنەی فرانگیپانیش هەر ئاوا بوو: چونکە مرۆڤی فێرکرد، رۆحی گوڵ و گیاکەڵەکان، رۆحی دار و چەسپەکان، هی دەرهاویشتەی جەستەی گیاندارەکان، لە ناو ڕەنگاودا دەستبەسەر و بەرزەفت بکات و شووشەیان پێ پڕکات، بەو جۆرە، هێدی هێدی هونەری عەترسازی خزایە دەستی هەندێک لە پیشەگەرانی جیهان و هەندێک لە هەتوانسازان، دەرگای والآ کرایەوە، ئیتر هەرچی لووتێکی کەمێک بۆنکەری هەبوو خۆی لێمان کرد بە عەترساز، هەر بۆ نموونە، یەکێکی وەک ئەو دەڵەکە بۆگەنە، پلیسیێ. بێ ئەوەی بزانێت چۆن چۆنی ئەو ناواخنە گرنگەی ناو شووشەکانی، جارێک لە جاران هاتوونەتە ئارا، کەوتۆتە دوای زەوقی بۆنەکانی خۆی و بە ئارەزووی خۆی تێکەڵ و پێکەڵیان دەکات، جا چۆنی بە خەیاڵ داهات، یان بە پێی ئارەزووی خەڵک.بێ گومان ئەو دڕندەیە، پلیسیێ، ئێستا بە خۆو بەو تەمەنی سی و پێنج ساڵییەوە بووە بە خاوەنی سامان و داراییەکی زۆرتر لەوەی باڵدین هەیەتی، لەو سامانەی کە ئەو بە سێ نەوەو بە رەنجێکی زۆر کۆیکردۆتەوە. سامانەکەی پلیسیێ رۆژ لە دوای رۆژ پتر دەبێت، کەچی هی باڵدین لە کەمی دەدات.  لە سەردەمی کۆن، شتی ئاوها نەدەکراو نەدەبوو! پیشەگەرێکی دیار و بازرگانێکی ماقووڵ، بوونی بکەوێتە بەرمەترسی و بۆ بوونی خۆی بجەنگێت، ئەوە تەنها لە چەند دەیەیەکی دوایی شتی وا دەبێت! لەو کاتەوە کە لە هەموو لایێکەوەو لە هەموو مەیدانێکەوە، خووی نوێکردنەوە بڵاوبووەتەوە، ئەو هەڵپەکارییە بێ بەربەستە،  ئەو هاربوونی تاقیکارییە، ئەو زلخوازییەی کە لە بازرگانی و هۆیەکانی هاتوچۆو هەروەها لە زانست هاتۆتە پێشەوە.

یان شێتی خێرایی! ئاخر ئەو هەموو جادە بۆ چیە، کە بە هەموو لادا بڵاوبوونەتەوە، یان ئەو هەموو پردە؟ بۆچی؟ باشتر نەبوو کە تا دەگەیشتی بە لیۆن هەفتەیەکت پێ دەویست؟ لە بەرژەوەندی کێ دابوو، یان سوودی کێی هەبوو، بەسەر دەریای ئەتلەسدا بڕۆیت و بە مانگێک بگەیتە ئەمەریکا؟ وەک ئەوەی ئەو هەموو ساڵەهای ساڵە، بێ بوونی ئەو کیشوەرە هەڵیان نەکردبێت. ئەو

مرۆڤە خاوەن شارستانییە چی لێ گوم بووە لە دارستانەکانی هیندستان یان لە نێجیریا؟ تەنانەت خۆ دەگەیەننە لێپلاندیش، لە باکوور، لەو شەختەستانە بێ کۆتاییە، لەو شوێنانەی دڕندەکان زیندەگی دەکەن، ماسی خاو هەڵدەلووشن. دەیانەوێ هێشتان کیشوەرێکی تریش بدۆزنەوە، گوایە دەکەوێتە ناو دەریای خواروو، یان لە هەر شوێنێکی تر. ئەو شێتاتییە بۆچی؟ هەر چونکە خەڵکی تر وای کردووە؟ ئسپانییەکان، ئینگلیزە نەفرەتلێکراوەکان، هۆڵەندییە ناکەسبەچەکان، ئایا پێویستە بکەویە رکابەری لەگەڵ ئەوانە، لە شتێکد کە لەبارت دا نیە. کەشتییێکی جەنگی ئاوا ۳۰۰۰۰۰ لیڤرەی تێ دەچێت، باشە ئەوە چاکە، بەڵام لە پێنج دقیقەدا بە تۆپێک نقوومی دەریا دەبێت و تێ دەچێت و هەرگیز نایبینیتەوە، هەمووشی بە پارەباجی ئێمە دەکرێت. چونکە بەم دواییە جەنابی وەزیری دارایی، داخوازی دەیەکی هەموو دەستکەوتەکان دەکات، خۆ ئەگەر ئەو بەش نەدەیت، هەر وێران بووە، ئاکاری خەڵکەکە هەمووی بووە بە تاوانکاری. بەدبەختی مرۆڤ لەمە دایە، هەروەک پاسکال دەڵێت، کە نایەوێت لەماڵەکەی خۆی، لەو شوێنەی کە لێی هاتووە، سەقامگیر بێت. بەڵام پاسکاڵ مرۆڤێکی مەزن بوو، گوڵاوی ئەقل بوو، لە راستیدا مافی پیشەگەرەکان بوو، ئێستا کەس لە پیاوی وا ناپرسێتەوە. ئێستا ئەوان کتێبی هوگنۆتەکان و ئینگلیزەکان دەخوێننەوە. یان خەریکی نووسینی ئەو بابەتانەن، کە گوایە شاکاری زانستین، کە تێیاندا هەموو شتێک دەخەنە ژێر پرسیار، ئیدی چیتر ناگوزەرێ، هەموو شتێک لە ناکاوێکدا گۆڕاوە. گوایە دەڵێن لەم دواییە لە پەرداخێک ئاودا، دیویانە جانەوەری زۆر بچووک مەلە دەکەن، کە پێشتر کەس نەیدیون، بانگاشەی ئەوە دەکەن، کە گوایە لەمەودوا فەرەنگی، نەخۆشییەکی ئاساییەو چیتر سزای خودا نیە بۆ مرۆڤ، گوایە خوداش جیهانی بە حەوت رۆژ دروست نەکردووەو چەندین ملیۆن ساڵی پێچووە، تا دنیا دروست بووە، خۆ ئەگەر وا بێت، ئەوا دڕندەکانیش وەک ئێمەی مرۆڤن، ئێمە منداڵەکانمان بە هەڵە بەخێودەکەین، چیتریش زەوی خڕ نیەو بەڵکو ئەملا ئەولای وەک شووتی پانە، وەک ئەوەی وای لێ هاتبێت، لە هەموو بابەتێک بپێچڕێتەوە و بکۆڵدرێتەوەو بۆنبکرێت و ئەزمایش بکرێت. ئەوەندە بەس نیە، کە بگوترێت، فلانە شت چیەو چبووە، بەڵکو دەبێت ئێستا بسەلمێنرێت، بە باشترین شێوە، بە ئامێر و بە ژمارە، یان بە تاقیکردنەوەیەکی گاڵتەجاڕ. ئەو دیترۆت و دی ئالێمبێرت و ڤۆلتێر و رۆسۆیە، کە بە نووسەرۆکەیان ناودەبەن، ئەو جەنابی خاوەنبیرانە، ئیتر خان و شازادەی ئەو سەردەمەن! بەڕاستی ئەوانە بۆیان چووە سەر و خۆیان سەپاند، ئاینی فێڵاوی خۆیان، هەوەسی نائاسوودەیی خۆیان، هەروەها هەموو ئەو شتانەی ئەوان لەو دنیایە چاویان لێ تێر نەدەبوو، بە کورتی: بڵاوکردنەوەی ئەو ئاژاوە بێ کۆتاییەی، کە لەسەریاندا خول دەخواتەوە، بە

ناو هەموو کۆمەڵگادا!تەمەشای هەر جێگەیەک دەکەیت، تەنگەتاویە، خەڵک کتێب دەخوێننەوە، تەنانەت ژنانیش. قەشەکان لە قاوەخانەکان لەسەرچیچکان دانیشتوون. کاتێکیش پۆلیس هێرشیان بباتە سەر و یەکێک لە سەرکردەکانیان بخاتە بەندیخانە، ئەوجا لایەنگرانیان دەست دەکەن بە هاوار و شکاتکاری دەکەن و خان و خانمانی گەورە دەکەونە کار، تا دوای چەند هەفتەیەک ئازادیان دەکەن، یان رەوانەی دەرەوە دەکرێن، بۆ ئەو شوێنانەی تێیاندا بە ئازادی خۆیان ئاژاوەدەگێڕن. لە دیوەخانەکان باس باسی ئەستێرەناسی و لێکۆلینەوەی زانستییە، باسی باسکی هێز و نیوتنە باسی ئاواکردنی کەناڵ و سووڕی خوێن و تیرەی گۆی زەویە.پاشا بە پاشایەتی خۆی رێگەی ئەوەی داوە، یەکێک لەو تاقیکردنەوە باوانەی لە پێشدا بکەن، جۆرێک لە بروسکەی دەستکرد، ئەوەی پێی دەلێن عەلەتریک: لە بەرچاوی هەموو دانیشتوانی کۆشکی پاشا، مرۆڤێک شتێکی لە شووشەیەک خشاندووە، پروشکی ئاگری فڕی داوە، خەڵک دەڵێن جەنابی پاشا سەری سوڕماوە. باوەڕناکرێت، باوکێکی ئاوا گەورە، لودڤیکی بەڕاستی مەزن، ئەوەی کە چەندین ساڵە باڵدین لە ژێر سایەیدا بە بەختەوەری ژیاوە، رێگەی ئەوەی دابێت ئەو گالتەجاڕیەی لەبەرچاودا بکەن. بەڵام ئەوە بیری سەردەمی نوێیە، هەموو شتێک بە خراپی کۆتایی دێت!چونکە کاتێک کەسێک لافی بلیمەتی لێ بدات و بە ناماقووڵترین شێوە گومان لە توانای خودای کڵێسا بکات، کاتێک کەسێک لەسەر ئەو پاشایەتییە کە ویستی خودایەو شتێکی کەم نیە، یان لەسەر کەسایەتی پیرۆزی پاشا قسە نەکات، وەک ئەوەی دوو پۆستی سادەی ناو کەتەلۆگی فۆڕمەکانی حوکمەت بن و هەڵبژێردرابن، ئەگەر هەر ئاوا مرۆڤ بەرزەفڕی بکات، وەک ڕوویداوە، خودی خودا ، کە لە هەموو کەسێک و لە هەموو شتێک بە تواناترە، خودی خودا خۆی فەرامۆش بکرێت و بێ سوود لە قەڵەم بدرێت، بانگاشەی هەموو شتێکی جیددی بکەن، بە بێ خودا، بیر لە رێساکان، لە رەوشت و نەریتەکان و بەختەوەری سەرزەمین بکەنەوە، تەنهاو تەنها بە چاوی ئەخلاق و ئەقلی مرۆڤ، ئۆە خودایە... ئۆە خودایە! . ئەگەر وابێت ئەوە هیچ سەیر نیە، هەموو شتێک سەرەوژێر بێت، نەرێتەکان لەناوبچن، مرۆڤایەتیش خۆی بکات بە خاوەنی رۆژی قیامەت، دادگای سزا، ئەوەی ئەوان نکۆڵی لێ دەکەن. دنیاکە زۆر بە خراپی کۆتایی دێت. ئەستێرە داڕژاوەکەی ساڵی ١٦٨١، ئەوەی ئەوان گاڵتەیان پێ دەکرد، دەیانگوت هیچ نیە تەنها ئەستێرەیەکەو هیچی تر، ئەوە نیشانەیەکی بەرایی بوو لەلای خواوە، ئێستا بێ گومان دەبێت تێی بگەن، ئەوە نیشانەی ئاوابوونی سەدەیەک بوو، نیشانەی هاتنی ئەو زەلکاوەی فیکر و سیاسەت و ئاینە بوو، ئەوەی ئەوان بەخۆیان تێیدا نغرۆ بوون و تێ چوون، تەنها گوڵەزەلکاوێکی بریقەدار و

بۆگەنی وەک پلیسییێی تێدا ڕووا!لە دیار پەنجەرەکە ڕاوەستا بوو، باڵدین، ئەو پیاوە پیرە، بە چاوێکی تووڕەوە تەماشای ڕۆژی دەکرد، ڕۆژەکە  لەم دیوی ڕووبارەکە بەلاری وەستا بوو. لە ژێرەوە کەشتیە بارهەڵگرەکان بە هێواشی لەسەر ڕووبارەکە دەخزین، بەرەو ڕۆژئاوا بەرەو پۆنت نۆیف و بەرەو بەندەرەکەی بەردەم گەلەری لۆڤەر دوچوون، لەو شوێنەدا هیچیان پێچەوانەی شەپۆلی ڕووبارەکە نەدەجووڵان، بەڵکو قۆڵەکەی تری ئەوبەری دورگەکەیان دەگرت. لێرە هەموو کەشتییەکان لەگەڵ ئاراستەی ڕووبارەکە دەڕۆیشتن، کەشتی خاڵی، کەشتی بارکراو، هەروەاش بەلەمی سەوڵدار و کەشتییە تەختەکانی ماسیگران، ئاوی قاوەیی چڵکن و ئاوی کەف زێڕین، هەموو دەڕۆیشتن، هێدی هێدی، بە بەرینی و بێ وچان. کاتێک باڵدین بە لاری تەماشای خوارەوەی دەکرد، بە درێژایی دیواری خانووەکە، وا دەهاتە بەرچاو کە تەوژمی ئاوەکە بناغەی پردەکە لەگەڵ خۆی دەبات، باڵدین تووشی سەرەسووڕە بوو. ئەوە هەڵەیەک بوو، کە خانووی سەر پردەکەی کڕیبوو، ئەوەش دوو هەڵە بوو کە بەری ڕۆژئاوای هەڵبژاردبوو. ئیتر هەمیشە ئەو ڕووبارە بە تەوژمەی لەبەر چاوان بوو، لای ئەو وەک ئەوە وا بوو، کە خۆی و خانووەکەی هەموو ئەو سامانەی کە لەچەندین ساڵدا بەدەستی هێناوە، وەک تەوژمی ڕووبارەکە دەڕوات، وای دەهاتە بەرچاو، کە ئەو زۆر پیر و کەنەفت بووەو ناتوانێت خۆی بەرامبەر تەوژمی بەهێزی ئاوەکە رابگرێت. ئەگەر هەندێ جار کارێکی لەبەری چەپی ڕووبارەکە هەبووایە، لە گەڕەکی سۆربۆن، یان لە سانت سولپیس، ئەوا بەسەر دورگەکەو  پردی سانت میشێلدا نەدەچووە ئەو بەر، بەڵکو ڕێگە درێژەکەی دەگرتە بەر، بەسەر پۆنت نۆیف، چونکە ئەو پردە هیچی لەسەر دروست نەکرابوو، دەیتوانی لەسەرەوە تەماشای ڕووبارەکە بکات، هەر نەبێت بۆ جارێک دەیدیت کە هەموو تەوژمەکانی ڕووبارەکە بەرەو ئەو دێن، چەند چرکەیەک دەکەوتە خەیاڵی ئەوەی، کە ئاراستەکانی ژیانی وەرسووڕاونەتەوە، بازاڕی گەرم بۆتەوە، خێزانی گەشاوەتەوە، ژنان بەرەو پیری دێن و پێشوازی لێ دەکەن، بوونی، لە جیاتی ئەوەی تووشی داخوران بێت، زیاد دەکات و پتر دەبێتبەڵام کە تۆزێک چاوی بەرزتر دەکردەوە، لە دووری سەت مەترێک خانووەکەی خۆی دەدیت، باریک و بڵند بەسەرەوەی پردەکەی ئۆشۆنژ قیت ببووەوە، تەماشای پەنجەرەی ژووری کارەکەی دەکرد، خۆی دەدیت، کە لەبەر دەم پەنجەرەکە وەستا بوو، خۆی دەدیت کە لەوێ تەماشای دەرەوە دەکات، تەماشای خوارەوە بۆ ڕووبارەکە، تەمەشای تەوژمی ڕووبارەکە دەکات کە چۆن دوور دەکەوێتەوە، وەک ئێستا. بەمەش خەونە خۆشەکەی دەڕەویەوە، باڵدین کە لەسەر پۆنت نۆیف وەستا بوو، دەگەڕایەوە، تەپیوتر لە پێشوو، تەپیو وەک ئێستای، پشتی لە پەنجەرەکە دەکرد و تەمەشای مێزی نووسینەکەی دەکرد، دەچوو دادەنیشت.

شووشه عەترەکەی پلیسییێی بەرامبەر دانرابوو. شلەکەی ناوی بەرامبەر تیشکی رۆژ بە رەنگێکی قاوەیی زێڕین دەدرەوشایەوە، ساف، بێ ئەوەی کەمترین خڵت و لیڵیی تێدا بێت. زۆر بێ گوناه دەکەوتە بەرچاوان، وەک چایێکی رۆشن، بەڵام جگە لە پێنجییەکی ئەلکهول، پێنجییەک تێکەڵەیەکی پڕ نهێنی تێدا بوو، ئەو تێکەڵە توانیبووی تەواوی شارێک تووشی هەڵچوون بکات. ئەو تێکەڵەش لەوانە بوو، لە سێ یان لە سی ماددەی جیاواز پێکهاتبێت، کە بە رێژەی جیا جیای دیاریکراو تێکەڵی یەکترکراون، ڕێژەکان چەند بە چەندن، بێ ژمار شێمانە هەیە. ئەو پێنجییەکەی رۆحی عەترەکە بوو، بۆ ئەوەی لە رێگەی عەترێکەوە قسە لەگەڵ رۆحی ئەو بازرگانە خوێنساردە، پلیسیێ بکەیت، دەبووایە پەردە لەسەر پێکهاتەی ئەو عەترە هەڵبدەیتەوە.

باڵدین بە ئاگایی و هەستیارییەوە بۆنی بۆنەکەی دەکرد، جالۆزینی پەنجەرەکەی کەمێک هێنابووە خوارەوە، چونکە تیشکی رۆژ کاریگەری لە هەموو ماددەیەکی بۆنیی و چڕی هەموو بۆنێکی ناسک دەکات. دەستەسڕێکی سپی پاکی لە چەکمەجەی مێزەکەی هێنا دەرەوەو دەقەکانی کردەوە، پاشان دەمەوانەی شووشەکەی بە سووکی باداو شووشەکەی کردەوە. لەم کاتەدا تەواو سەری خۆی لە شووشەکە دوور خستبووەوە، لالووتی خۆی هێنابووە بارییەک، چونکە خوانەخواستە، نەیدەویست یەکسەر بکەوێتە بەر کاریگەری خێرای بۆنی شووشەکە، پێویستە عەتر لە باری هەوایی و لە باری کرانەوە بۆن بکرێت، هەرگیز نابێت لە باری چڕیدا بۆن بکرێت. چەند دڵۆپەیەکی داچۆڕاندە سەر دەستەسڕەکە، لە هەوادا ڕایتەکاند، تا ئەلکهولەکەی بڵاوبکاتەوە، ئەوجا بردیە ژێر لووتی خۆی. سێ جار بە کورتی و یەک لە دوای یەک بۆنەکەی هەڵمژی، وەک پۆدرەیەک، دووبارە پفی کردە دەرەوە، نەفەسی راگرت، دیسان سێ جاری تر وەک پێشوو بۆنی کردەوە، لە کۆتاییشدا بە هەناسەیەکی قووڵ بۆنەکەی هەڵمژی، ئەو هەناسە قووڵەشی هێواش هێواش، لەگەڵ چەند جار ڕاگرتنی،

دایەوە، وەک چۆن بەسەر پلیکانەیەکی درێژی راست بخزێتە خوارە ئاوا. دەستەسڕەکەی فڕێدایە سەر مێزەکە، کشایە دواوەو پشتی خۆی خستە سەر پشتۆکی کورسییەکەی.

عەترەکە عەترێکی بێ تام باش بوو. بە داخەوە ئەو پلیسیێە ناکەسبەچەیە، خاوەن بەهرە بوو، توانای هەبوو. با گلەیی لە خوا بکرێت، ئەو پیاوە وەستایێک بوو بۆ خۆی، ئەگەر هەزاران جاریش، هیچی نەخوێندبێت! باڵدین خۆزگەی دەخواست کە ئەم عەترە بەرهەمی خۆی بووایە، ئەو "ئامۆر و پسوشە". شوونی هیچ شتێکی نوێی پێوە دیار نەبوو. بۆنێکی بێ ئەملا ئەولا کلاسیک بوو، خڕ و هاڕمۆن. لەگەڵ ئەوەش کاریگەرییێکی نوێی هەبوو. تازە، بەڵام نەک زەق و بە زریق و

باق، گوڵاوی. بەڵام نەک سادەو سەرەتایی. قووڵایی هەبوو، قووڵاییێکی پڕشنگداری، سەقامگرتووی، پڕی قاوەیی تێر، بەڵام پڕی و تێرپییەکەی کەمێکیشی لێ زیاد نەبوو.

باڵدین وەک بڵێی بە سەنگینی هەستایەوە، جارێکی تر دەسەسرەکەی هەڵگرت و بردیە ژێر لووتی خۆی. "شتێکی عەجاییە، عەجایب" منەمنێکی لێوە هات. بە ئیشتیاوە بۆنی دەکرد: "رەنگ و بۆنێکی رۆناکی هەیە، سووک، ناسک، وەک ئاواز وایە، یەکسەر زەوقێکی خۆش دەداتە پیاو... قسەی قۆڕ، زەوقێکی خۆش!" دەستەسرەکەی بە تووڕەیی توڕدایەوە سەر مێزەکە، پشتی خۆی تێ کردو چووە گوشەیەکی پشتەوەی ژوورەکە، وەک ئەوەی شەرمی لەو حەماسەتەی خۆی کردبێتەوە.

شەرمەزاریە! بەو پیاهەڵگوتنانە هەڵبخەڵەتێیت! "وەک ئاوازێک، رۆناک، عەجایب. زەوقی خۆش" قسەی هیچ! قسەی منداڵان" کاریگەرییێکی ساتەوەختی، دەردە پیری. بارێکی دەروونی.

لەوانەیە کاریگەری بەشە پاشماوەی ئیتالیایی بێت لە جەستەت. لە کاتی بۆندکردندا حوکم مەدە، ئەوە رێسای یەکەمینە، هەی باڵدین سەر پیرەمەرڕ! بۆن بکە کاتێک تۆ خەریکی بۆنکردنیت، ئەو کاتەش حوکم بدە، کە بۆنت کرد! "ئامۆر و پسوشە" عەترێکی ساغلەم نیە. تەنها بەرهەمێکی سەرکەوتووە. تێکەڵەیەکی دەستڕەنگینی بەرهەمی چەند کارێکی ترە، ئەگەر نەڵێین کارێکی کوێرانەیە. جگە لە کاری کوێرانەش پتر لە کەسێکی وەک پلیسیێ چاوەڕوان ناکرێت. بێگومان نموونەیەکی وەک پلیسیێ ناتوانێت چەند دانە عەترێک بهێنێتە بەرهەم. ئەو کابرایە باشترین توانای چاوبگیرکردنی خەڵکی هەیە، بە هارمۆنییێکی تەواو، هەستی بۆنکردن سڕ دەکات، ئەو مرۆڤە گورگێکە لە پێستی مەڕ و هونەری کلاسیکی بۆنکاری، بە یەک وشە: چەپەلێکی بەهرەدارە. ئەوەش خراپترە لە گاڵتەکردن بە ئاین.

بەڵام تۆ، باڵدین، رێگەنادەیت سەرەڕۆت بکەن. تەنها ئەوە نەبێت لە ژێر کاریگەری ئەو ماددە دەستکردە، چەند چاوتروکانێک تووشی هەڵچوون بوویت. بەڵام دەزانیت،دوای سەعاتێک ئەو ماددەیە چ بۆنێکی لێ دێت، کاتێک پێکهاتە فرپوەکانی بڵاوبوونەوەو ماددە بنچینەکەی مایەوە؟ یان ئەمرۆ ئێوارە چ بۆنێکی لێ دێت، کاتێک بۆنی ئەو پێکاهاتە تاریک و گرانانە دەرکەوتن، کە ئێستا کەوتوونەتە ژێر پەردە جوانەکانی گوڵ؟ چاوەڕوان کە، باڵدین! چاوەڕوان کە!دووەمین رێسا پێمان دەڵێت: عەتر لە ناو کاتدا دەژیت، دەمی لاوی، دەمی پێگەیشتنی، هەروەها دەمی پیری هەیە. ئەگەر لە هەر سێ قۆناغی تەمەنی هەمان بۆنی خۆشی بڵاوکردەوە، ئەوا ئەو عەترە سەرکەوتووە. ئەدی چەندین جار تووشی ئەوە نەهاتووین، تێکەڵەیەکمان دروستکردووە، لە تاقیکردنەوەی یەکەمی بۆنێکی زۆر خۆشی لێ هاتووە، دوای

کاتێکی کورت بۆنی مێوەیەکی ڕزیوی لێ هاتووە، لە کۆتاییش بۆنێکی قێزەوەنی میسکی لێ هاتووە، چونکە بڕێکی زۆرمان بەکارهێناوە. بەتایبەت دەبێت زۆر ئاگات لە میسک بێت! یەک دڵۆپ پتر لە ڕادەی خۆی کارەسات دەخوڵقێنێت. ئەمە هەڵەیەکی کۆنینەیە. کێ دەڵێت پلیسیێ میسکی زۆر تێ نەکردووە؟ "ئامۆر و پسوشە" ئەمڕۆ ئێوارە تەنها هەڵـمێکی میزی پشیلەی لێ نامینێتەوە؟ ڕاوەستە، دەینبین!

ئێمە دەبینین. چۆن تەورێکی تیژ دار پارچە پارچە وورد دەکات، کەپووی ئێمەش عەترەکەی پلیسیێ ئاوا پارچە پارچە شێ دەکاتەوە. ئەوجا ئاشکرا دەبێت، کە ئەو بەناو بۆنە سیحراویە، بە ڕێگاییێکی زۆر ئاسایی و کۆن و ناسراو، هاتۆتە ئارا. ئێمەی، باڵدین، عەترساز، پەردە لەسەر ڕووی راستی ئەو پلیسیێە سرکە تێکەڵکارە هەڵدەدەینەوە. ئێمە دەمامکی سەر ڕووی ناشیرینی لادەبەین و بۆ ئەو نوێخوازانە دەیسەلـمێنن کە پیرە پیشەگەرەکان چیان لەباردایە. کتومت، سەت لە سەت وەک خۆی تێکەڵی دەکەم، وەک عەترە مۆدێلەکەی. عەترەکەی ئەو بە دەستی ئێمە بە نوێیی دێتە ئارا، سەت لە سەت وەک خۆی کۆپی دەکەم، بە شێوەیەک تاژیش نەتوانێت لە بۆنەکەی ئەوی جودابکاتەوە. نەخێر! ئەوە بۆ ئێمە بەس نیە! ئێمە زۆر باشتریشی دەکەین! ئێمە هەڵەکانی دەسەلـمێنین و وەلایان دەنێین، بەو شێوەیە دەخەینە ناو کەللەی: تۆ کابرایەکی بێ بەهرەی ساختەچیت پلیسیێ! تۆ دەڵەکێکی بۆگەنی! تۆ تەنها کابراییێکی ناڕەسەن و پەروەردەنەکراوی، کەوتویتە ناو پیشەگەران، دەنا تۆ هیچ نیت!دەی ئێستا دەس بکە بەکار! باڵدین! لووتی خۆت تیژ بکەو بۆن بکە، بێ ئەوەی خۆت بە کەم بێتە بەرچاو! بۆن بە پێی ڕێساکانی هونەر شێ دەکرێتەوە. تا ئەمڕۆ ئێوارە دەبێت فۆرمەلەی پێکهاتەکەی بخەیتە دەستی خۆت! گەڕاوە لای مێزەکەی و خۆی خستەوە سەر کورسییەکەی، کاغەزێک و مەرەکەب و دەستەسڕێکی تازەی هێنا دەرەوە، هەمووی لە شوێنی خۆی داناو دەستی کرد بە کاری شێکردنەوە. کارەکەشی ئاوا دەکرد، دەستەسڕە بە عەتر تەڕەکەی بە خێرایی بە ژێر لووتی خۆیدا ڕەت دەکرد و دووری دەخستەوە، بۆ ئەوەی لە هەورەبۆنی عەترەکە پێکهاتەیەک بناسێتەوە، جا بێ ئەوەی بهێڵێت بۆنی تێکەڵە ئالۆزەکە خەیاڵی پەرت بکات، بە باسکی کراوە دەستەسڕەکەی لە خۆی دوور دەکردەوە، ئەوسا بە پەلە ناوی ئەو پێکهاتەی دەنووسی، کە لە لووتی گیر دەبوو، پاشان دیسان بە خێرایی دەستەسڕەکەی بەلای لووتی دادەهێنایەوە، تا پێکهاتەیەکی تری لەلووت گیر بێت، بەو شێوەیە بەردەوام بوو...

## ١٢

دوو دەمژمێر بێ وچان خەریکی کار بوو. جار لە دوای جار خێرا تر دەجووڵایەوە، خێراتر خامەکەی لەسەر کاغەزەکە دەخشاند، جار لە دوای جار، لە شووشەکەوە پتر عەتری دەڕژاندە سەر دەستەسڕەکەی و دەیبردە ژێر لووتی.

ئیتر وای لێ هات هیچی تری بۆن نەدەکرد، لەمێژ بوو بە هەڵمژینی پێکهاتە ئێتێرییەکان بەنج ببوو، تەنانەت لەبیری چوو بووەوە، کە ئامانجی تاقیکردنەوەکەی چیەو خەریکی شێکردنەوەی چیە. زانی کە هیچ مانایێکی نیە، لەو کارە بەردەوام بێت. هەرگیز ناتوانێت بگاتە ئەوەی بزانێت ئەو عەترە مۆدێلە نوێیە لە چی پێکهاتووە، ئەمڕۆ ئەوە هیچ، بەڵام بەیانی ئەگەر خوا حەز بکات، لووتی بێتەوە سەر باری خۆی، ئەگەر نا بەیانیش هەر هیچ. ئەو هەرگیز شارەزای ئەو بۆنە نەدەبوو. شێکردنەوەی عەترێک بۆ ئەو کارێکی ناخۆش و دژوار بوو، تێکەڵەیەکی باش یان کەمێک باش تێکەڵکراو، بە تەوای شێ بکەیتەوە، بۆ یەکەیەکەی پێکهاتەکانی. ئیتر ئەوە لای ئەو گرنگ نەبوو، چیتریش نەیدەویست ئەو کارە بکات.

بەڵام ئەوەندەی ئەو کارە کردبوو، هەزاران جار ئەو جووڵە جووڵەی کردبوو، وەک مەکینەیەک بە دەست خۆی نەبوو، دەستەکانی دەجووڵان، دەستەسڕەکەی بە عەتر دەکردو رایدەتەکاند و بە پەلە بە ژێر لووتی خۆی دادەهێنا، بە شێوەیەکی میکانیکی لەگەڵ هەر جارێک راتەکاندنی دەستەسڕەکە ژەمێک بۆنی هەڵدەمژیە ناو سینگی خۆی. تا لووتی خۆی لەو چەرمەسەریە رزگار کرد، لووتی لە ناوەوە تووشی حەساسییەت بوو، ئاوسا، وەک ئەوەی بە تۆپەڵێک شەمێ لووتیان گرتبێت. ئیتر هەر نەیدەتوانی هیچ بۆن بکات، بە ئاستەم هەناسەی بۆ دەدرا. وەک ئەوەی تووشی پەسیوێکی قورس هاتبێت، ئاوا لووتی گیرا بوو، دڵۆپە فرمێسکی ورد ورد لە گۆشەی چاوەکانی قەتیس مابوون. زۆر سوپاس بۆ خودای ئاسمان! ئێستا دەیتوانی بە ویژدانی ئاسوودەوە واز بێنێت. ئیتر ئەو ئەرکی خۆی جێبەجێ کردبوو، هەموو هێزی خۆی خستبووە کار، هەموو یاساکانی هونەری بەکار هێنا بوو، وەک هەمیشەش فەشەلی هێنا بوو.

هیچ کەسێک بۆی نیە لە توانای خۆتت پتر لێ داوا بکات. ئیتر کاتی پشووە. سبەینێ زوو دەنێریت، پلیسیێ شووشەیەکی گەورەی "ئامۆر و پسوشە"ی بۆ بنێرێت و پێستە ئیسپانییەکەی پێ بۆندار دەکەیت بۆ جەنابی گراف ڤێرهامۆنت، چۆنی ویستووە، ئاوها. ئەوجا جانتاکەی دێنێت و سابوونە کۆنەکانی دەخاتە ناو، هەروەها کرێم و پۆدرەو مەرهەمەکانیش، پیاسەی خۆی بۆ دیوەخانی خاتوونە بە سالآچووەکان دەکات. ئەوجا رۆژێکیش دێت دوا پیرە خاتوون کۆچی دوایی دەکات و، بەوەش موشتەریەکانی بە یەگجاری کۆتاییان دێت. ئەوسا خۆشی پیر دەبێت و پەکی دەکەوێت، ناچار دەبێت خانووەکەی بفرۆشێت، بیفرۆشێتە پلیسیێ، یان بە یەکێک لەو بازرگانە تەماعکارانە، لەوانەیە چەند هەزار لیرەیەکی پێ وەربگرێت. ئەوجا کەلوپەلەکانی بخاتە یەک دوو جانتا و لەگەڵ ژنەکەی، ئەگەر تا ئەو کاتە بمێنێت، سەفەر بکەن بۆ ئیتالیا. جا ئەگەر لە رێگا نەمرێت، ئەوا لە لادێیێکی نزیک شاری مێسینا، لە شوێنێک کە خانوو بە هەرزان دەستبکەوێت، خانوێکی بچکۆڵە بۆخۆیان دەکرێت، ئینجا کەنگینێ خوا حەز بکات، جۆزیف باڵدین گەورەترین عەترسازی پاریس، زۆر بە هەژاری لەوێ دەمرێ، ئەوەی خواش حەز بکات، ئەوە باشە.

دەمەوانەی شووشەکەی داخستەوە، خامەکەی دانا، بۆ دواجار بە دەستەسرە عەتراویەکە تەوێڵی خۆی سرپەوە. هەستی بە فێنکی بەهەڵمبوونی ئەلکهول کردو هیچی تر. ئەوجا رۆژ ئاوا بوو.

باڵدین قیت بووەوە. جالۆزینەکەی کردەوە، جەستەی تا ئەژنۆی لە تاریکی ئێوارە نقووم بوو، لەشی وەک مەشخەڵێکی کوژاوەی دوای سووتان دەبرژایەوە. دوا رۆناکی سووری رۆژی لە پشتەوەی لۆڤەر دەدیت، هەروەهاش رۆناکی چراکان لەسەر بانەجزیرییەکانی شار، کە لە ژێرەوەی رووبارەکە وەک زێڕ دەبریسکانەوە، ئیتر کەشتییەکان لەبەر چاو گوم ببوون. بایێکی فێنک هەڵی کرد، بایەکە دەیدا لە رووبارەکە، بە شەپۆڵی ورد ورد ئاوەکەی هێنابووە لەرە، ڕووی ئاوەکەی وەک پوولەکەی پشتی ماسی دەبریسکاندەوە، دەتگوت ملیۆنان لیرەی زێڕت فڕێ داوەتە ناو ئاوەکە، باڵدین بۆ چەند چرکەیەک ئاراستەی ئاوەکەی بە پێچەوانە هاتە بەرچاو، شەپۆڵەکان وەک لافاوێک زێڕی پاراو بەرەو لای ئەو دەهاتن.

چاوەکانی باڵدین شێدار و خەمبار بوون. ساتەوەختێک بە ئارامی وەستا، تەماشای ئەو وێنە جوانەی دەکرد. پاشان لەناکاو پەنجەرەکەی ئاوەڵا کرد، هەردوو باڵی پەنجەرەکەی بە بەرینی کردەوە، تا هێزی هەبوو، بە کەوانەیەکی گەورە شووشە عەترەکەی پلیسیێی تووڕ هەڵدایە خوارەوە. دیتی کە چۆن شووشەکە شڵپەی هات و بەر رووی ئاوەکە کەوت، بۆ چاوقوچانێک ڕووی بریسکاوەی ئاوەکەی شێواند.

بایێک هەڵی کردە ژوورەوە. باڵدین هەناسەیەکی هەڵمژی و هەستی بە نیشتنەوەی ئاوساوی لووتی کرد. ئەوجا پەنجەرەکەی داخست. نزیکە هەر لە هەمان چرکەدا، لە ناکاو بوو بە شەو، شەوێکی تەواو. دیمەنی وەک زێڕ تریسکاوەی شار و رووبارەکە بەستی، بوو بە تاریکییێکی بۆری خۆڵەمێشیی. بە جارێک ژوورەکە سارد و سڕ هەڵگەڕا. هێشتان باڵدین بە هەمان باری پێشوو، لە جێی خۆی وەستا بوو، لە پەنجەرەکەوە چاوی بەرەو دەرەوە لە ئەبڵەق مابوو. "من بەیانی نانێرمە لای پلیسییێ" ئەمەی وت و بەهەردوو دەستی باوەشی کردە پشتۆکی کورسیەکەی، "من ئەمە ناکەم. بەیانیش پیاسەکەی دیوەخان ناکەم. بەڵکو بەیانی دەچم بۆلای دادنووس، خانوو و دووکانەکەم دەفرۆشم، من ئەوە دەکەم و بڕایەوە!".

نیشانەیەکی بۆمەلەرزە ئاسای لاملیی لە دەموچاویدا دەرکەوت، لە نکاوڕا هەستی بە بەختەوەرییێکی زۆر کرد. دیسان ببووەوە بە  باڵدینە کۆنە لاوەکەی جاران، کەڵ و ئازا وەک سەردەمی زوو، رووبەڕووی چارەنووس دەوەستا، هەرچەندە ئەمجارە رووبەڕووبوونەوەکەی تەنها کشانەوە بوو. جا ئەگەریش وابوو! خۆ چیتری بۆ نەماوەتەوە. خودا کاتی باش و خراپ بە بەندەی خۆی دەبەخشێ، بەڵام خودا نایەوێت ئێمە لە کاتە خراپەکاندا دەست بە کرووزانەوەو پاڕانەوە بکەین، بەڵکو دەبێت مێرانە خۆمان بپارێزین. خودا نیشانەیەکی پێشاندا. دیمەنی هەڵخەڵەتێنی وەک خوێن سووری زێڕینی شار ئاگادارکردنەوەیەک بوو: شتێک بڵێ باڵدین، تا درەنگ نەبووە! هێشتان خانووەکەت لە شوێنی خۆی ماوە، هێشتان عەمبارەکەت پڕە، هێشتان دەتوانیت پارەیەکی باش لە بازرگانییە دۆڕاوەکەت، وەربگریت. هێشتان بڕیارەکان لە دەستی خۆتن. دەتوانیت بە ژیانێکی خاکی لە شاری مێسینا بەرەو پیری بچیت، راستە ئەوە ئامانجی ژیانت نەبوو، بەڵام ئەوە شەرەفمەندانەترەو خوداش پێی خۆشترە، لەوەی لە شاری پاریس وەک گەورە پیاوێک ڕۆبچیت. لێ گەڕێ با برویێ و کالتۆ و پلیسییێ ئاهەنگ بگێڕن. جۆزێف باڵدین مەیدانیان بۆ چۆل دەکات. بەڵام ئەمە بە ئازادی خۆیەتی و مل کەچ ناکات!

ئێستا ئەو راستەخۆ شانازی بە خۆی دەکرد. بێ ڕادە هەستی بە بارسووکی دەکرد. دوای چەندین ساڵ، ئەوە یەکەمین جاری بوو، هەستی بە نەمانی ئەو بارە قورسەی سەر شانی دەکرد، ئەو بارەی  دەمارەکانی ملی رەق کردبوو، شانەکانیشی بەرەو پێشەوە چەماندببووەوە، بۆیە بێ ئازار راست و راست خۆی قیت کردەوە، هەستی بە شلی و ئازادی خۆشی دەکرد. بە ئاسانی کەوتەوە هەناسەدان بە لووتی. بە رۆشنی هەستی بە بۆنی "ئامۆر و پسوشە" کرد کە لە ژوورەکەدا بڵاوببووەوە، بە رۆشنی، بەڵام چیتر نەیدەویست خۆیان پێوە خەریک بکات.

باڵدین ژیانی خۆی گۆڕی و هەستی بە خۆشییەکی زۆر کرد. ئێستا دەچێتە سەرەوە بۆ لای ژنەکەی، لەو بڕیارەی خۆی ئاگاداری دەکاتەوە، پاشان دەچێتە ئەوبەر بۆ زیارەتی نۆترێدام، مۆمێک دادەگیرسێنێت و، سوپاسی خودا دەکات، بۆ ئەو بەزەیی و ڕێنمایی و ئەو هێزە زۆرەی کە بەمی بەخشی، بە جۆزیف باڵدین. نزیکە وەک لاوێک، بە جۆشەوە، بارۆکەکەی لە بەروانکەکەی هێنا دەرەوەو خستیە سەر سەرە رووتاوەکەی خۆی، پڕی دا چراکە، کە لەسەر مێزی نووسینەکە داندرا بوو، ژووری کارەکەی بەجێهێشت. تازە مۆمی مۆمدانی ژووری پلیکانەکەی داگیرساندبوو، تا ڕێگای خۆی بۆ چوونەسەرەوەی ڕۆناک بکاتەوە، کە لە خوارەوە لە نهۆمی زەمینی گوێی لە زەنگی دەرگا بوو. ئەوە دەنگی زەنگوڵە جوانە ئێرانیەکەی دەرگای فرۆشگاکەی نەبوو، بەڵکو زرنگەی دەروازەی خزمەتگوزاری پەیک بوو، زرەنگەیەکی ناخۆش، ئەو هەمیشە بە دەنگی ئەو زرنگەیە بێزار دەبوو. زۆرجار ویستبووی ئەو زەنگوڵە لا ببات، زەنگوڵەیەکی دەنگسازگارتری لە جێگە قایم بکات، بەڵام هەمیشە لەبەر خەرجی دڵی نەدەهات، لەم کاتەدا لە هیکرا هاتە خەیاڵی، ئێستا ئەوە گرنگ نیە، ئەو زەنگە ناخۆشەو هەموو خانووەکەی پێکەوە لەگەڵ یەک دەفرۆشێت. با ئەوەی دوای من دەیکرێت خەمی لێ بخوات!دیسان زەنگەکە زرنگایەوە. گوێی خۆی بەرەو خوارەوە قوڵاغ کرد. دەبێت چێنیر ئێستا دووکانەکەی بەجێ هێشتبێت. ئەوە کچە خزمەتچییەکەش نیە، هاتبێت خۆی ماندوو کردبێت. ئیتر باڵدین خۆی چووە خوارەوە، دەرگاکە بکاتەوە. کیلۆنی دەرگاکەی راکێشا، دەرگا قورسەکەی کردەوە، هیچ دیار نەبوو. تاریکی ڕۆناکی مۆمەکەی بە تەواوی قووت دابوو. پاشان هێدی هێدی تارماییێکی هاتە بەرچاو، منداڵێک یان لاوێکی وردیلە بوو، شتێکی لە باوەش گرتبوو.

- "چیت دەوێ؟"

- "مایترێ گریمال منی ناردووە، پێستی بزنم بۆ هێناوی" تارماییەکە ئەمەی گوت و هەندێک هاتە پێشەوەو بە بازووی کراوەی هەندێک چەرمی لەسەریەککەڵەکەبووی بۆ هێنا پێشەوە. لەبەر ڕۆناکی مۆمەکە باڵدین توانی دەموچاوی لاوێک ببینێت، دووچاوی ترسنۆکی چاوەڕوان، لاوێکی مەلوول. وەک ئەوەی خۆی لە پشتی بازووەکانی شاردبێتەوەو چاوەڕوانی لێدان بکات. ئەو لاوە گرێنوی بوو.

# ١٣

چەرمی بزن بۆ پێستی ئیسپانی! باڵدین هاتەوە بیری. چەند ڕۆژێک لەمەوبەر لای گریمال رایسپاردبووکە ئەو پێستانەی بۆ بێت، چەرمێکی نەرمی سڕینەوە، بۆ کەرەسەکانی نووسینی گراف ڤێرهامۆنت، هەر پارچەی بە پازدە فرانک. بەڵام لە راستیدا ئیتر پێوستی بەم چەرمانە نەمابوو، دەیتوانی پارەکەی بۆ خۆی پاشەکەوت بکات. لە لایێکی تر ئەگەر ئاوا، سووک و سانا، لاوەکە رەوان بکاتەوە...؟ کێ دەزانێت ئاکامی ئەمە چی دەبێت، سەرەنجامێکی نەگونجاوی لێ ناکەوێتەوە، لەوانەیە خەڵک قسە بکەن، قسەوقسەلۆک بێتە کایەوە: چیتر باڵدین جێی باوەڕ نیە، باڵدین هیچ کاری تر وەرناگرێت، باڵدین ئیفلاسی کردووە... ئەوەش شتێکی باش نیە، نەخێر، نەخێر، شتێکی ئاوا نرخی فرۆشگاکەشی دەشکێنێت. باشترە ئەو پێستەبزنە بێ سوودانە وەربگرێت. پێی ناوێ لەو ناوەختە کەس بەوە بزانێت، کە باڵدین ژیانی خۆی گۆڕیوە.

- "وەرە ژوورەوە!"

ڕێگەی لاوەکەی دا بچێتە ژوورەوە، چوون بۆ ناو فرۆشگاکە، باڵدین بە خۆی و چراکەی دەستی بە پێشی کەوت، گرێنویش بە خۆو بە چەرمەکانی دەستی لە دواوەی دەڕۆیشت. ئەوە یەکەمین جاری بوو، گرێنوی لە ژیانیدا پێ بخاتە ناو فرۆشگاییێکی عەترسازی، شوێنێک کە بۆنەکان تێیدا شتێکی نامۆو لاوەکی نەبوون، بەڵکو بە تەواوی کەرەسەی ناوەندی و سەرەکی بایەخپێدان بوون. بێگومان ئەو ئاشنای هەموو فرۆشگاکانی عەتر و داو و دەرمانی شارەکە ببوو، بە درێژایی چەندین شەو، لەبەر دەم ئەو دوکان و بازاڕانە وەستا بوو، لووتی خۆی ژەنیبووە ناو درزی دەروازەکانیان. هەموو ئەو بۆنانەی دەناسی، کە لەو شارە بازرگانی پێوە دەکرا، لە ناوەوەی خۆیدا زۆرجاران چەندین عەتری زۆر بۆنخۆشی لێ سازکردبوون. بۆیە هیچ شتێکی نوێ چاوەڕوانی ئەوی نەدەکرد. بەڵام وەک منداڵێک کە ئاشقی مۆسیقا بێت، دڵی بۆ ئەوە لێ دەدا، کە لە نزیکەوە ئۆرکێستراییێک ببینێت، یان جارێک بچێتە کڵێسایێک بەسەر سەکۆی تاقەکان بکەوێت و بە چاوی خۆی ئۆرگلە حەشاردراوەکان ببینێت، گرێنوی ئاوا لە ناوەوە دەسووتا، بۆ دیتنی عەترخانەیەک، بۆیەشە کە بیستبووی چەرم بۆ فرۆشگای باڵدین دەنێردرێت، هەموو هەوڵێکی دابوو، بۆ ئەوەی

ڕێگەی بدەن، ئەو ئەو ئەرکە بخاتە ئەستۆی خۆی. ئێستاش وا لە ناو فرۆشگاکەی باڵدین وەستا بوو، لەو شوێنەی پاریس، کە زۆرترین ژمارەی پاراوی بۆنەکان لە ژوورێکی تەنگ کۆکرابوونەوە. لەبەر ڕۆناکی کزی مۆمەکە چی وای بە چاو نەدەدیت، تەنها کەمێک سێبەری کانتۆڕ و تەرازووەکەی دەدیت، دوو ماسیگرەکەی سەر حەوزەکەشی دەدیت، کورسییێک بۆ موشتەریان، هەرزاڵە تاریکەکانی پاڵ دیوار، دیدێکی خێرای گۆزەو بەرمیل و ئامێرە سفرەکان و ڕەچێتە سپیەکانی سەر شووشەو کەمووڵەو قاپۆکەکان، پتریشی لەوە بۆن نەدەکرد، کە دەمێک بوو لەدەرەوە لەسەر جادە بۆنی کردبوون. بەڵام یەکسەر هەستی بەوە کرد، کە لەو ژوورانەدا کارێکی جیددی لە ئارادایە، وەک بڵێی جیددییەت و بە هەندوەرگرتنێکی پیرۆز، ئەگەر وشەی "پیرۆز" لای گرێنوی مانایێکی هەبووبێت، ئەو هەستی بە بەهەندوەرگرتنێکی سارد کرد، هۆشیاری پیشەگەریی، سیمای وشکی بازرگانی، لەسەر مۆبێل و هەموو ئامێرەکان، لەسەر کەموولەو شووشەو قاپۆکەکان، چەسپ ببوون. کاتێک گرێنوی لە پشت باڵدین، نەخێر لە سێبەری باڵدین دەڕۆیشت، چونکە باڵدین خۆی بەوە ماندوو نەکرد ئەو بخاتە بەر ڕۆناکی، بیری ئەوەی بۆ هات، کە ئەو سەر بێرەیەو بۆ ئێرە باشە، جگە لەم شوێنە ئەو سەر بە هیچ شوێنێکی تر نیە، ئیتر لێرە دەمێنێتەوەو، لێرەوە دنیا بە چەنگالی خۆی ڕاو دەکات. دیارە ئەمە بۆ ئەو خەیاڵێکی بێباکانەی نائاسایی بوو. هیچ شتێک نەبوو، هەر بەڕاستی هیچ شتێک نەبوو، بۆ ئەوەی ڕێگە خۆش بکات شاگردێکی دەباغچی نەناس و نەدیدە، کە کەس نازانێت لە کێ هاتووە، بێ پەیوەندی و بێ بیمە، بێ کەمترین شوێن و پایە، هیوای ئەوە بخوازێت، پێ بخاتە ناو بەناوبانگترین فرۆشگای عەتر و مادده بۆنییەکانی شاری پاریس. لەوەش کەمتر، وەک ئێمە دەزانین، هەڵوەشاندنەوەی ئەو بازرگانییە، شتێک بوو بڕیاری لەسەر درابوو، بڕابووەوە. بەڵام ئەو بیرە تەنها هیواییێکی ڕووت نەبوو، بە ئەندێشەی بێباکی گرێنوی داهاتبێت، بەڵکو ئەمە خەیاڵێک بوو، لە پێناوی دۆزینەوەی زانینێک. دەیزانی، ئەو تەنها هەر ئەوەندە ئەو فرۆشگایە جێ دەهێڵێت، تا دەچێت جلوبەرگەکانی لای گریمال دەهێنێت بۆ ئێرەو چیتریش نا. گەنەکە خوێنی کەوتبووە جۆش. چەندین ساڵ بوو کڕ کەوتبوو، چووبووە ناو قۆزاغەی خۆی و چاوەڕوانی دەکرد. ئێستاش دەیویست بە بێ باکی، بێ هیوا خۆی بداتە دەستی قەدەر، هەر بۆیەشە ئاوا زۆر بێ منەت و دڵنیا بوو.بەناو فرۆشگاکەدا گەڕا. باڵدین دەرگای ژووری پشتەوەی ئاوەڵا کرد، بەشێکی ئەو ژوورەی وەک عەمبار و، بەشێکی وەک تاقیگە بەکاردەهێنا، سابوونی تێدا دەکوڵاند و کرێمی تیدا تێکەڵ بەیەک دەکردو گوڵاو و ئاوە بۆندارەکانی لە شووشەی زل زلی زگ گەورە تێکەڵ بە یەکتری دەکرد.

"ئا لەوێوە!" باڵدین ئەمەی گوت و ئاماژەی بۆ سەر مێزە گەورەکەی بەر پەنجەرە کرد، "لەوێ دایبنێ!"

گرێنوی لە سێبەری باڵدین هاتە دەرەوە، چەرمەکەی خستە سەر مێزەکە، بە خێرایی گەڕایەوە دواوە، لە نێوانی باڵدین و دەرگاکە وەستا. باڵدین کەمێک وەستا. مۆمەکەی کەمێک لادابووە لاوە، نەوەکا دڵۆپە تواوەکانی بکەونە سەر مێزەکە، پشتی پەنجەکانی بە ڕووی لووسی پێستەکەدا داهێنا. پاشان پێستەکەی وەرگێڕا، دەستی بە ڕووە نەرم و کەمێک زبرەکەی لای ناوەوەی داهێنا. ئەو چەرمە چەرمێکی زۆر باش بوو. وەک ئەوە وابوو، کە بۆ پێستی ئیسپانی خۆش کرابێت. ئەوە لە وشککردنەوەدا گرژنابێت و ناچێتەوە باریەک، ئەگەر داردەقیشی پێ دابینی، زوو دێتەوە باری خۆی، کاتێک چەرمەکەی خستە نێوان پەنجەی گەورەو پەنجەی شادومانی، یەکسەر هەستی بەوەش کرد، کە ئەو چەرمە پێنج تا شەش ساڵان بۆن لەخۆیدا ڕادەگرێت. ئەوە چەرمێکی زۆر زۆر باش بوو. لەوانەیە پەنجەوانەی لێ دروست بکات، دوو سێ جووت بۆ خۆی و سی جووتیش بۆ ژنەکەی، بۆ سەفەری مێسینا .دەستی خۆی کێشایەوە. بە هەستیاریەوە تەمەشای مێزی کارەکەی دەکرد: ئەو شتانەی سەری، بۆتەکەیەک بۆ تێکەڵکردنی بۆنەکان، پلاتێکی شووشە بۆ وشککردنەوە، جامیک بۆ تێکەڵکردنی ڕەنگەکان، دەسکە هاونێک و کەوچکێک، فلچەیەک و داردەق و مەقەسێک. وەک ئەوە وابوو شتەکان تەنها بە هۆی تاریکی خەوتبن، بەیانی هەموو واگادێن و زیندوو دەبنەوە. لەوانەیە پێویست بێت مێزەکە لەگەڵ خۆی ببات بۆ مێسینا؟ هەندێک لە ئامرازەکانیش...؟ لەسەر ئەو مێزە دادەنیشت و زۆر باش کاری لەسەر دەکرد. لە داری بەڕوو سازکرابوو، پێچکەکانیشی هەر لە داری بەڕوو بوون، بە درێژی داندرابوو، نەدەجووڵاو هیچ شتێکی لەسەر نە دەلەقی، نە هیچ ترشێک، نە هیچ ڕۆنێک، نە هیچ دەمە چەقۆیەک کاری لێ نەدەکرد. بەڵام ئەو مێزە لەگەڵ خۆی بباتە مێسینا، ئەوە پارەیەکی باشی تێ دەچێت! ئەگەریش بە کەشتی بیبات! بۆیەشە سبەینێ مێزەکەش دەفرۆشرێت، سبەێنێ دەیفرۆشرێت، بە هەموو ئەو شتانەی سەرو بن و تەنیشتییەوە، هەمووی دەفرۆشرێن! ئەوجا ئەو، باڵدین، هەرچەندە راستە دڵێکی ناسکی هەیە، بەڵام کەسایەتییێکی بە هێزیشی هەیە، بۆیەشە هەر چەندە زۆری لا دژوار بوو، بەڵام بڕیارەکەی خۆی جێبەجێ دەکات، بە چاوی بە فرمێسکەوە هەموو شتەکان دەفرۆشێت، سەرەڕای ئەوەش هەر دەیانفرۆشێت، چونکە دەزانێت ئەوە کارێکی راستە، ئەو نیشانی دیوە. خۆی وەرسووڕاندەوە، تا بڕوات. مرۆڤە لاواز و پوتەکە لە ناو دەرگاکە وەستا بوو، ئەوی هەر لەبیر چوو بوو. ئەوجا روی تێ کرد: "باشە! لە زمانی منەوە بە وەستا بڵێ، پێستەکە زۆر باشە، من لەم رۆژانە دێمە لای، پارەکەی دەدەمێ."

"بەڵێ، بەسەرچاو"، گرێنوی وەڵامی دایەوەو لە شوێنی خۆی مایەوە، ڕێگەی باڵدینی گرتبوو، کە دەیویست ژووری کارەکەی بەجێبهێڵێت. باڵدین هەڵوێستەیەکی کەمی کرد، بەڵام سۆسەی هیچی نەکردبوو، بۆیەشە ئەو ئاکارەی بە گێلی یان بێ ئەدەبی، لێنەگرت، بەڵکو وای زانی لە شەرمان حەپەساوە. لێی پرسی:

"ها، چیتە، هیچ راسپاردەیەکی ترت بۆ من هێناوە؟ ئێستا؟ پێمی بڵێ!"

گرێنوی پەست و خەمبار وەستا بوو، تەمەشای باڵدینی دەکرد، ترسێک لە چاوەکانی بەدی دەکرا، بەڵام لە ڕاستیدا ئەمە گرژییێک بوو خۆی لە دەروونی مەڵاس دابوو، بازی دەدایە دەرەوە:

"من دەمەوێت لای ئێوە کار بکەم، جەنابی باڵدین. لای ئێوە، دەمەوێت لە فرۆشگاکەت کار بکەم."

ئەمەی بە شێوەی پاڕانەوە دەرنەبڕی، بەڵکو وەک داخوازییەک، لە ڕاستیدا دەری نەبڕی، بەڵکو بە پاڵەپەستۆ دەری پەڕاندە دەرەوە، بە چرپاندن، بە دووبارەکردنەوە. دیسان باڵدین بە هەڵە لەو باوەڕبەخۆکردنە نائاساییەی گرێنوی گەیشت و، بە ئاکارێکی سادەی منداڵانەی دایە قەڵەم. بە ڕووخۆشی و زەردەخەنەیەکەوە پێی گوت: "تۆ شاگردی دەباغچیت، کوڕەکەم! من هیچ کارێکم نیە بۆ شاگردێکی دەباغچیی، من خۆم هاوکارێکم هەیە، پێویستیم بە شاگرد نیە."

وەک ئەوەی گرێنوی وەڵامەکەی باڵدینی بە هەند وەرنەگرتبێت، یان گوێی لێ نەبوو بێت، بە چرپەچرپ وتی:

- "ئێوە دەتانەوێت ئەو چەرمە بزنە بۆندار بکەن، جەنابی باڵدین؟ ئەو چەرمە، کە من بۆم هێناون، دەتانەوێت بۆنداری بکەن؟" باڵدین گوتی:

— "وایە!"

— "بە - ئامۆر وپسوشە - ی پلیسیێ؟" گرێنوی ئەمەی پرسی، هێندەی تر خۆی وێکنایەوەو ڕۆچووە ناوخۆی.

بەو پرسیارە، ترسێکی سووک جەستەی باڵدینی راجفراند. نەک لەبەر ئەوەی لەخۆی بپرسێ، ئەو کوڕیژگە ئەو زانیارییە تەواوەی لە کوێ دەستکەوتووە، بەڵکو تەنها بە هێنانی ناوی ئەو عەترە رەزا قورسە، ئەوەی کە ئەمڕۆ لە هەوڵی هەڵهێنانیدا سەرکەوتنی بەدەست نەهێنا بوو.

- "چۆن هاتیتە سەر ئەو بیرە بێ مانایە، من عەترێکی بیانی بەکاربهێنم بۆ..."

- "بۆنی ئەو عەترە لە جەنابتان دێت!" گرێنوی چرپاندی. "بۆنەکەی لە نێوچەوانتان دێت، هەروەهاش دەستەسرێک لە گیرفانی راستی بەروانکەی جەنابت دایە، بەو بۆنە

ڕشێندراوە. ئەوە عەترێکی چاک نیە، ئەو —ئامۆر و پسوشە – عەترێکی خراپە، لیمۆی زۆر تێکراوە، زۆریش شەونمەدەریا، کەمیش ڕۆنی سۆرگوڵ."

- "ئەها" باڵدین ئەمەی گوت و، لە راستی قسەکانی بەو وردییە تووشی حەپەسان بوو: "چی تریش؟"

- "گوڵی نارنج، لیمۆ، مێخەک، میسک، یاسەمین، گیانی شەراب و هەندێک...، لە شتێک کە من ناوەکەی نازانم، ئەوەتە، لێرە، جەنابتان دەیبینی، لەولاوە! لەناو ئەو شووشەە!" بە پەنجە ئاماژەی بۆ ناو تاریکایی کرد. باڵدین چراکەی ئاراستەی هەمان شوێن کرد، کە ئەو ئاماژەی بۆ کردبوو، بە ئاراستەی ئاماژەی لاوەکە تەماشای کرد، چاوی کەوت بە شووشەیەک لەناو هەرزاڵەکە، کە مەرهەمێکی بۆری زەردی تێدا بوو.

- "شتۆراکس؟" باڵدین پرسی. گرێنوی سەری خۆی راوەشاند:

- "بەڵێ. ئەوەی ناو ئەو شووشە، شتۆراکس."

پاشان وەک ئەوەی خوی گرتبێت، خۆی چەماندەوەو بەلای کەم دوازدە جار بە منەمن وشەی شتۆراکس ی لەبەرخۆی دووبارە کردەوە: "شتۆراکس شتۆراکس شتۆراکس شتۆراکس شتۆراکس..."

باڵدین مۆمەکەی لەبەرامبەر ئەو مرۆڤە شتۆراکس- فرتێنە چڵکنە راگرت و بیری کردەوە: ئەو کوڕە شێت بووە، یان فێڵبازێکی ساختەچیە، یان خاوەن بەهرەیەکی خوداییە. چونکە ئەو ماددانەی ناوی هێنان، دەکرا، کە پێکهاتەی راستی عەتری "ئامۆر و پسوشە" بن، بگرە زۆریشی ڕێ تێ دەچوو، کە وابێت. ڕۆنی سۆرگوڵ، مێخەک و شتۆراکس، ئەو سێ پێکهاتە بوون، کە ئەمڕۆ دوای نیوەڕۆ، بێ هیوا بەدوایاندا دەگەڕاو نەیدەدۆزینەوە، ئەو سێ پێکهاتە، لەگەڵ ئەو پێکهاتانەی تریش، کە ئەویش بە باوەڕی خۆی ئاشکرای کردبوون،

پێکەوە ئەو کێکە جوانە خڕپلەیان دروست دەکرد. ئێستا هەر ئەوە دەمایەوە، کە ئایا ئەو پێکهاتانە پێویستە بە چ ڕێژەیەک تێکەڵی یەکتر بکرێن. بۆ ئەوەی ئەمە هەڵبدات، دەبوایە تەواوی ڕۆژەکە باڵدین خەریکی جەڕباندن و تاقیکردنەوە بووایە، کە ئەمەش کارێکی زۆر دژوار بوو، دژوارتر لە دۆزینەوەی بەشە پێکهێنەرەکانی، چونکە دەبووایە بپێوی و بکێشی و یادداشت بکات و دیققەت بدات، بێ ئەوەی غافلگیر بێت، چونکە کەمترین غافلگیری و لەرزینی کەوچکەکەی دەستی و هەڵەکردن لە ژماردنی تنۆکەکان، هەموو هەوڵەکانی بە فێڕۆ دەچوون. بۆیەشە هەوڵدانەکە چەند بە دیققەتتر کرابایە، ئەوەندە ئاکامەکەی پتر نرخی دەبوو. ئەو تێکەڵانەی کە هەڵەشییان تێدا دەکرا، بەهایێکی کەمییان دەبوو... باڵدین ویستی ئەو مرۆڤە

پووتەلەیە تاقی بکاتەوە، پرسیاری پێکهاتەی سەت لە سەتی (ئامۆر و پسوشە)ی لێ کرد. ئەگەر ئەوەی بە تەواوی زانی، بە گرام و بە تنۆک، دیارە ئەوە ساختەچییەو بە شێوەیەک لە شێوەکان ڕەچێتەی عەترەکەی پلیسیێ پەیداکردووە، بۆ ئەوەی بتوانێت لەلای باڵدین خۆی پێ دامەزرێنێت. ئەگەریش بە دوودڵییێکەوەو بە نزیکەیی پێکهاتەکەی زانی، ئەوا دیارە ئەو مرۆڤە بلیمەتێکی بۆنناسەو دەیەوێت لە بەرژەوەندی راستەقینەی باڵدین بکەوێتە کار. نەک لەبەر ئەوەی باڵدین لە بڕیاری وازهێنانی لە کارەکەی، کەوتبێتە دوودڵی و گومان! شتەکە چ پەیوەندێیکیشی نەبوو بە عەترەکەی پلیسیێ و هی تر، ئەگەریش ئەو کوڕە چەندین لیتری بۆ دروستبکات، باڵدین لە خەونیش بیری لەوە نەدەکردەوە، پێستە ئیسپانییەکەی گراف ڤێرهامۆنت بەو عەترە بۆندار بکات، بەڵام... خۆ ئەگەر پیاو بە درێژایی تەمەنی خۆی عەترساز نەبووایە، ژیانێکی تەواوی بە بەرهەمهێنانی عەتر بەسەر نەبردبووایە، ئەوا دەکرا لە سەعاتێکەوە بۆ سەعاتێکی تر، هەموو ئەشق و ئارەزووەکانی کارەکەی خۆی لەبیربچێت! ئێستا لای گرنگ بوو، پێکهاتەی ئەو عەترە نەفرەتلێکراوە بزانێت، لەوەش پتر، دەیویست لە بەهرەی ئەو گەنجە نائاساییە بکۆڵێتەوە، ئەوەی کە بۆنێکی لەسەر نێوچەوانیدا خوێنبووەوە. باڵدین دەیویست بزانێت، ئەوە چ نهێنییەکە خۆی حەشارداوە. بە کورتی لێی ببووە مەراق . کە گرێنوی لە فرتە فرتەکەی بووەوە، باڵدین پێی گوت: "لاوە! وا دیارە تۆ لووتێکی زۆرهەستییارت هەیە" ئەوجا گەڕایەوە ناو کارگەکەی، چراکەی لەسەرخۆ لەسەر مێزی کارەکەی دانا. "گومان لەوەدا نیە، کە لووتێکی هەستیارت هەیە، بەڵام..." گرێنوی قسەکەی پێ بڕی و بە دەنگێکی کەرخ و تیژ، وتی:

"من باشترین لووتی پاریسم هەیە، جەنابی باڵدین. من هەموو بۆنەکانی جیهان دەناسم، هەموو، ئەوەی کە لە پاریس هەیە، هەموو، بەڵام من ناوی هەندێکیان نازانم، بەڵام من دەتوانم ناوەکانیشیان فێر ببم، هی هەموو بۆنەکان، ئەوانەی کە ناویان هەیە، ژمارەیان زۆر نیە، هەر چەند هەزارێکن، من هەمووی فێردەبم، من ناوی ئەو هەتوانە، شتۆراکس، هەرگیز لە یاد ناکەم، ئەوە ناوی شتۆراکسە، شتۆراکس..."

"بێ دەنگ بە!" باڵدین هاواری کرد. "قسەم پێ مەبڕە، کاتێک من قسە دەکەم! تۆ لووتبەرز و لەخۆبایی! هیچ مرۆڤێک نیە ناوی هەزار جۆر بۆن بزانێت. منیش بەخۆم ناوی هەزار بۆن نازانم، بەناو، تەنها چەند سەتێک نەبێت، لە کارگەکەی ئێمەش لە چەند سەتێک پترمان نیە، ئەوانەی تر، هەموو بۆن نین، بەڵکو بۆگەنن!"

گرێنوی، کە پێشتر قسەکانی باڵدینی بە قسە درێژ و تۆنترۆقەییەکانی خۆی بڕی بوو، وەک بڵێی هەندێک جەستەی خۆی ئاوەڵا کردبووەوە، تەنانەت بۆ چەند چاوقوچانێک هەردوو بازووی خۆی بە بازنەیی کردبووەوە، بۆ ئەوەی کە "هەموو، هەموو" ئەو بۆنانەی کە دەیانناسێت، بیانخاتە بەرچاوان، بەڵام کە باڵدین وا بەرپەچی دایەوە، دیسان چووەوە قاوغی خۆی و چۆوە باریەک، وەک کیسەڵێکی رەش بە ئاستانەی دەرگاکە وەنووسایەوە، کەوتەوە چاوەڕوانی. باڵدین لەسەر قسەکانی خۆی بەردەوام بوو:

"بێگومان، من لە مێژە دەزانم کە (ئامۆر و پسوشە) لە شتۆراکس، رۆنی سۆرگوڵ، مێخەک، هەروەاش لیمۆ و شەونمەدەریاو ئەوانە پێکهاتووە. دیارە بۆ دۆزینەوەی ئەمە، وەک دەڵێن، تەنها لووتێکی هەستییار گەرەکە. زۆر ئاساییەو دەبێت کە خودا لووتێکی زۆر هەستییاری بەتۆ بەخشیبێت، وەک زۆرانی تر، زۆران مرۆڤی تر، بە تایبەت لە تەمەنی تۆ. بەڵام عەترساز- باڵدین پەنجەی ئاماژەی خۆی بەرزکردەوەو سنگی خۆی دەرپەڕاند: -عەترساز تەنها پێویستی بە لووتێکی هەستیار نیە. پێویستە چەندین ساڵ چووبێتە مەکتەب و، بێ بەرتیل لە مەیدانی بۆنسازی کاری کردبێت، تا بتوانێت، ببێتە خاوەن بەهرەی ئەوەی، بۆنە ئاڵۆزەکانیش، بە پێی جۆر و بڕ، بە تەواوی شێ بکاتەوە، هەروەهاش بۆ ئاشکراکردنی پێکهاتەکانی تێکەڵەبۆنێکی تازەی نەناسراو. ئەو جۆرە لووتە" — پەنجەی خۆی خستە سەر لووتی خۆی- کەس نییەتی، ئەی کوڕی لاو! پیاو بە کاری بەردەوام و بە زیرەکی خۆی لووتێکی ئاوا بەدەستدەهێنێت! یاخود تۆ توانای ئەوەشت هەیە، کە پێکهاتەی تەواوی (ئامۆر و پسوشە)م پێ بڵێیت؟ تۆ دەتوانی ئەوە بکەیت؟"

گرێنوی وەڵامی نەدایەوە.

"لەوانەیە بتوانیت، بە نزیکەیی پێمی بڵێیت؟" باڵدین ئەمەی گوت و هەندێک خۆی بۆ پێشەوە چەماندەوە، تا کیسەڵەکەی بەردەرگا بەتەوای ببینێت، "ئاوا، تەنها، بە تەخمینێکی نزیک؟ ها؟ دە ئێستا قسە بکە، باشترین لووتەکەی پاریس! دەتوانی ئەمە بکەیت؟"

گرێنوی هەر بێ دەنگ مایەوە. باڵدین وەک ئەوەی هەم ئاسوودەبووبێتەوەو هەم هیوابڕاویش بووبێت، دیسان خۆی راست کردەوەو کەوتەوە قسە:

- "کەواتە ناتوانیت، بێگومان ناتوانیت. جا چۆن دەبێت ئەمە بتوانیت. تۆ وەکو یەکێکی، کە بە تام دەزانیت شۆربایێک گژنیژی تێدایە یان کەرەوز. باشە وایە، بەڵام ئەمە قەت مانای ئەوە نیە، تۆ چێشتلێنەرێکی باشیش بیت. لە هەموو هونەرێک و هەموو پیشەیەک، بزانە، پێش ئەوەی

ئێره جێبهێلیت! بەهره بە تەنها هیچ حسێبێکی بۆ ناکرێت، بەڵکو ئەزموون حسێبە، ئەزموون، ئەوەی بە زانین و زیرەکی پەیدای دەکەیت."

چرای سەر مێزەکەی دیسان هەڵگرت، لەو کاتەدا بوو، گرێنوی لەبەر دەرگا بە دەنگی گیراوی کەوتەوە قسە:

- "من نازانم، پێکهاتە چیە، بەڕێز، من ئەوەیان نازانم، دەنا ئەوی تر هەمووی دەزانم!"

باڵدین چونکە دەیویست قسەکان کۆتایی پێ بهێنێت، بە سەختی وەڵام دایەوە:

- "پێکهاتە، یان فۆرمل، بریتییە، لە وەسفێکی تەواو، بە چ ڕێژەیەک پێویستە بەشەکانی تێکەڵەیەک تێکەڵ بەیەکتری بکرێن، بۆ ئەوەی بۆنی مەبەست، ئەو بۆنەی ئارەزوو دەکرێت، بەبێ خەوشی، بێتە بەرهەم، ئەوەیە پێکهاتە، پێکهاتە ڕەچێتەیەکە، ئەگەر تۆ باشتر لەو پەیڤە دەگەیت."

- "پێکهاتە. پێکهاتە" گرێنوی دەستی کردەوە بە فرتە فرت و لەناو دەرگاکە جەستەی کەمێک گەورەتر بوو: "من پێویستیم بە پێکهاتە نیە. من ڕەچێتەکەی لەناو لووتمە. بۆتی دروست بکەم جەناب؟ بۆتی دروست بکەم؟ تێکەڵەکە دروست بکەم؟  بیکەم؟"

باڵدین کەمێک بە دەنگێکی بەرز هاواری کرد:

- "ئەدی چۆنی دروست دەکەیت؟"

چراکەی بردە بەر دەموچاوی گوڕنەتەڵەکە: "ئەدی چۆنی تێکەڵ دەکەیت؟"

بۆ یەکەمین جاری بوو گرێنوی بی پرینگانەوە قسەی دەکرد:

- "ئێ خۆ هەموو شتەکان لێرە هەن، ئەوەی کە پێویستە، خۆ بۆنەکان هەمووی لێرە هەن، لەو ژوورە." ئەمەی گوت و دیسان پەنجەی بۆ تاریکی ئاماژەکرد: "ڕۆنی سۆرگوڵ ئەوەتێهێ! گوڵە نارنج ئەوەتە لێرێهێ! مێخەک لێرێهێیە! ئەوێهێش شەونمەدەریا...!"

باڵدین نەڕاندی:

- "ڕاستە هەمووی لێرە هەیە! هەموو هەیە! بەڵام من دەڵێم، هەی بەدوای دڵ کەوتوو، هەی گیرۆدەی دڵ، ئەوە سوودی هیچی نیە، ئەگەر فۆرمولەی پێکهاتەکەمان لەدەستدا نەبێت!"

- "ئەوێهێ یاسەمینە! ئەوێهێ گیانی شەراب! ئەوێهێ لیمۆ! ئەوێهێش شتۆراکس!" گرێنوی هەر فرتە فرتی بوو، بە پەنجە ئاماژەی شوێنی جیا جیای دەکردو ناوی ماددەکانی ژوورەکەی دەگوت، کە هەموو لەناو هەرزاڵەو تاریکایی ژوورەکە حەشاردرابوون.  لەبەر ڕۆناکی چراکە، بە ئاستەم سێبەری تاقچکەو هەرزاڵەکان دەردەکەوتن.

- "هێی! دیاره تۆ له تاریکیشدا باش دەبینیت؟" باڵدین لێی پرسی. "تۆ نەک هەر باشترین لووتت هەیە، بەڵکو تیژترین چاوی پاریسیشت هەیە، وانیە؟ خۆ ئەگەر گوێچکەیەکی باشیشت هەیە، گوێ بدێ من چیت پێ دەڵێم: تۆ کەسێکی ساختەچی نیت. لەوانەیە تۆ بە دزی لای پلیسیێ شتێکت دەستکەوتبێت، یان هەستی خۆت لێ راگرتووە، چۆن چۆنی؟ ئێستاش وا دەزانیت، دەتوانیت من دەسخەڕۆ بدەیت؟"

لەو کاتەدا گرێنوی بە تەواوی کرابووەوە، وەک بڵێی بە تەواوی جەستەی خۆی، لە ناو دەرگا وەستا بوو، کەمێک قاچەکانی کردبوونەوە، هەرواش بازووەکانی، بە شێوەیەک وەک جاڵجاڵۆکەیەکی ڕەش دەهاتە بەرچاو، دەتگوت خۆی بە ئاستانەو چوارچێوەی دەرگاکەوە هەڵواسیوە. بە زمانێکی تا ڕادەیەک ڕەوان بە باڵدینی گوت:

- "تەنها دە دەقیقەم بدەرێ! من عەتری (ئامۆر و پسوشە)ت بۆ دروست دەکەم. ئێستا ها ئالێرە، لەو ژوورە. جەناب، تەنها پێنج دەقیقەم بدەرێ!"

- "تۆ وا دەزانی، من رێگەت دەدەم، لە ناو کارگەکەی مندا، لە ناو ئەو بۆن و گوڵاوانەدا دەست بە شڵپ و هۆڕ بکەیت؟ کە هەر یەکێکییان بۆ خۆی سامانێکە؟ چما ڕێگەت دەدەم؟"

- "بەڵێ!" گرێنوی وەڵامی دایەوە.

- "پەحح!" باڵدین بەم پەحە هەموو هەوای ناو سینگی خۆی دەردایە دەرەوە، پاشان هەناسەیەکی قووڵی هەڵمژی، ماوەیەکی درێژ تەمەشای گرێنوی کرد، کە وەک جاڵجاڵۆکەیەک دەهاتە بەرچاو، بیری کردەوە. خۆ ئەگەر راستت دەوێت، شتەکە زۆریش گرنگ نیە،

- وا بیری کردەوە، خۆ بەیانی شتەکان خۆیان هەر کۆتاییان دێت. راستە من دەزانم، ئەوەی ئەو دەیڵێت، بانگەشەیەکی ڕووتەو بەس، ناتونێ جێبەجێی بکات، هەر ناشکرێ بتوانێت ئەمە بکات، ئەوە ناڵێم ئەو کوڕە لە فرانگیپانی مەزنیش مەزن تر بێت. بەڵام بۆچی لێ بگەڕێم شتێک لەبەرچاومدا تاقیبکرێتەوە، کە من خۆم ئەنجامەکەی دەزانم؟ بەڵام ئەوەش هەیە، لەوانەیە رۆژێک بێت لە مێسینا ئەوە بکەوێتەوە بیرم، چونکە هەندێک جار مرۆڤ، بە تایبەت لە کاتی پیریدا، یەخەی لە یەخەی شێتانەترین ئەندێشە گیر دەبێت، ئەوجا ئەوەم بکەوێتە کەڵکەڵە و خۆم بخۆمەوە، بۆچی من قەدری بلیمەتێکی بۆنناس و عەترناسم نەزانی، کە خودا میهرەبانی خۆی بەسەردا باراندبوو، منداڵیکی پەڕجوو... نەخێر ئەوە نەبووەو نابێت. بەپێی هەموو ئەو شتانەی کە ئەقڵ و ژیریی پێم دەڵێن، ئەو شتە ناکرێ و بڕاوەتەوە. بەڵام خۆ موعجیزەش هەیە، موعجیزە جێی گومان نیە. ئێستا کە من رۆژێک دێ لە مێسینا دەمرم، لە کاتی سەرەمەرگدا ئەو ئەندێشە بێت و

یەخەم بگرێت: ئەوان سەردەمان لە پاریس، فلانە ئێوارە، تۆ چاوی خۆت بەرامبەر پەرچووێک قوچاند...؟ ئەمە شتێکی خۆش نیە باڵدین! دە لێ گەڕێ، لێ گەڕێ! با ئەو بلحە هەندێک تنۆکە رۆنی سۆرگوڵ و ڕەنگاوی میسک بە خەسار بدات، خۆ خۆشت بیت هەر ئەوەندە خەسار دەکەیت، ئەگەر بەڕاستی عەتری پلیسیێت هێشتان لا گرنگ بووایە. ئەوجا دەبێت نرخی چەند تنۆکێک چی بێت. نرخی چەندە، نرخی زۆر زۆرە! ئەگەر بەرابەری بکەین لەگەڵ ویژدانێکی ئاسوودەو ئێوارەیەک ئارامی ژیان؟.

باڵدین بەدەنگێک کە خۆی با ئانقەست، گرانی کردبوو، وتی:

- "گوێ بگرە! جارێ بابزانم تۆ ناوت چیە؟" گرێنوی وەڵامی دایەوە:

- "گرێنوی، جۆن پاتیست گرێنوی!" باڵدین گوتی:

- "ئەها، کەواتە جۆن پاتیست گرێنوی گوێ بگرە! من بە تەواوی بیرم لێ کردەوە. من شانسی ئەوەت دەدەمێ، ئێستا، یەکسەر، تۆ ئەو بانگاشەیەی خۆت بسەلمێنیت. ئەوەش لە هەمان کاتدا هەلێکە بۆ تۆ، بۆ ئەوەی بەو فەشەلە قێزەونەی کە تووشی دەبیت، فێری نرخ و بەهای قەناعەتکردن ببیت، ئەو قەناعەتەی کە لە تەمەنی لاوی تۆ، لەوانەیە بەهۆی بەهەڵەپەروەردەکردنەوە، فێری نەبووبیت. ئەو قەناعەتە بۆتۆ دەبێتە مەرجێکی بنچینەیی بۆ ئەوەی لەدوارۆژدا ببیت بە ئەندامێکی باشی هاوپیشەکانت، هاوقەرانەکانت، وەک پیاوێکی خێزاندار، وەک خزمەتکارێک، وەک مرۆڤێک، هەروەها وەک دیانێکی باش. من ئامادەم لەسەر خەرجی خۆم ئەو وانەیەت پێ بڵێم، چونکە ئەمڕۆ من بەهۆییێکی تایبەتی، ئامادەم خێرێک بکەم، کێ دەزانێت، لەوانەیە رۆژێک لە رۆژان، بیرەوەری دیمەنی ئەو ئێوارەیە، بەختەوەرییێکم پێ ببەخشێت. بەڵام من باوەڕ ناکەم، تۆ بتوانیت، لە هەڵسەنگاندندا پێش لەمن بگریتەوە! لووتی جۆزێف باڵدین پیرە، بەڵام تیژە، ئەوەندە تیژە بتوانێت، یەکسەر کەمترین جیاوازی نێوان تێکەڵەکەی تۆو ئەو بەرهەمە، بدۆزێتەوە".

ئەمەی گوت و دەستەسڕەکەی لە گیرفانی خۆی راکێشا دەرەوە، دەستەسڕەکە بە "ئامۆر و پسوشە" شێدار بوو، لە پێش لووتی گرێنوی رایوەشاند و، لە قسەکانی بەردەوام بوو:

- "نزیک بکەوە، باشترین لووتی پاریس! بەڵام ئاگادار بە، هیچم لێ بەرنەدەیتە خوارەوە! جارێ دەست لە هیچ مەدە! دەمەوێ چرای تریش دابگیرسێنم. ئێمە پێویستیمان بە رۆناکی پترە، بۆ ئەو ئەزمایشە بچووکە! وا نیە؟"

بەو جۆرە دوو چرای تری هەڵگرت، کە لەسەر رۆخی مێزە داربەڕووەکە دانرابوون، دایگیرساندن. هەر سێ چرای لە تەنیشت یەک لەسەر رۆخە درێژەکەی پشتەوەی مێزەکە دانا، پێستەکانی پاڵدایە لاوە، ناوەڕاستی مێزەکەی بۆ چۆڵ کرد. بە ئارامی و لە هەمانکاتدا بە خێرایی ئامرازەکانی هێنا، هەموو ئەو شتانەی کە پێویست بوون: شووشە زگدارە گەورەکەی تێکەڵکردن، کوفکە شووشەکان، کەوچکەکان، پێوەرەشووشە بچووک و گەورەکان، هەمووی بە رێکوپێکی لە پێش خۆی، لەسەر مێزە بەڕووەکە، دانان .

گرێنوی لەو ماوەیەدا خۆی لە چوارچێوەی دەرگاکە کردبووەوە. ئەو کاتەی کە باڵدین لە گەرمەی قسەکانیدا بوو، گرژی و رەقبوونی جەستەو پەستی لە یەقەی ببوونەوە. ئەو تەنها گوێی لە دەربڕینی رەزامەندی باڵدین بوو، وەک خۆشی دەروونی منداڵێک خۆشحاڵ بوو، بەوەی رەزامەندی بەدەستهێنا بوو، بۆ ئەو مەرز و مەرج و ئامۆژگارییە ئەخلاقییانەش، کە بە ڕەزامەندییەکەوە بەندبوون، فیتەی لێ دەدا. لەسەرەخۆی لەوێ بە ئارامی وەستا بوو، یەکەمین جاری بوو، لە ژیان، پتر بە مرۆڤ دەچوو، وەک لە گیاندار، بێ باک گوێی لە قسە نەرمە زۆرەکانی باڵدین گرتبوو، دەیزانی کە باڵدین بۆی داهێناوەو، ئەو بەسەر باڵدیندا زاڵ بووە.

لەو کاتەی کە هێشتان باڵدین خەریک بوو مۆمەکانی لەسەر مێزەکە رێکدەخست، گرینوی خۆی خزاندبووە لا تاریکەکەی کارگەکە، خۆی گەیاندبووە هەرزاڵەو تاقچەکەکان، کە دۆشاوە بەنرخەکانیان لەسەر بوون، دۆشاوی ڕۆن و دۆشاوی ڕەنگاوەکان، دەستی کرد بە هەڵگرتنی ئەو پێکهاتانەی کە بۆ عەترەکە پێویست بوون، بە هەستی لووت دەیدۆزینەوەو هەڵیدەبژاردن. ژمارەیان نۆ بوو: گوڵاوی نارنج، رۆنی لیمۆ، رۆنی مێخەک، رۆنی سۆرگوڵ، رۆنی یاسەمین، رۆنی لیمۆی سەوز، رۆنی شەونمەی دەریا، رەنگاوی میسک، هەتوانی شتۆراکس. هەمووی هێنانە خوارەوەو بە رێکی لە لێواری مێزەکە دانیان، پاشانیش شووشە گەورە زگنەکەی راکێشا پێشەوە، کە پڕ بوو لە دۆشاوی گیانی شەراب. ئەوجا چوو لە پشت باڵدین راوەستا، بە لەرزەو بەبێ ئارامی چاوەڕوانی ئەوەی بوو، پیرە باڵدین دووربکەوێتەوە شوێنی بۆ چۆڵ بکات، باڵدینش هێشتان بە دیققەت خەریکی رێکخستنی شووشەکانی پێوان بوو، یەکێکی کەمێک بۆ دواوە پاڵدەدا، یەکێک بۆ پێشەوە، هەوڵی دەدا، وەک خووی پێوە گرتبوو، هەمووی لە رێکی یەک دابنێت و بیانخاتە بەر رۆناکی چراکان.

– "ئاوها" ئەمەی گوت و هەستایەوە، خۆی دایە لایەک و، بەردەوام بوو لە قسە: "ئەوەتە هەمووی لێرە رێزکراون، ئەوەی تۆ پێویستتە بۆ...، با دۆستانە بڵێین، بۆ —تاقیکردنەوە— کەت.

هیچم لێ نەشکێنیت، چیم لێ نەرێژیت! ئەوەش بزانە! ئەو شلانە، کە ئێستا بۆت هەیە پێنج خوولەک خۆتیان پێوە خەریک بکەیت، نرخیان زۆر گرانەو دەگمەنن، بەو خەستییە تۆ هەرگیز جارێکی تر لە ژیانتدا ئەوانە لەدەست ناگریت!" گرێنوی لێی پرسی:

– "جەناب! چەندتان بۆ دروست بکەم؟

باڵدین: دەتەوێ چی...؟ " گرێنوی پرسیارەکەی پێ بڕی و ووتی:

– چەندتان لەو عەترە بۆ دروست بکەم؟ چەندتان لەو عەترە پێویستە؟ ئەو شووشە گەورەیەتان بۆ پڕاو پڕ بکەم؟" ئاماژەی بۆ شووشەیەکی گەورە کرد، کە بەلای کەم سێ لیتری دەگرت.

باڵدین بە تەنگەتاوی هاواری کرد: "نەء! نابێت ئەوە بکەیەت!" لە ناخی ناخەوە ئەم هاوارەی کرد، وەک ئەوەی لە ناکاو تووشی مەترسی ئەوە بوو بێت، هەموو سامانەکەی بە خەسار بدرێت. بەڵام وەک ئەوەی شەرمی لەم هاوارەی خۆی کردبێتەوەو بیەوێت پینەی بکات، یەکسەر دوای هاوارەکەی نەڕاندی: "ناشبێ تۆ قسەم پێ ببڕیت!" ئەوجا بە دەنگێکی ئارامی پەلارئامێز بەردەوام بوو: "ئێمە سێ لیترمان لەو عەترە بۆ چیە، کە لای هەردووکمان نرخێکی نیە؟ نیوەی شووشە پێوەرێک پڕ بێت بەسە. بەڵام دەزانم تێکەڵکردنی ئەو بڕە کەمانە بە وردی لەگەڵ یەکتری کارێکی دژوارە، بۆیە رێگەت پێ دەدەم تا سێیەکی ئەو شووشەی تێکەڵکردنە بەکاربهێنیت." گرێنوی گوتی:

– "باشە، من سێیەکی ئەو شووشەت بۆ پڕ دەکەم لە (ئامۆر و پسوشە) بەڵام جەنابی باڵدین، من بە شێوازی خۆم دروستی دەکەم. من نازانم کە شێوازەکەی من وەک هی پسپۆرانە یان نا، چونکە من شێوازی پسپۆران نازانم، بەڵام من بە شێوازی خۆم دروستی دەکەم." باڵدین گوتی:

– "فەرموو!" باڵدین دەیزانی، کە تەنها یەک شێواز بۆ دروستکردنی ئەو عەترە هەیە، شێوازی من و هی تۆ، یان هی پسپۆران نیە، تەنهاو تەنها یەک رێگای راست هەیە، ئەویش دەبێت بە پێی فورمولەی یان لێکدانەوەیەکی حسێبی فورمولەکەو بە پێوان، بڕە پێویستەکانی دۆشاوی بۆنەکان، بە دیقەتێکی تەواو و بە چڕییەکی تەواو، تێکەڵ بە یەکتری بکرێت، پاشان ئەلکهولی تێبکرێت، ئەویش بە رێژەیەکی تەواو و ورد، کە زۆربەی جاران دەکەوێتە نێوانی یەک بۆ دە و یەک بۆ بیست، تا بگەیتە عەترێکی باش. دەنا رێگاییێکی تر نیە. بۆیەشە ئەوەی ئێستا ئەو بە چاوی خۆی دەیدیت، ئەوەی لەسەرەتا بە گاڵتەجاڕی و پاشانیش بە حەپەساوی سەرنجی دەدایێ، وەکوو پەرجووێک دەکەوتە بەرچاوی. ئەو دیمەنانە ئەوەندە بە قووڵی کاریان لە مێشکی باڵدین کرد، تا کۆتایی ژیانی لە یادی نەچوون.

## ١٤

یەکەمین جار گرێنوی، ئەو مرۆڤە بچووکە، تەپەدۆری شووشە زەبەڵاحەکەی کردەوە، ئەوەی گیانی شەرابی تێدابوو. زۆر بە سەختی و ماندووبوونێکی زۆر، توانی ئەو شووشە گەورە بەرزبکاتەوە. ناچاربوو نزیکە تا ئاستی سەری خۆی بەرزی بکاتەوە، چونکە شووشەی تێکەڵکردنەکە ئاوا بەرز بوو، کوفکێکی شووشەش لەسەر دەمەکەی دانرابوو، هێندەی تر بەرزی کردبووەوە، ئەویش پێوەر و پەرداخی عەیاری بەکارنەهێنا، بەڵکو یەکسەر ئەلکهولەکەی لە شووشە گەورەکەوە، لە شووشەی تێکەڵکردنەکە کرد. باڵدین سەری سوورِما بوو، دەترسا، لەم هەموو نەگونجانە: ئەو کورِە نەک هەر نیزامی دونیای عەترسازی ئاوەژووکردۆتەوە، بەوەی کە بێ ئەوەی چرِی ئەو شلەیە بزانێت، دەستی کرد بە بەکارهێنانی، هەروەهاش لە رِووی جەستەییەوە هی ئەوە نەبوو، ئەو کارە بکات، لە دڵێ خۆی دەیگوت، ئێستا ئەو شووشە زەبەڵاحە دەکەوێتە خوارەوەو لەسەر مێزەکە پارچە پارچە دەبێت. چراکان، بیری کردەوە، چراکان، بکە لە راهی خوای! ئێستا تەقینەوەیەک روودەدات، ماڵەکەم دەسووتێنێت، ماڵەکەم کاول دەکات...! خەریک بوو پرِی بداتێ و ئەو کوپە گەورە لە دەستی ئەو شێتە رابپسکێ، بەڵام لەو کاتەدا گرێنوی خۆی شووشەکەی بەسەلامەتی دانایەوە سەر زەوی و تەپەدۆرەکەی خستەوە سەری. شلە تێکراوەکە لە شووشەی تێکەڵکردنەکە دەشڵەقییەوە، تنۆکیشی بە تەنیشتەکانیدا نەرِژا. گرێنوی کەمێک بۆنی شتەکانی کرد، لە دەموچاوی وا دیار بوو، کە لە بارودۆخەکە رازییە، وەک ئەوەی بەشە دژوارەکەی کۆتایی پێ هێنابێت. جا لە راستیدا بەشە ماوەکەی کارەکەی ئەوەندە بە خێرایی بە ئەنجام گەیاند، بە شێوەیەک چاوی باڵدین بەوە رِانەدەگەیشت بکەوێتە دوای هەنگاوەکانی، یان هەست بە زنجیرەی رێکی هەنگاوەکانی کارەکەی بکات.

دەتگوت گرێنوی بێ هەڵبژاردن و بێ بیرکردنەوە پڕی دەدایە شووشە بۆنەکان، دەمەوانەکانی دەکردنەوەو چرکەیەک لە ژێر لووتی خۆی رایدەگرتن و،

هەندێکی لێ رووەدەکردنە ناو شووشەی تێکەڵکردنەکە، یەکی دادەنا، یەکی تری هەڵدەگرت. کەوچک، کەموولەی ئەزمایش، پێوەر، چیلکەی تێکەڵکردن و هەموو ئەو ئامرازانەی، کە یارمەتی عەترساز دەدەن، تا بەسەر کاری ئالۆزی عەترسازیدا زاڵ ببێت، لەسەر مێزەکەدا دانرابوون، ئەو تاکەجارێکیش دەستی بۆ هیچیان نەبرد. وەک ئەوە وا بوو کە وازی بکات، وازی بە ئاو، وازی بە رژاندن و پرژاندن و شەپەشەپی ئاو، یان وەک منداڵێک گیاو بەرد و خۆڵ بخاتە ناو لەگەنێک ئاو و بڵێت، ئەها ئەوە شۆربایە لێم ناوە. باڵدین ئاوا بیری لە گرێنوی دەکردەوە. بە جارێک گرێنوی وەک منداڵێک دەهاتە بەرچاوی، سەرەڕای دەستی شەقار شەقار و غاراوی، سەرەڕای جێبرین و لۆچەکانی دەموچاوی، سەرەڕای لووتی گرمۆڵەبووی، کە وەک لووتی پیاوێکی پیر وابوو. من وا تێگەیشتم کە ئەوە کەسێکی بە تەمەنترە، لە تەمەنی راستی خۆی، بەڵام ئێستا بچووک دەکەوێتە بەرچاوم، وەک منداڵێکی سێ چوار ساڵ. دەڵێی مرۆڤێکی کەمتەمەنی سەردەمی سەرەتاییە، ناتوانێت، تێیبگەیت، تێیبگەیەنیت، کەللەڕەق، تەنها بیر لەخۆی دەکاتەوە، تەنها بە زۆری زۆرداری دێتە ژێر بار، دێتە ژێربار بەڵام ئەگەر مەراق و خولیا شێتاتییەکەی خۆی بۆ دابین بکەیت، نەک بە پەروەردەکردنی سەخت، ئیدی هێدی هێدی فێردەبێت و خۆی کۆنترۆل دەکات و دەبێتە مرۆڤی تەواو. منداڵێکی ئاوا سەرەڕۆ و کەللە ڕەق خۆی لە ناو ئەو پیاوە لاوە حەشار داوە، ئەوەی کە بە خۆو بە چاوی سووربووەوەی، لەسەر مێزەکە وەستاو تەواوی دەوروبەری خۆی لەبیرکرد، وەک دیار بوو، چیتر ئاگای لەوە نەمابوو، کە جگە لە خۆی و ئەو شووشانەی دەستی شتی تریش لە ناو کارگەکەدا هەبوون، ئەو شووشانەی کە زۆر بە نارێکی هەڵیدەڕشتنە ناو ڕەحەتی شووشەی تێکەڵەکە، تا شۆرباوێکی شێتانە دروست بکات، کە هیچ گومان لەوە دا نیە، کە پاشان بانگەشەی ئەوە دەکات، کە ئەوەی دروستی کردووە، ئەوە عەتری پێگەییوی (ئامۆر و پسوشە)یە. باڵدین ترسی لێ نیشتبوو، کاتێک لەبەر رۆناکی مۆمەکاندا چاوی بەو مرۆڤە سامناکە دەکەوت کە ئاوا بە باوەڕبەخۆبوونێکی ترسێنەر خۆی خەریک کردووە: شتی ئاوا قەت نەبووە! بیری کردەوە، دیسان وەک دوای نیوەڕۆ بۆ چەند چرکەساتێک پەستی و خەمگینی و تووڕەیی دایگرت، وەک ئەو کاتەی کە لە کاتی رۆژئاوابووندا تەماشای شارە درەوشاوەکەی دەکرد. نەخێر زەمانی زوو، هەرگیز شتی وا هەڵنەکەوتووە، ئەوە نموونەیەکی نوێی جۆرەکانە، تەنها لە سەردەمێکی ئاوا خراپ و بۆگەن شتی ئاوا هەڵدەکەوێت... بەڵام لێی گەڕێ، با دەرس

وەربگرێت، ئەو لمووز بەرزە بڵحە! لە کۆتایی ئەو شانۆ عەنتیکەیەی، کە خۆی وەک چەسپ ، پێوەنووساندوووە، چی دەست ناکەوێت، چۆن هاتبوو، ئاواش دەڕواتەوە. جانەوەر! لەو زەمانە نابێت پیاو روو بداتە کەس، چونکە هەمووی بووە بە مار و مێروو . بەو جۆرە باڵدین لەگەڵ تووڕەیی دەروونی خۆی و قێزبوونەوەی لەم سەردەمە خەریک بوو، کاتێک بێ ئەوەی تێبگات، دیتی گرێنوی سەری هەموو شووشەکانی داخستەوە، کوفکەکەی لە شووشەکە دەرهێنا، شووشەکەی بە دەستێک گرتوو، بە ناولەپی چەپیشی دەمی شووشەکەی گرت و بە قایمی دەستی کرد بە شڵەقاندنی. دوای ئەوەی ماوەیەک شڵەقاندی، ناواخنە بەنرخەکانی ناوی، وەک لیمۆ و ئەوانی تر، لە گەردەنی شووشەکە چۆڕاندە خوارەوە، تووڕەییەکەی باڵدین تەقیەوە، یەک بە دەنگی خۆی نەڕاندی: "راوەستە! بەسە ئیتر! ئێستا گوێم لێ بگرە! بەسە! شووشەکە یەکسەر بخەرە سەر مێزەکەو دەستی لێ مەدە! تێگەیشتی؟ بەسە! من دەبێ شێت بووبم، گوێم داوەتە گاڵتەجاڕی تۆ. ئەوەی تۆ لەگەڵ ئەو شتانەت کرد، لەو تێکەڵ و پێکەڵ کردنە، بە مێشکی هیچ و پووچی خۆت، بۆم دەرکەت، کە تۆ کەسێکی گێژ و وێژ و هیچ نەزانی! کەسێکی قەشمەر و بڵحی. تۆ بەهرەی تێکەڵکردنی شەربەتی لیمۆشت نیە، تەنانەت تۆ بەهرەی ئەوەشت نیە، ببیت بە شەربەت فرۆشیش، ئەوە عەترسازی هەر هیچ! خۆشحاڵ بە، سوپاسی خوا بکە! ئەگەر وەستاکەت هەر لە دەباغخانەکەی خۆی راتبگرێت! نەکەی جارێکی تر بوێری ، گوێت لێمە؟ نەکەی جارێکی تر بوێری پێ بخەیتە سەر ئاستانەی دەروازەی سازگەی هیچ عەترسازێک!"

باڵدین ئاوا قسەکانی کردن. لەو کاتەشدا کە خەریکی قسەکردن بوو، ژوورەکەو دەوروبەری ئەو پڕ ببوو لە بۆنی (ئامۆر و پسوشە). بۆنەکان هێزێکی قەناعەتپێهێنی وایان هەیە، کە زۆر بە هێزترن لە هی پەیڤەکان، لە دیتنی چاو، لە هەستەکانی تر هەروەها لە ئیرادەش، بۆن دەچێتە قوڵایی ناخمان، وەک هەناسە بۆ ناو سیەکانمان، سیەکانمان پڕ دەکەن، جەستەمان پڕ دەکەن، هیچ شتێک نیە بتوانێت دژیان بوەستێ.

گرێنوی شووشەکەی دانا، لەپی دەستی، کە خستبوویە سەر دەمی شووشەکە، تەڕ ببوو، سڕیەوە بە لچکی بەروانکەکەی. یەک دوو هەنگاو کشایەوە بۆ دواوە، بە هۆی رێنمایی و تووڕەیی باڵدین، کەمێک جەستەی تووشی تەکین و راچەنین بوو، بەشی ئەوەی هەندێک شەپۆلی با لە دەوری خۆی دروست بکات و ئەو بۆنە بە بازنەیی لەدەوری خۆی بڵاوبکاتەوە. لە راستیدا هێشتان باڵدین هەر لە سەر جنێو و سەرزەنشتکردنی خۆی بەردەوام بوو، بەڵام لە دوای هەڵـمژینی هەر هەناسەیەک لەو هەوا عەتراویە، تووڕەییەکەی کەمتر خۆراکی لە دەروونیدا

دەستدەکەوت. سۆسەی ئەوەی کردبوو، کە سەرچیغ چووە، بۆیەشە قسەکانی دوایی هیچ تووڕەیی و هەڵچوونێکیان تێدا نەما. کاتێکیش لە قسەکەوت، ماوەیەکی درێژ بێ دەنگ بوو، چیتر پێویستی بەوە نەبوو، سەرنج بداتە گرێنوی: "عەترەکە تەواو بوو!" بێ ئەوەی ئەو قسەی گرێنوی ببیستی، دەیزانی دروستکردنی عەترەکە تەواو بووە.

هەرچەندە هەوای بارگاوی بۆندار بە عەتری (ئامۆر و پسوشە)، هەرچوار دەوری گرتبوو، لەگەڵ ئەوەش لە مێزە داربەڕووەکە نزیک کەوتەوە، تا ئەزمایشی بکات. دەستەسرێکی تازەی وەک بەفر سپی لە گیرفانی چەپی بەروانکەکەی هێنا دەرەوە، دەقەکانی دەستەسڕەکەی کردەوەو چەند تنۆکێکی عەترەکەی بە کەوچک لە شووشەکە دەرهێناو رژاندیە سەری. بازووی خۆی کردەوەو، دەستەسڕەکەی لە هەوا راتەکاند، بۆ ئەوەی بۆنەکەی تێدا پەرت ببێت، ئەوجا وەک عادەتی خۆی، بە هێواشی و بە ناسکی دەستەسڕەکەی بردە بەر لووتی خۆی، بۆنی کرد. ئەوجا پشتاوپشت گەڕایە دواوە، لەسەر کوڤلێک دانیشت. پێشتر کە لەگەڵ تەقینەوەی تووڕەییەکەی سوور سوور هەڵگەڕابوو، ئێستا بە یەگجاری رەنگی زەرد هەڵگەڕا. لەبەر خۆی زۆر بە دەنگێکی نزم، منگە منگی بوو: "باوەڕ ناکرێت، بە خودا باوەڕ ناکرێت" ناوە ناوەش، بە بەردەوامی دەستەسڕەکەی بە لووتی خۆی وەدەناو بۆنەکەی هەڵدەمژی و سەری خۆی بادەدا و دەیمنگاند: "باوەڕناکرێت": ئەوە (ئامۆر و پسووشە) بوو، بێ کەمترین گومان ئەوە (ئامۆر و پسووشە بوو)، ئەوە تێکەڵاوێکی بلیمەتانە بوو، هێندە بە دیققەت کۆپی کرا بوو، تەنانەت خودی پلیسیێ نەیدەتوانی لە بەرهەمەکەی خۆی جودا بکاتەوە. "قەت باوەڕ ناکرێت...".

کووڕ و رەنگ زەرد لەسەر کوڤلەکە هەڵترووکابوو، بەخۆو بە دەستەسڕی دەستی، کە خستبوویە سەر لووتی، عەنتیکە دەهاتە بەرچاوان، دەتگوت ژنێکی گەنجەو پەسیوی گرتییە. بە تەواوی قسەی لە گەروو گیر ببوو، کڕ کەوتبوو. چیتر "باوەڕ ناکرێت"یشی نەدەگوت، بەڵکو بەردەوام سەری بە هێواشی بادەداو بە ئەبلەق لە شووشەی بۆنەکە ڕادەما، بە ئاوازێکی نەگۆڕ: "هم، هم، هم...هم، هم، هم...هم، هم، هم "ی لە لووتی دەهاتە دەرەوە. دوای ماوەیەک گرێنوی خۆی لێ نزیک کردەوەو بێ دەنگ، وەک سێبەرێک هاتە بەردەم مێزەکەو گوتی:

- "ئەوە عەترێکی باش نیە، ئەو عەترە زۆر خراپ تێکەڵ بەیەک کراوە." باڵدین گوتی:

- "هم، هم، هم" و گرێنویش لەسەر قسەکەی رۆیشت:

- "ئەگەر جەنابتان رێگەم پێ بدەن، گەورەم، دەمەوێت ئەو عەترە باشتر بکەم. تەنها یەک دەقیقەم مۆلەت بدەنێ، بۆتی دەکەم بە عەترێکی ماقووڵ!" باڵدین گوتی:

- "هم، هم، هم" و سەری لەقاند. سەر لەقاندنەکەی مانای ڕەزامەندی نەبوو، بەڵکو خۆی کەوتبووە بارێکی حەپەساوی دەروونی وا، کە بۆ هەموو شتێک و بۆ هەموو قسەیەک هەر "هم، هم، هم"ی لێوە دەهات و سەری دەلەقاند. بۆیە دیسان منگاندی"هم، هم، هم" و سەری لەقاند. کاتێک گرێنوی بۆ جاری دووەم دەستی کردەوە بە تێکەڵکردن، ئەو خۆی لە گوورە نەبرد و ڕێگەی لێ نەگرت. گرێنوی هەندێکی تر گیانی شەرابی ڕژاندە ناو شووشەی تێکەڵکردنەکە، کە عەترەکەی تێدا دروستکردبوو، ناواخنی شووشەکانی تریشی، وەک دیار بوو، بێ لێکدانەوەو هەڵبژاردن، بە ڕەمەکی یەک لە دوای یەک روودەکردنە ناو کوفکی شووشەکە. ئەمجارە لە کۆتایی کارەکەی شووشەکەی نەشڵەقاندەوە، بەڵکو شووشەکەی بە هێواشی وەک پەرداخێک کۆنیاک بادا، لەوانەشە لەبەر خاتری هەستی ناسکی باڵدین ئەمجارەیان وای کردبێت، یان لەوانەیە ئەو عەترە نوێیەی لا بە نرختر بووبێت لەوەی پێشوو. سووڕاندی شلەی ناو شووشەکە کۆتایی هاتبوو، کاتێک باڵدین لە بەنگبوونەکەیدا بەئاگا هات و قیت بووەوە، بێ ویستی خۆی، هێشتان دەستەسڕەکەی هەر دەپەستایە سەر لووتی، وەک ئەوەی دژی هێرشێکی نوێ بۆ ناوەوەی، خۆی بپارێزێت. گرێنوی گوتی:

- "بەڕێز، ئەوە تەواو بوو. ئێستا بەراستی عەترێکی باشە." باڵدین وەڵامی دایەوە:

- "بەڵێ بەڵێ، ئێستا باشە، ئێستا باشە." ئەمەی گوت و دەستە خاڵیەکەی بۆ هەژاندەوە. گرێنوی وەک ئەوەی غەرغەرە بکات، لە گەرووەوە گوتی:

- "ناتانەوێ بۆنی بکەن؟ جەناب، ناتانەوێ ئەزمایشی بکەن؟"

- "پاشان، ئێستا مگێزی ئەزمایشکردنیم نیە، شتی ترم لە مێشکدایە. ئێستا بڕۆ! وەرە!"

یەکێک لە چراکانی هەڵگرت و چووە ئەوبەری دەرگا، بۆ ناو فرۆشگاکە. گرێنوی بەدوایدا چوو. هاتنە ناو ئەو ڕاڕەوە تەنگەی، کە بەرەو دەرگا تایبەتییەکەی پۆستکاریی دەچوو. پیرە باڵدین پڕی دایە دەروازەکە، کیلۆنەکەی کردەوە، خۆی لادا لاوە، تا ڕێگای کوڕە بکات بچێتە دەرەوە. دیسان گرێنوی لە ئاستانەی دەروازەکە گیربوو، دیسان چاوی کەوتەوە چاوەڕوانی و، پرسی:

- "گەورەم بۆم هەیە لای جەنابتان کار بکەم، بۆم هەیە؟" باڵدین وەڵامی دایەوە:

- "نازانم، بیری لێ دەکەمەوە، جارێ بڕۆ!"

گرێنوی ڕۆیشت، یەکسەر کەوتە گەرووی تاریکی و لەبەرچاودا گوم بوو. باڵدین لە جێی خۆی بە چاوی ئەبڵەق بەرامبەر تاریکی وەستا بوو. بە دەستی ڕاستی چراکەی هەڵگرتبوو، بەدەستی چەپیشی هێشتان دەستەسڕەکەی بە لووتیەوە گرتبوو، وەک یەکێک لووتی دارِسا بێت، ترسێک

گرتبووی، به پەلە دەرگاکەی کلیل دا، پەڕۆکەکەی لە دەموچاوی خۆی دوورخستەوەو خستیە گیرفانی، ئەوجا بە ناو دوکانەکەدا چووە ژووری کارگەکە.

بۆنێکی خۆش دنیای داگیرکردبوو، ئەوەندە خۆش، یەکسەر چاوەکانی باڵدین ئاویان کرد. پێویستی بە ئەزمایشکردن نەبوو، ئەو لە رۆخ مێزەبەرووەکە وەستا بوو، هەناسەی هەڵدەمژی. عەترێکی زۆر نایاب بوو. بە بەراوردکردن لەگەڵ (ئامۆر و پسوشە)، وەک ئەوە وا بوو، کە سیمفۆنیاییێک لەگەڵ دەنگی کەمانجەیەکی ژێ خەوشدار بەراورد بکەیت. هێشتان باشتریش بوو. باڵدین چاوەکانی خۆی قوچاند، بیری لە یادگارییەکانی خۆی کردەوە. سەردەمی لاوێتی خۆی هاتەوە بەرچاو، کاتێک بەناو باخچەکانی ناپۆلیدا دەڕۆیشت، خۆی لە باوەشی ژنێکی هەژاردا دیت، ژنێکی قژ رەش و لوول، تارمایی چەپکێک گوڵەباخی هاتە بەرچاو، کە لەسەر رۆخی پەنجەرەیەک داندرابوو، شنەباییێکی شەو دەیلەراندەوە. گوێی لە جریوەی باڵندان بوو، کە لەوێ بۆ ئەوێ هەڵدەفڕین، لە دوورەوە دەنگی مۆزیکی مەیخانەیەکی کەنار دەریا دەهات، زۆر لە نزیکی گوێچکەی گوێبیستی چرپە چرپێک بوو،

"***من تۆم خۆش دەوێ***" یێکی هاتە ناو گوێ، وەک ئەوەی لە خۆشییان موچرکی بێتێ و هەموو مووەکانی جەستەی قیت بووەستن، ئا ئێستا! ئێستا لەو چاوتروکانەدا! چاوی خۆی هەڵێناو لە خۆشییان کەوتبووە هەناسەبڕکێ. ئەو عەترە لەو عەترانە نەبوو، کە ئەو تا ئێستا پێیان ئاشنا ببوو. ئەوە عەترێک نەبوو بۆنی خۆشتر بێت، عەتر نەبوو، کۆلۆنی و گوڵاو ئەو شتانە نەبوو، ئەوە شتێکی تەواو نوێی کەسنەدیو بوو، شتێک کە دەیتوانی جیهانێک لە خۆیدا بئافرێنێت، جیهانێکی سیحراوی دارا، کە تێدا مرۆڤ بە جارێک هەموو دەوروبەری قێزەونی خۆی لە یاد دەچوو، ئەوەندە هەستی بە دارایی و ئاسوودەیی و ئازادی و خۆشبەختی دەکرد...مووە چەقیوەکانی باڵدینی هەژار نیشتنەوە، ئارامییێکی رۆحی بەسەر جەستەیدا زاڵبوو. پێستەکانی گرت بە دەستەوە، پێستەبزنەکان، کە لەسەر لێواری مێزەکەدا بوون، چەقۆییێکی هێنا، پێستکەی هەڵبڕی. پارچە هەڵبڕاوەکەی خستیە ناو لەگەنێکی شووشە، عەترەکەی بەسەردا رژاند. بە پلاتێکی شووشە لەگەنەکەی داپۆشی، ماوەی عەترەکەی لەناو دوو شووشەی بچووک کرد، کە رەچێتەیان لەسەر چەسپ کرابوو، لەسەریان نووسرابوو "شەوی ناپۆلیی". ئەوجا چراکانی کوژاندەوەو رۆیشت.لە نهۆمی سەرەوە، لە کاتی خواردن هیچی لای ژنەکەی نەدرکاند. خۆ هەر باسی بڕیارە بەرزو پیرۆزەکەی خۆی نەکرد، ئەوەی دوای نیوەڕۆ دابووی. ژنەکەشی چ قسەی نەکرد، کە دیتی مێردەکەی خۆشحاڵ دیارە، ئەویش بەوە زۆر دڵخۆش بوو. نەشچوو بۆ کڵێسای نۆتردام، تا لەوێ سوپاسی خوا بکات بۆ ئەو ئیرادە بە هێزەی کە پێی بەخشیوە. تەنانەت ئەم شەوە بۆ یەکەمین جار لە ژیانیدا لە بیری چوو، نوێژی شەوی بکات.

## ١٦

سبەینێ زوو راستەوڕاست چوو بۆ لای گریمال. یەکەمجار پارەی پێستەبزنەکانی دایێ، پارەکەی بە یەکجێ، بێ بۆڵەو گلەیی خستە دەست. پاشان بۆ نۆشینی شووشەیەک شەرابی سپی، بانگهێشتی کرد بۆ مەیخانەی "تۆور دێ ئارگێنت" و پاشان دەستی کرد بە سەوداکردن لە گەڵی لە بارەی گرێنوی شاگری. بێگومان ئاشکرای نەکرد، کە بۆچی پێویستی بە گرێنوی هەیە. باسی ئەوەی کرد، کە گوایە برێکی زۆر پێستی بۆنداریان لا بە ڕادان داوە، بۆ ئەمە پێویستی بە بەردەستێکی نەخوێندەوار هەیە. پێویستی بە کوڕێژگەیەکی گوێڕایەڵ و بێ تەماع هەیە، کە کاری ساکاری بۆ بکات، پێستەی بۆ ببڕێت و ئەو جۆرە کارانە. شووشەیەکی تریش شەرابی بۆ بانگ کرد، ئەوجا پێێ گوت، کە لە بەرامبەر گرێنوی بیست لیرەی کاشی دەداتێ. بیست لیرە پارەیەکی زۆر بوو. گریمال یەکسەر رازی بوو. پێکەوە چوونە دەباغخانەکە، بۆ ئەو شوێنەی کە گرێنوی بە تایبەت خۆی تەیار کردبوو، چاوەڕوانی دەکرد. باڵدین بیست لیرەی دا بە گریمال و یەکسەر کوڕەی لەگەڵ خۆی برد. باڵدین دەیزانی کە ئەوە باشترین بازرگانی بوو کە لە درێژایی ژیانیدا کردبێتی.

گریمالیش لای خۆی، کە باوەڕی وا بوو، ئەوە باشترین بازرگانی ژیانی بوو کە کردی، گەڕایەوە بۆ مەیخانەکەی تۆور دێ ئارگێنت، دوو شووشە شەرابی تریشی خواردەوە، بەرە بەری نیوەڕۆ گواستییەوە بۆ مەیخانەی لیۆن دێئۆر، بۆ کەناری ئەو بەر، لەوێش بێ پەروا دەستی کرد بە خواردنەوە، ئەوەندەی خواردەوە، سەرخۆش بوو، لە درەنگی شەو کاتێک دەیویست بگەڕێتەوە بۆ "تۆور دێ ئارگێنت"، ڕێگەی لێ تێکچوو، لە جیاتی بچێت بۆ جادەی "گیۆفرۆی لیانیری"، جادەی "نۆنایندیری" گرتە بەر، بۆیە لە جیاتی ئەوەی یەکسەر بچێت بۆ "پۆنت ماری"، کە مەبەستی بوو، لە بەدبەختی خۆی تووشی بوو بە قەراغی "کوای ئۆرمێس"، لەوێوەش پێشاوپێش کەوتە ناو ئاوەکەو شڵپەی لێوەهات، یەکسەر گیانی دەرچوو.

ئاو لاشەکەی بردو لە کەشتیە بارهەڵگرە لەنگەرگرتووەکانی تێ پەڕاند، ماوەیەکی پێچوو، تا رووبارەکە لە تەوژمی بەهێزی ناوەڕاستی خۆی رایکێشا بۆ تەنکاوێک، بەرەبەری بەیانی گریمالی دەباغچی، یان "لاشە تەڕەکەی" سەرئاوکەوت و ئیتر بە ئاسانی بەرەوخوار، بەرەو رۆژئاوا چوو.کاتێک جۆن پاتیست گرێنوی لە پردی "ئۆشۆنژ" پەڕییەوە، بە کپی، بێ ئەوەی خۆی لە ستوونەکانی پردەکە بدات، بیست مەترێک هەورازتر، راست چووە ناو جێگە. لە گۆشەی پشتەوەی کارگەکەی باڵدین، تەختەخەوێکی بۆ دانرابوو، ئیتر ئەمە بووە جێی ئەو، ئا لەو کاتەدا، ئاغا نانبدەکەی پێشووی هەر چوار پەلی لە ناو ئاودا درێژ ببوو، لاشەی ساردی بەرەو ژێر مەلەی دەکرد. گرێنوی بە ئاسوودەیی خۆی لوول داو، خۆی وێکنایەوە، خۆی بچووک کردەوە، بە قەد گەنەیەک. هەر کە خەوی لێ کەوت، رۆچووە ناوە خۆی، قووڵ قووڵ ڕۆچووە ناوە خۆی، تاگەیشتە ناو قەڵای پڕ لە ئاهەنگی دەروونی خۆی، لەوێ لەسەر شەرەفی خودی خۆی، لە ژێر سایەی چەقەدووکەڵی بخوور و هەڵمی مایرە، کەوتە ناو خەونی ئاهەنگی سەرکەوتنی بۆنەکان، کەوتە ناو جیهانی رەهای دابینبوون و لەززەت و شەهوەت.

## ١٧

لەگەڵ هاتنی گرێنوی، عەترخانەکەی جۆزێف باڵدین گەشەی سەند و پەرەی سەند، لە ناوەوەی وڵات و لەسەر ئاستی ئەورووپاش، ناوی دەرکرد. ئیتر زەنگوڵە ئێرانییەکە کپ نەدەبوو، ماسیگرەکانی سەر پردی ئۆشۆنژ لە پڕژاندنی بۆناوەکەیان نەدەوەستان.

هەر ئێوارەی یەکەم، پێویست بوو گرێنوی دەبەیەکی گەورە لە عەتری (شەوی ناپۆلی) دروست بکات، لە چەند رۆژی دوا تر، پتر لە هەشتا شووشەبۆنی ئەو عەترە فرۆشرا. ناوبانگی ئەو عەترە زۆر زوو بە هەموو لایێکدا بڵاوبووەوە، چێنیر ئەوەندە پارەی دەژمارد، چاوەکانی پڕەبوون لە ئاو، ئەوەندەی خۆی بچەمێنێتەوەو کڕنووش ببات، پشتی بە ژان کەوتبوو، چونکە کەسە هەرە باڵاو  پایە بەرزەکان، یاخود هەرنا خزمەتکارەکانیان دەهاتن بۆ فرۆشگاکە. تەنانەت جارێک دەرگا کرایەوە، لەگەڵ جیڕەی دەرگا، پاسەوانی گراف دێ ئارگنسۆن هاتە ژوورەوەو وەک هەر پاسەوانێک هاواری کرد، کە پێنج شووشەی لە بۆنە تازەکە دەوێت، یەک چارەگە سەعات چێنیر لە ترسان لەرزی، چونکە گراف دێ ئارگنسۆن بەڕێوەبەر و وەزیری جەنگی جەنابی پاشا بوو، بەدەسەڵاتترین پیاوی پاریس بوو.

لە کاتێکدا چێنیر لە ناو فرۆشگاکەدا سەرقاڵی پێشوازی لێشاوی مێوان و کڕیاران بوو، باڵدین لەگەڵ شاگردە نوێکەی لە ناو  کارگەکەی دا دەرگایان لەسەر خۆ کلیل دابوو. چێنیر لە خەیاڵی خۆی و بە بێردۆزێکی فەنتازیایی  پوازشی بۆ ئەم بارە نوێیە دەهێنایەوە بە "دابەشکردنی کار و بەکارهێنانی ژیری" ناوی دەبرد. چەندین ساڵ بوو، چێنیر بارە نوێکەی هەروا بۆخۆی لێکدەدایەوە، بە سەبرەوەش تەماشای دەکرد،  بزانێت، هاوپیشەکانیان، پلیێسیر و ئەوانەی وەک ئەو، چۆن کڕیارەکانیان لێ دەرەوێننەوەو ئەو بازرگانییەیان لێ تێکدەدەن. چیتر پلیسیێ بەرگەی ئەم بارە ناگرێت، هاکە ئێستا دێتەوە مەیدان و بەرپەچی ئەو بازرگانییە بێ

تامە دەداتەوە، بەڵێ بە شێوازی تایبەتی خۆیان، بەرپەرچییان دەداتەوە: بۆ هەر کەژێک، بۆ هەر مانگێک، خۆ ئەگەر ناچار ببێت، بۆ هەرهەفتەیەک جاڕی بۆنێکی نوێ دەدات، بەڵام چ بۆنێک! بۆنێک کە تەواوی دەماری داهێنانی خۆی تێدا خەریک دەکات. بۆ ئەوەش تەنها شاگردێکی نەخوێندەوار و مەکتەبنەدیوی پیویست دەبێت، بۆ ئەوەی سەرپەرشتی بەرهەمەکانی بکات و، لە کاتێکدا چێنێریش تەنها کاری ئەوە دەبێت، بیانفرۆشێت. بەو مۆدێلە نوێیە لاپەڕەیەکی یەگجار تازە لە مێژووی عەترسازی هەڵدەدرێتەوە. ململانێ بە لاوە دەندرێت، بێ رادە دەوڵەمەند بوونێ بەڵێ، ئەوجا بە ئاگاییەوەو بە رۆشنی دەڵێت "ماڵەکەت"، چونکە بیر دەکاتەوە، با ئەو کۆنە شاگردانەی کە خزمەتییان کردووە، لە بەشێکی دیاری کراوی ئەو سامانە زۆروزەبەندە، هاوبەش بن.

چەند رۆژێک پێشتر، ئەگەر وەستاکەی قسەیەکی ئاوهای کردبایە، چێنیر بۆی بە خەڵەفاوی و دەردەپیری حسێب دەکرد، لە خەیاڵی خۆی دەیگوت: "ئێستا کاتی ئەوەی هاتووە ببرێتە خەستەخانە، ئیتر ئەوەندەی نەماوە، بە یەگجاری دەسکە هاوەنەکەی بخاتە دەست."

بەڵام وای لێ هات چیتر بیری نەدەکردەوە. چونکە ئەوەندە کاری رژابووە سەر، ماوەی بیرکردنەوەی نەما بوو. ئەوەندە خەریک دەبوو، ئێواران بە ئاستەم تاقەتی ئەوەی دەما، قاسە پڕەکە خاڵی بکات و بەشی خۆی لێ جیا بکاتەوە. لە خەویشدا بیری لەوە نەدەکردەوە، کە باڵدین شتهایێکی نائاسایی یان نایاسایی بەکار دەهێنێت، کاتێک هەموو رۆژێ بە بۆنێکی نوێ لە کارگەکەی دەهاتەوە دەرەوە.

بەڵام چ بۆنێک! نەک هەر باشترین و هەرە باشترین عەتری دنیاو بەس، بەڵکو کرێم، پۆدرە، سابوون، کرێمی قژ، ئاو و رۆن ... ئەوانە هەموو، هەموو ئەو شتانەی کە بۆ بۆنخۆشی بەکار دەهاتن، ئێستا بە بۆنی نوێی زۆر خۆشتر لە هەموو بۆنەکانی پێشوو، لای باڵدین دەهاتنە بەرهەم. بۆنخۆشترین شت، لە هەموو بابەتەکان، هەر بەڕاستی لە هەموو بابەتەکان، تەنانەت قردێلەی بۆنداری نوێی پرچ بەستن، رۆژێک زەوقی سەرسوڕهێنەری باڵدین، قردێلەیەکی خستە بازاڕ، خەڵک بە قەرەپەستانێ ئاپۆڕەیان بۆ بەستبوو، دەتگوت جادوویان لێ کراوە، ئیتر گرنگ نەبوو، شتەکان نرخیان چەندە. هەرچی باڵدین دروستی دەکرد، دەبوو بە سەرکەوتنێک. سەرکەوتنەکانی ئەوەندە زۆر و زەوەند بوون، وای لێ هات چێنیر ئەمەی وەک رووداوێکی سروشت لە قەڵەم دەدا، چیتر لە چاوگەکانی ئەو سەرکەوتنانەی نەدەپێچایەوە. ئەو شاگردە نوێیە، ئەو گوڕنەتەڵە بێ کەڵکە، کە کارگەکەی کردووە بە کۆلیتی خۆی و جار بەجار، کە وەستا

دێته دەرەوە، وەک سەگێک لە بنەبانی ژوورەکە دەکەوێتە بەرچاو، دەبینرێت، بە پێوە وەستاوە، شووشەکان دەسڕێتەوە، هاوەنەکان خاوێن دەکاتەوە، لەوە ناچێت ئەو چنەیە، پەیوەندییێکی لەگەڵ مرۆڤ هەبێت، یان رۆڵێکی لە گەشانەوەی ئەو بازرگانییەدا هەبێت، کە شایانی گوتن بێت، هەرگیز ئەوە بە خەیاڵی چێنیردا نەدەهات، ئەگەر پێشیان گوتبایە، قەت باوەڕی نەدەکرد.

بێگومان هەمووی لە ژێر سەری ئەو جنۆکەیە بوو. ئەو شتانەی کە باڵدین دەیهێنانە فرۆشگاکەو دەیخستنە بەردەستی چێنیر بۆ فرۆشتن، ئەوە هەر بەشێکی ئەو تێکەڵانە بوون، کە گرێنوی لە پشتی دەرگا کلیلدراوەکە سازی کردبوون. باڵدین بە بۆنکردنیان رانەدەگەیشت. هەندێک جار لە ژێر کاریگەری بڕیاردان و هەڵبژاردنی ئەو هەموو بۆنە خۆش و بەرزانەی کە گرێنوی دروستی دەکردن، هەستی بە ئازارێکی راستی  دەکرد. ئەو شاگردە سیحربازە دەیتوانی هەموو عەترسازەکانی فەرەنگستان بە رەچێتەی جۆراوجۆری عەترسازی باربوو بکات، بێ ئەوەی هیچ رەچێتەیەک دووبارە ببێتەوە، بێ ئەوەی بەهاو باشی هیچ یەکێکیان کەم نرخ، یان ناوەنجی بێت، بەڵام ئەوەمان لە بیر نەچێت، بە رەچێتە، واتە بە فۆرمولەی پێکهاتەکانیان، ئەوەی ئەو نەیدەزانی، بۆیە نەیدەتوانی ئەو کارە بکات، چونکە ئەو هێشتان هەر بە شێوازە ناڕێک و رەمەکییەکەی خۆی، بە ناماموستاییەکی تەواو، بۆنەکانی دروستدەکردن، باڵدین شارەزای ببوو، دەیدیت کە گرێنوی بە دەستێکی ئازاد، وەک دەردەکەوت، بە شێوازێکی ناڕێک و نامۆ، بێ ڕێسا، بە هەشتاوی، بە تێکچڕژاوی، چراوی بۆنەکانی تێکەڵی یەکتر دەکردن. نەک بۆ ئەوەی ئەو شێوازە شێتانەیە کۆنترۆل بکات، بەڵکو بۆ ئەوەی بەلای کەم تێی بگات. رۆژێک باڵدین داوای لە گرێنوی کرد، کە پێی خۆشە، ئەگەریش ئەو بە پێویستی نازانێت، لە کاتی تێکەڵکردنی دەرمانەکان تەرازوو، پێوەرگلاس و کەوچک بەکاربهێنێت، پاشان حەز دەکات، کە خۆی وا لێ ڕابهێنێت، کە دۆشاوی گیانی شەرابەکە وەک ماددەیەکی بۆندار تەماشا نەکات، بەڵکو تەنها وەک ماددەیەکی توێنەرەوە، کە کەم کەم و وردە وردە دەکرێتە سەر ئەوانەی تر، لە دواییشدا بیکات لە راهی خوای، کەمێک لەسەرخۆ، بە ئاگایی، بە هێواشی شتەکان تێکەڵی یەکتر بکات، وەک لە پیشەگەری دەستییدا باوە.

گرێنوی وای کرد. ئەوە یەکەمین جاری بوو، باڵدین بتوانێت چاوی بکەوێتە دوای هەنگاوەکانی جووڵەی دەستی ئەو وەستا سیحربازە، یان چاوی بەوە ڕابگات تاک تاکەی هەنگاوەکانی ببینێت و لای خۆی بیاننووسێتەوە. خامەو کاغەزی دەرهێناو لە تەنیشت گرێنوی دادەنیشت و سەرنجەکانی خۆی یادداشت دەکردن، ناوە ناوەش بەبیری دەهێناوە، کە لەسەرخۆ، هێدی کارەکەی بکات، چەند گرام لەمەیان، چەند پێوەرهێل لەوەی تر، چەند تنۆک لە پێکنەری

سێیەمی دەکردە شووشەی تێکەڵەکە، هەمووی دۆکۆمێنت دەکردن. بەو شێوە تایبەتییە، پاشتر باڵدین بە هەمان کەرەسەکان، هەنگاوەکانی شێدەکردنەوە، تا دەگەیشتە دۆزینەوەی ئاوێتە یان فۆرمولەی ئەو تێکەڵانەی کە گرێنوی سازی دەکردن، دەنا بێ بەکارهێنانی ئەو کەرەسانە دۆزینەوەی پێکهاتەکان شتێک بوو نەدەکرا. بەڵام بێ بەکارهێنانی ئەو کەرەسانە، چۆن گرێنوی دەیتوانی عەترەکانی خۆی ساز بکات، ئەوە لای باڵدین هەر وەک مەتەڵێکی هەڵنەدراو مایەوە، پتریش لە مەتەڵ وەک پەڕجووێک، بەڵام بەلای کەم توانی ئەو پەڕجووانە بکاتە فۆرمولەی نووسراو و گیانی تێنووی بۆ ڕێساکان هەندیک ئاسوودە بکات و، جیهانی عەترناسی خۆی لە وێرانبوونی تەواو بپارێزێت.

ورده ورده باڵدین بە ناواخنی هەموو ڕەچێتەی ئەو عەترانەی گرێنوی شارەزا بوو، کە تا ئەو کاتە دایهێنابوون، تەنانەت لە گرێنوی قەدەغەکرد، هیچ عەترێکی تری نوێ ساز بکات، ئەگەر خۆی، باڵدین، بە قەڵەم و کاغەز لە لای ئامادە نەبێت، ئیتر بە چاوی پشکنین، بەردەوام، سەرنجی دەدایە هەنگاوی کارەکانی و خاڵ بە خاڵ دەینووسینەوە. بەو جۆرە ئەوەندەی پێ نەچوو، چەندین فۆرمولەی کۆکردەوە بە هۆی ئەو تێبینییانەی کە دەینووسینەوە، پاشان هەمووی بە جوانی لە دووناميلکەی جیاواز نووسینەوە، یەکێیکانی خستە ناو قاسەی پارە، قوفلی دا، ئەوەی تریشی بەردەوام لە لا بوو، تەنانەت لەکاتی نووستنیشدا. بەمە هەستی بە دڵنیایی دەکرد. چونکە بەو ناميلکەیە دەیتوانی، ئەگەر بیویستبایە، هەموو پەڕجووەکانی گرێنوی دووبارە بکردبایەوە، ئەو پەڕجووانەی کە یەکەم جار، بە دیتنییان،  لە قووڵایی ناخییەوە، تووشی حەپەسان ببوو. وای دەزانی، کە توانیویەتی، بەو فۆرمولە نووسراوانە، جڵەوی ئەو گێژاوە بێ سەروبەر و ئافرێنەرە، کە لە ناخەوەی ئەو شاگردە هەڵدەقوڵێت، بەرزەفت بکات،. هەروەهاش بەمە چیتر بە حەپەساوی و گێلانە تەماشای ناکات، بەڵکو بەو سەرنجدان و تۆمارکردنە، لەو کاری ئافراندنەدا بەشداری دەکات، ئەوەش ئارامی و باوەڕبەخۆبوونی بە باڵدین دەبەخشی. دوای ماوەیەک، وای بیردەکردەوە، کە ئیتر ڕۆڵی ئەویش لە بەرهەمهێنانی ئەو بۆنە ناسک و پاراوانە، ڕۆڵێکی کەم نیە. کاتێکیش فۆرمولەکانی دەخستە دوو توێی ناميلکەکانی و دەیخستنە ناو قاسەو سەرسنگی خۆی، ئیتر هیچ گومانی لەوە نەدەما کە ئەو هەموو داهێنانە، ئیتر دەبوون بە مولکی تایبەتی خۆی. بەڵام گرێنویش سوودی لەم حسێبات و ئەزموونی ڕێسادانانە وەردەگرت، کە باڵدین بەسەری سەپاندبوو. لە ڕاستیدا ئەو بۆخۆی پێویستی بەمە نەبوو، ئەو هەرگیز پێویستی بەوە نەبوو، تەماشای فورمولەیەکی کۆن بکاتەوە، تا دوای چەند

هەفتەیەک یان چەند مانگێک سەرلەنوێ دروستییان بکاتەوە، چونکە ئەو هەرگیز بۆنەکانی لەبیر نەدەچوو. بەڵام بە بەکارهێنانی ناچاری مەن و پێوەرگلاس و تەرازوو، فێری زمانی عەترسازی بوو، هەروەهاش لە هەستی زاماکییانەی خۆیەوە، دەرکی بەوە بردبوو، کە دەبێ ئەو زانیارییە سوودی بۆ ئەو هەبێت. دوای چەند هەفتەیەک گرێنوی نەک هەر فێری ناوی هەموو بۆنەکانی کارگەکەی باڵدین بوو، بەڵکو دەیتوانی فۆرمولەی ئەو عەترانەش بنووسێتەوە کە خۆی دروستی دەکردن و بە پێچەوانەش، دەیتوانی فۆرمولەو رەچێتەکانی عەترە بیانییەکان و پێکنەرە بۆنییەکان، بگۆڕێ و بەکاریان بهێنێت. لەوەش پتر! لە دوای ئەوەی کە فێر بوو، بیری عەترەکانی خۆی بە گرام و بە تنۆک دەرببڕێت، ئیتر پێویستی بەوە نەما، لە نێوانی هەنگاوەکانی بەرهەم هێنان، هیچ ئەزمایشێک بکات. کاتێک باڵدین رایدەسپارد، بۆنێکی نوێ وەک عەتری دەستەسڕ، کیسەبۆن، یان بۆ ئارایشی بۆ دروستبکات، ئیتر وەک جاران گرێنوی یەکسەر دەستی نەدەبرد بۆ کەمووله و شووشەو پۆدرەکان، بەڵکو لەسەر مێز دادەنیشت و یەکسەر فۆرمولەکەی دەنووسینەوە. فێری ئەوە ببوو، کە ئەندێشەی بۆنەکانی خۆی، بۆ بەرهەمهێنان، بە شێوەی فۆرمولەی عەتریی دەرببڕێت. ئەمە بۆ گرێنوی تەنها ڕێگاگۆڕینێک بوو و بەس. بەڵام لە چاوی دنیا، واتە لە چاوی باڵدین، ئەمە پێشکەوتنێک بوو، دەنا پەڕجووەکانی گرێنوی هەر هەمان ئەوانەی پێشوو بوون. بەڵام فێربوونی نووسینی ڕەچێتە بۆ فۆرمولەی بۆنەکان، ترسی لای ئەو نەهێشت، کە ئەوەش سوودێک بوو بۆی. هەرچەند گرێنوی پتر بەسەر رێوشوێنی عەترسازیدا زاڵ دەبوو، پتر فێری زمانی ئاسایی عەترسازی و دەربڕینی ئەو زمانە دەبوو، بەوەش کەمتر تووشی ترسی تووڕەیی وەستاکەی دەبوو. هێندەی پێ نەچوو، چیتر باڵدین وەک مرۆڤێکی نائاسایی بەهرەدار لە بۆنناسی، یان وەک فرانگیپانی دووەم، یان وەک وەستاییێکی سیحربازی نهێنیدار لێی نەدەڕوانی، بەڵکو وەک خودی گرێنوی خۆی، تەماشای دەکرد. ئەو بەهرە پیشەییە سروشتییە بۆی بوو بە تارای پێشوازی کردنی. گرێنوی باڵدینی کرد بە سەرمەشقی خۆی، لە باری کێشانی پێکنەرەکان، لە هەژاندن و سوڕاندنی شووشەی تێکەڵە، لە تەڕکردنی پەڕۆی سپی ئەزمایشکردن. تەنانەت فێری ئەوەش ببوو، کتومت وەک وەستاکەی بە ناسکی دەستەسڕەکە راتەکێنێ و بە جوانی بە ژێر لووتی خۆیدا بەرێ. وەک ئەویش جار بە جار خۆی تووشی هەڵە دەکرد، بە شێوەیەک هەڵەکان سەرنجی باڵدینیان رادەکێشا: لە بیری دەچوو شلەکان بپاڵێوێ، تەرازووەکەی بە هەڵە دادەنا، رێژەیەکی پتر لە رادەی رەنگاوی عەنبەری بەکاردەهێنا لە فۆرمولەیەک... لێ دەگەڕا، تا باڵدین سەرنجی بۆ ئەو هەڵانە رابکێشێت، ئەوجا یەکجێ وەک

ئاوخواردنەوە، راستی دەکردنەوە. بەو شێوە توانی وا لە باڵدین بگەیەنێت، کە راستە هەموو شتێک بە ڕێساو یاسا بەڕێوە دەچێت. خۆ گرێنوی خۆشی نەیدەویست بەرپەرچی ئەو پیاوە پیرە بداتەوە، بەڕاستی دەیویست لێی فێرببێت. نەک لەم فێری تێکەڵکردنی عەترەکان ببێت، نەک فێری پێکهاتەی بۆنەکان ببێت، بێگومان نا! لەو مەیدانەدا هیچ کەسێک لەو جیهانەدا نەبوو، پتر لەم بزانێت، تا شتێکی لێ فێرببێت، ئەو شتانەی کە لە دوکانەکەی باڵدینشدا هەبوون، بەشی ئەوەیان نەدەکرد و هی ئەوە نەبوون، کە بتوانێت ئەو عەترە مەزن و گەورەی لە ئەندێشەیدا بوو، پێیان دروستبکات. ئەو بۆنانەی کە ئەو لای باڵدین دروستی دەکردن، لای ئەو گەمەی منداڵان بوون، لە چاو ئەو بۆنانەی کە ئەو لە ناخی خۆیدا هەڵیگرتبوون و، بیری لەوە دەکردەوە، رۆژێک لە رۆژان بیانهێنێتە بەرهەم. بۆ ئەمەش ئەو دەیزانی، کە پێویستی بە دوو مەرج هەیە: یەکەمیان وەک هاونیشتمانییەکی ئاسایی تەماشابکرێت، هەر نا وەک پیشەگەرێک، کە بتوانێت بەم رێگایە بکەوێتە دوای حەز و ئارەزووەکانی و چێژیان لێ وەربگرێت و، بێ سەرئێشە بکەوێتە دوای ئامانجەکانی. ئەوەی تریش فێری ئەوە ببێت، فێری ئەو ئەزموونە پیشەییە ببێت، کە بتوانێت خۆی مادده بۆندارەکان بەرهەمبێنێ، جیایان بکاتەوە، چڕیان بکات، بەرزەفتییان بکات و لە شوشەیان بکات و بیانپارێزێت، ئەوجا بتوانێت بەشی بەکارهێنانیشیان لێ دروستبکات. چونکە لەگەڵ ئەوەی کە گرێنوی بەڕاستی خاوەنی باشترین لووتی جیهان بوو، هەر بە بۆنکردن دەیتوانی هەموو بۆن و عەترەکان شێ بکاتەوەو بیانهێنێتە بەرچاوی ئەندێشەی خۆی، بەڵام توانای ئەوەی نەبوو، بەسەر ئەو بۆنانەدا زاڵ ببێت و وەک کەرەسەکانی تر بیانخاتە بەردەستی خۆی.

## ١٨

بەو جۆرە بە ئیرادەی خۆی ملی نایە فێربوونی هونەرەکانی دروستکردنی سابوون لە بەزی بەراز، دەستەوانە لە چەرمی نەرم، پۆدرەگرتنەوە لە ئاردی گەنم و هاڕاوەی کەپەکی بادام و ڕەگی گوڵەوەنەوشە. مۆمی بۆندار لە خەلووز و شۆرەو داری سەندەڵ. هەرواش شەکرۆکەی ڕۆژهەڵاتی لە مایرەو بەنزۆل و هاڕاوەی کارەب سازدەکرد، دەنکەبخووری لە تێکشێلانی بخوور و چەسپی درەخت و گیابەن و دارچین دادەڕشت. هاڕاوەی پەڵکی گوڵەنەسرین و لالەو تەلاشی داری کاسکاریلای دەبێژت و پۆدرەی ئیمپریالی لێ سازدەکرد، دەرمانەکانی ئارایشتی تێکەڵیەکتری دەکرد، ڕەنگی سپی، شین، قەڵەمی سووراوی لێوی لێ دروستدەکردن. بۆیەی نینۆک و سپیاوی ددانی دروستدەکردن، کە بۆنی دارچینیان لێ دەهات. گولاوی تایبەت بۆ بارۆکەو، قەترەی دژی بالووکەو، دەرمانی دژی لەکەی پێست و، دەرمانی ئارایشتی چاو، کرێم بۆ پیاوان، بۆ ژنان... هەرچی جۆر ئاو و پۆدرەو کۆلۆنیاو دەرمانی جوانکاری و ئارایشت هەبوو، دروستی دەکردن، هەوەهاش چای بۆندار و بەهارات و خۆشاو و دۆشاو و مورەبباو تورشی، بە کورتی هەرچی باڵدین لە ئاکامی ئەزموونی دەوڵەمەندی خۆیدا فێری بوو، ئەویش فێری دەبوو، بێ ئەوەی کە بەرژەوەندییەکی تایبەتی لەو شتانەدا هەبێت، بێ دەنگ و بێ گلەیی، تێیاندا سەرکەوتوو دەبوو.

بەڵام بە مەراقێکی تایبەتی ئەو کارانەی ڕادەپەڕاند، کە پەیوەندییان بە دروستکردنی ڕەنگاو و ئاو و شیر و پێکهاتەی بۆنەکان هەبوو. دەیتوانی بێ ماندووبوون ناوکە باوی تاڵ بە پەستەری پێچدار بپلیشێنتەوە، دەنکە میسک بهاڕێت، سەرکە عەنبەری بۆر و چەور بە چەقۆی لانکیی بکاتە قیمە، یان ڕەگی گوڵە وەنەوشە لە ڕەندە بدات، پاشان تلیشەکانی لە کهوولێکی پاراودا بنمێنێت. فێری بەکارهێنانی کوفکی پالاوتن بوو، فێربوو چۆن ڕۆنی توێکڵی گوشراوی لیمۆ لە

خڵتاوەکەی جیادەکاتەوە. شارەزای وشککردنەوەی گیاکەڵەکان و گوڵەکان بوو لەسەر حەسیر و لە بەر سێبەری گەرم، هەروەها پاراستنی چرۆ و گەڵا لە مەنجەڵ و باولی سەر بە شەمێ. فێری هونەرەکانی شووشتنی کرێمەکان، دڵۆپاندن، پاڕزنین، هەروەهاش چڕاندن بوو، بۆ پاراوکردن و پالاوتن. بێ گومان کارگەکەی باڵدین بۆ ئەوە نەدەگونجا کە بە بڕی زۆر رۆنی گوڵ و گیاکەڵەکانی تێدا بەرهەمبهێنرێت. لە شاری پاریسیش گوڵ و گیاکەڵەکان بە بڕی پێویست دەستنەدەکەوتن. بەڵام ئەگەر هەندێ جار، گوڵەشەونمەی دەریا، نەعناع، پونگ، کونجی، رازیانە لە بازاڕ هەرزان دەستبکەوتبان، یان ئەگەر بە بڕێکی زۆر سەوسەن و ناردینی رۆمی، زیرە، گوێزبۆ، یان گوڵەمێخەکی وشک، بهاتبا بازاڕ، ئەوا دەمارە عەتریەکانی باڵدین دەجووڵانەوەو مەنجەڵە گەورەکەی دڵۆپاندنی دەهێنا، کە مەنجەڵێکی گەورەی مس بوو، قەپاغێکی گەوری دڵۆپاندنی لەسەربوو، ئەوەی بە "مەنجەڵی ماورێنی" ناودەبرد، هەمیشە بە شانازییەوە باسی ئەوەی دەکرد، کە چۆن چل ساڵ لەمەوبەر، بەو مەنجەڵە لە دامێنەکانی خوارووی لیگورین و لە بەرزاییەکانی لوبێرۆن، لە ناو کێڵگە ئازادەکاندا گوڵەخەزێمەی دڵۆپاندووە. لە کاتێکدا گرێنوی گیاو گوڵەکانی ورد دەکردن، باڵدین بە پەلەو تەنگەتاوی ـــچونکە لای ئەو خێرایی ئەلفوبێی هەموو کارێک بووـــ ئاگردانە بە دیواردەورگیراوەکەی، گەرم دەکرد و مەنجەڵە مسینەکەی پڕ دەکرد لە ئاو. ڕووەکەکانی تێدا رووەدەکرد و قەپاغە دووچینییە ماورێنیەکەی دەخستە سەرو دوو سۆندەی هاتووچوونی ئاوی لێ قایم دەکرد. ئەو سیستەمە رێکوپێکەی ساردکردنەوە، بە قسەی خۆی، خۆی بۆ ئامێرەکەی دروستکردبوو، چونکە کاتی خۆی، ئەو سەردەمانەی کە لە کێڵگەکاندا بەکاری هێناوە، وەک شتێکی ئاسایی تەنها بە تەوژمی با ساردکراوەتەوە.

ئاگرەکەی هەڵایساند. هێدی هێدی بە بڵقەبڵق مەنجەڵەکە کەوتە کوڵان، دوای ماوەیەک وردە دڵۆپە بە لوولەی سۆندەی هاتنەدەر و ئاوێزەیان بەست، پاشان دڵۆپەکان بوون بە دەزوولە ئاو و چۆڕاوکەیان بەست، لە بۆڕی سێیەمی قەپاغە ماورێنییەکە شلەدڵۆپێنراوەکە دەرژایە ناو کەموولەی کۆکردنەوەکە، کە باڵدین خستبوویە ژێرەوە. لەسەرەتادا شلە دڵۆپێنراوەکە زۆر نەدەکەوتە بەرچاو، وەک شلەیەکی تەنکی لێڵ دەردەکەوت، پاشان وردە وردە، بە تایبەت دوای ئەوەی شووشەکە پڕ بوو، لابراو بە ئارامی خرایە لاوە، شووشەیەکی تر خرایە شوێنی، شلەکە بوو بە دوو چینی لێکتر جیا: ئاوی گوڵاو و گیاکەڵەکان وەک چینێک کەوتنە ژێرەوە، سەرەوەش چینێکی ئەستوورو کەفاوی رۆن. بە شێرەی ژێرەوەی کەموولەی کۆکردنەوەکە زۆر لەسەرخۆ و بە

ئاگایی گوڵاوە بۆندارەکەی ژێرەوەی جیاکردەوە، بەو جۆرە تەنها رۆنێکی پاراو لە ناو کەموولەکە مایەوە، ئەوەش ماکی پاراوی عەتر بوو، کە پێکنەری بنچینەیی بۆنی رووەکەکان بوو.

ئەو کارە زۆر سەرنجی گرێنوی راکێشابوو، ئەوە شتهاییێکی ژیان بوو، کە هەندێک حەماسەتی ئەوی وروژاندبوو، بەڵام بێ گومان لەدەرەوە ئەمەی پێوە دیار نەبوو، بەڵکو حەماسەتێکی شاراوە بوو، وەک بڵێسەیکی ساردی ناو حەماسەتێکی گڕگرتوو، پاشان ئەو کارە، کە بە ئاگر و ئاو و هەڵمو ئامێرێکی ساردکەرەوە، رۆحی بۆنداری ئەو گوڵ و گیاکەڵانەیان دادەکەلاند، ئەو رۆحە بۆندارە، رۆنی ئێتیری، کە ماکی بنچینەیی و باشترین پێکنەری پێکهاتەکانیان بوو، تاکە پێکنەر بوو، کە ببوو بە هۆی ئەوەی ئەو بایەخییان پێ بدات. ئیتر پاشماوە بێ ماناکانی تریان: گوڵەکانیان، گەڵاکانیان، توێکڵەکانیان، بەرەکانیان، رەنگەکانیان، جوانییەکانیان، گەشاوەییان، زیندوویيان و هەموو ئەو سیمایانەی تریان، لای ئەو بێ بایەخ بوون و خۆی پێوە خەریک نەدەکردن. ئەوانە لە دیدی ئەو هەمووی هەر بەرگ و بار بوون، هی نەمان و لە ناوچوون بوون. ناوە ناوە، کە دڵۆپێنراوەکە وەک ئاو ساف دەبوو، مەنجەڵەکەیان لەسەر ئاگر لادەبرد، دەیانکردەوە، ئەنجناوە کوڵاوەکەی ناویان ڕوو دەکرد، کە وەک کایێکی خووساوەو بۆگەن، قێزەون و زەرد بوو، چونکە ئەوەندە کوڵابوو، بێ تام، ریشاڵ ریشاڵ، وەک قوڕ، زۆر بە زەحمەت دەناسرانەوە، قێزەون، چونکە تەواوی بۆنەکانیان لێ سەندرابوو. لە پەنجەرەوە ئەو پاشەرۆکەیان فڕێ دەدایە ناو رووبارەکە. ئەوجا چێنێکی نوێ رووەکی تازەیان تێ دەکرد، پڕیان دەکرد لە ئاو و مەنجەڵەکەیان دەخستەوە سەر ئاگر. دیسان مەنجەڵە بۆرە دەستی دەکردەوە بە بڵقەبڵق، دیسان شیلەی رۆحی رووەکەکان دەچۆڕایەوە ناو کەمووڵەی دڵۆپێنراوەکە. زۆرجاران بەو جۆرە تەواوی شەویان بەسەر دەبرد. باڵدین ئاگای لە ئاگرەکە دەبوو، گرێنوی ئاگای لە شووشەکان دەبوو، ئیتر کارێکی تریان نەبوو.هەردووکیان لەدەوری ئاگرەکە لەسەر کوڤل دادەنیشتن، وەک یەک لە تەماشای ئەو مەنجەڵەدا بە مەراقەوە رادەمان و ئەندێشە دەیبردنەوە، هەرچەندە سۆنگەی رامان و ئەندێشەکانیان زۆر لە یەکتری جودا بوون. باڵدین چێژی لە تەماشای پەنگری گەش و سووریی مەشخەڵی ئاگرەکەو مەنجەڵە مسینەکە، وەردەگرت، حەزی لە قرچەقرچی سووتانی دار و، بڵق و هۆڕی کوڵانی شۆربای ناو مەنجەڵەکە بوو، چونکە ئەوە رابردووی دەهێنایەوە بەرچاو. لەوانەبوو پیاو تووشی حەماسەت بکات!

چووه ناو فرۆشگاکەی شووشەیەک شەرابی هێنا، چونکە گەرماکە تێنووی کردبوو، ئەوەش هەروەکوو سەردەمی رابردووی بوو. ئەوجا دەستی کرد بە گێڕانەوەی چیرۆک و رووداوەکان، ئەوانەی ئەوان سەردەمان، ئیتر ئەو چیرۆکانە بێ کۆتایی بوون. سەربوردەی جەنگی پاشەمیراتی ئیسپانیی دژی نەمساوییەکانی دەگێڕایەوە، گوایە خۆی تێیدا بەشداری کردووە، هەروەها لەگەڵ کامیساردەکان، کە چۆن کێڤنیەکانی تووشی دڵەڕاوکێ کرد، باسی کچی پرۆتستانتێک، لە ئێستریل، کە چون بە بۆنی عەترو گوڵاو بۆلای خۆی هەڵیفراندبوو، باسی سووتانی دارستانێک، کە چۆن موویێکی مابوو، تیابچێت، بەو ئاگرەی کە بە هۆی هەڵکردنی بایەک، کە لە هەموو لاوە هەڵی کردبوو، تەواوی هەرێمەکەی سووتاندبوو. باسی کارەکانی دڵۆپاندنی گوڵ و گیاکەڵەکانی دەگێڕایەوە، هەمیشە دەهاتەوە سەر مێرگ و کێڵگە ئازادەکان، کە کاری تێدا کردوون، بە شەویش لەبەر رۆناکی مانگەشەو، چۆن شەرابی لەگەڵدا خواردۆتەوەو گوێی داوەتە ویزەویزی کوللەو سیرسیرەکانی شەو، هەروەها باسی عەترێکی دەکرد کە لە گوڵەخەزێمە بەرهەمی هێنابوو، کە بۆنێکی هێندە پاراو و بەهێزی هەبووە، کە خەڵک بە زیو دەیانکێشا، باسی سەردەمی چوونە قوتابخانەی لە شاری گێنووادا دەکرد، باسی ساڵەکانی گەڕان و سووڕانی بە شاری گراسدا، ئەو شارەی کە پڕە لە عەترساز و عەترخانە، بە قەد پێڵاودرووی شوێنەکانی تر، باسی دەوڵەمەندە زۆرەکانی، کە هەموو وەک پاشایان دەژیان، خانووی قەشەنگ و رازاوە بە سێبەری باخچەو هەیوانەکانیان، بە ژووری نانخواردنیان کە پڕ بوون لە مێزو کورسی دار، کە خواردنیان لەسەردا لە ناو قاپی فەخفووری و کەوچک و چەنگاڵ و چەقۆی زێڕین دەخوارد، ئیتر بەو شێوەیە...

پیرە باڵدین ئەو چیرۆکانەی دەگێڕایەوەو شەرابی لەگەڵدا نۆش دەکردن، بەو شەرابەو و بە گڕی ئاگرەکەو بەو حەماسەتەی کە دەیگرت، گوپەکانی وەک ئاگر سوور هەڵدەگەڕان. بەڵام گرێنوی، کە شوێنی دانیشتنەکەی پتر کەوتبووە بەر سێبەر، گوێی لە هیچ نەبوو. چونکە ئەو چیرۆکە دێرینانە لای ئەو بایەخێکیان نەبوو، تەنها رووداوە نوێکان لای ئەو گرنگ بوون. ئەو بەردەوام چاوی بەرامبەر لوولە بچووکەکەی سەرپۆشەکە لە ئەبڵەق مابوو، کە کەوتبووە بەر شەوقی کزی مەنجەڵەکە. تێی ڕادەماو بیری لەوە دەکردەوە، ئەگەر بێت و خودی خۆی ببوایە بە مەنجەڵێکی دڵۆپاندنی ئاوا، دەروونی وەک دەروونی ئەو مەنجەڵە بڵق و هۆڕ بکوڵابایە، وەکو ئێرە دڵۆپێندرابایە، بەڵام باشتر، نوێتر، نائاسایی تر، دڵۆپاندنێک لە ڕووەکە نایاب و تایبەتییەکان، ئەوەی کە خۆی لە دەروونی خۆیدا دەیانچنێت، ئەوانەی لە هەناوی خۆیدا رواون و گەشەیان کردووەو، جگە لەخۆی کەس بۆنی نەکردوون، لەو رووەکانە باشترین و بێ نموونەترین عەتری

دنیا دێتە بەرهەم، ئەو عەترەی بە بۆنی خۆی دەتوانێت جیهان بکاتە بەهەشتی عەدەن. لەو بەهەشتەدا تا ڕادەیەک ئەو دەتوانێت بە هۆی بۆنەکان بەرگەی بوونی خۆی بگرێت. مەنجەڵێکی زۆر زەبەلاح بێت، کە بە عەتری دڵۆپێنراوی خۆت تەواوی دنیا لەخۆتدا نقووم بکەیت. ئەو خەونە پڕ ئارەزووە بوو، کە گرێنوی تێیدا نقووم بووبوو.

لە کاتێکدا باڵدین بە شەراب گڕی گرتبوو، بێ پەرواو مەستانە، بە گەرمی بەسەرهاتەکانی دەگێڕایەوە، هی سەردەمانی زوو، جار لە جار پتر و بێ پەرواتر بۆ ناوەخۆی هەڵدەچوو، گرێنوی لە ناو ئەندێشە سەیر و عەنتیکەکانی خۆیدا تووابووەوە. جارێ ئەندێشەی مەنجەڵە فەلامەرزەکەی لە سەری خۆی دوورخستەوەو، لە جیاتی ئەوە بیری لەوە کردەوە، کە ئایا چۆن دەتوانێت ئەو شتانەی کە بەم دواییە فێری ببوو، بۆ ئامانجە نزیکەکانی خۆی بەکاریانبهێنێت.

## ١٩

زۆری نەبرد، گرێنوی بوو بە پسپۆڕێکی دڵۆپاندن. بەهۆی یارمەتی لووتە هەستیيارەکەی، لە رێساکەی باڵدینی تێپەڕاند، باڵدین پێی وا بوو، پلەی گەرمایی ئاگر، کاریگەری سەرەکی لەسەر باشی بەرهەمە دڵۆپێنراوەکان هەیە، بەڵام گرێنوی زانیاری نوێی دەستکەوت، هەر رووەکێک، هەر گوڵێک، هەر دارێک، هەر رۆنێک، پرۆسەی تایبەتی خۆی پێویستە. هەندێکیان پێویستییان بە هەڵماندنێکی خێراو بە هێزە، هەندێکییان پێویستییان بە کوڵاندنێکی مام ناوەندییە، هەندێکیشییان، ئەو کاتە باشترین بەرهەمی خۆیان پێشکەش دەکەن، ئەگەر بخرێنە سەر چرایێکی کز و لێیان گەڕێیت تا لە ناوخۆیاندا ئارەق دەکەن.

هەروەهاش ئامادەکردنییان زۆر گرنگە. دارچین و گوڵەخەزێمە دەتوانرێت بە هەموو پنچکەکانیانەوە بدڵۆپێندرین. لە کاتێکدا هەندێکییان پێویست بەوە دەکەن کە بە پاراوی و بە ئاگاییيەوە بچنرێن، بژاربکرێن، بئەنجندرێن، تەنانەت هەندێکییان پێویستە بەر لەوەی بخرێنە ناو مەنجەڵ، وەک تێچینە لەناو یەکتری بتلێنەوە. هەندێکێشیان هەر نادڵۆپێندرێن، ئەوەشییان لای گرێنوی لە هەمووان دژوارتر بوو.

کاتێک باڵدین دیتی، گرێنوی زۆر شارەزای ئامێرەکان بووەو بەسەریاندا زاڵەو دەتوانێت بە باشی و بە ڕێکی بەکاریان بهێنێت، ئیتر دامودەزگاکەی خستە ژێردەستی و بە ئازادی خۆی بەکاری دەهێنان. بە رۆژ گرێنوی خەریکی تێکەڵکردنی عەتر و بۆن و بەرهەمە بەهاراتییەکان دەبوو، بە شەویش خۆی بە هونەری پڕ لە راز و نهێنی هەڵماندن و دڵۆپاندن خەریک دەکرد. نەخشەی ئەوەی کێشابوو، کە بۆنی تەواو نوێ بهێنێتە بەرهەم، هەر نا بەلای کەم بتوانێت هەندێک لەو بۆنانەی کە لەدەرروونی خۆیدا حەشاری داون، بهێنێتە بەرهەم. سەرەتا هەندێک سەرکەوتنی بچووکی بەدەستهێنا. توانی رۆنی گەزگەزۆک و تەڕەتیزە بهێنتە بەرهەم، هەروەهاش ئاوکێک لە توێکڵی تازەی بەلەسان و لقی داری سەروو. هەرچەندە ئەو دڵۆپێندراوانە زۆر کەم بۆ ئەوە دەبوون بکرێن بە ماددەکانی دروستکردنی عەتر، بەڵام بایەخی باشیشیان هەبوو،

بۆ ئەوەی کە هێشتان کاریان لەسەر بکرێت. لە تاقیکردنەوەی هەندێ ماددەش هیچ جۆرە سەرکەوتنێکی بەدەستنەدەهێنا. بۆ نموونە گرێنوی هەوڵی دەدا شووشە بدڵۆپێنێت و بۆنەکەی وەربگرێت، بۆنی شووشەی لووسی لە قوڕ دروستکراو، ئەو بۆنەی مرۆڤی ئاسایی هەستی پێ ناکات. شووشەی پەنجەرەو بتلە شووشەی دەهێناو پارچە پارچەی دەکردن و دەیهاڕین، بەڵام کەمترین سەرکەوتنی بەدەستنەدەهێنا. هەوڵی دڵۆپاندنی سفر، فەخفووری، پێست، بەردە مردەو بەردە زیخیی دەدا. خۆڵی رووتی دەدڵۆپاند، قڕی خۆی دەدڵۆپاند. تەنانەت ئاوی رووتیش، ئاوی رووباری ساین، کە لای ئەو گرنگ بوو، بتوانێت بۆنەکەی هەڵبهێنجێت و بیپارێزێت. ئەو وای دەزانی، وەکو سیر و گوڵە خەزێمەو تۆی زیرە، دەتوانێت بە هەڵماندن و دڵۆپاندن بۆنی تایبەتی ئەو ماددانەش بدۆشێت و بیانپارێزێت. ئەو نەیدەزانی کە دڵۆپاندن کارێکی پتر نیە لە لێککردنەوەو لێکجوداکردنەوەی ماددە تێکەڵەکان، بە پێی پلەی بە هەڵمبوونیان، بۆ وەرگرتنی عەترەکانییان، بە جیاکردنەوەی رۆنە عەترییەکانیان لە بەشە بێ بۆن و کەم بۆنەکانیان. بۆیەشە ئەو ماددانەی رۆنی ئێترییان دەبەخشی، هەڵماندن و دڵۆپاندنیان شتێکی ماقووڵ بوو. ئێمەی مرۆڤی ئەمڕۆ، ئەوانەی فێری فیزیا بووین، یەکسەر لەو مەسەلە دەگەین. بەڵام لای گرێنوی ئەو هەویرە ئاوی زۆر کێشا، تا گرێنوی شارەزای ئەو زانستە بوو، چەندین تاقیکردنەوەی بێ ئاکامی بڕی. بە درێژایی چەندین مانگ، هەموو شەوێک بەدیار مەنجەڵی دڵۆپاندن دادەنیشت، هەرچی و هەر رێگەیەک بە خەیاڵی دادەهات تاقی دەکردەوە، تا بە رێگای دڵۆپاندن بۆنی نوێ بخولقێنێت، دۆشاوی ئەو بۆنانەی کە هێشتان رووی زەوی بەخۆیەوە نەیدیوە. بەڵام جگە لە چەند رۆنێکی سادەی رووەکی، چیتری دەستنەکەوت. لە قوڵایی بیری بۆنەکانی ناو ئەندێشەی خۆیدا نەیتوانی تنۆکێکیش پێکنەرەبۆن، لەو بۆنانەی لە ئاسمانی خەیاڵیدا بوون، بهێنێتە ئارا، تەنانەت نەیتوانی تاکە ئەتۆمێکیش بئافرێنێ. کە تێگەیشت ناگاتە هیچ ئەنجامێک، وازی لە ئەزمایشەکانی خۆی هێناو، زۆر بە سەختی نەخۆش کەوت و کەوتە خەتەری مەرگ.

## ٢٠

تایێکی گەرم دایگرتبوو، لە رۆژانی سەرەتاو دواتریش ئارەقەیەکی ئەوەندە زۆری دەکرد، دەتگوت کونۆچکەکانی پێستی پێ ڕاناگەن ئەم هەموو ئەرەقە دەربکەن، پفکەیەکی سووری بێ ژمار تەواوی جەستەی داپۆشی. زۆر لەو پفکانە دەتەقین، خیزاوێکی سپییان دەردەکرد و، هی نوێ دەهاتنە جێگەیان. هەندێک لەو پفکانە هەڵدەئاوسان و دەبوون بە کوانی گەورە گەورە، سوور هەڵدەگەڕان، پاشان وەک بورکان دەتەقین کێم و ئادابێکی چڕ و خوێناوێکی زەردی لینجیان لێ دەهاتە دەرەوە. ئەوەندەی پێ نەچوو، گرێنوی وەک شەهیدێک دەهاتە بەرچاو، کە لە ناوەوەڕا بەردباران کرابێت و سەدان جێگەی کونبەدەرکرابێت.

بێگومان باڵدین خەمی کەتبووە بەر. ئەوە شتێکی گونجاو نەبوو بۆ ئەو، ئەو شاگردە بە نرخەی لەدەستبچێت، بە تایبەت لە کاتێکدا خەریک بوو بازرگانییەکەی دەبوژایەوەو سنوورەکانی پێتەخت و، بگرە هەموو وڵاتی دەگرتەوە. جا بەڕاستی رۆژ دوای رۆژ پتر داخوازیکەری عەترە نوێکانی، نەک هەر لە سنووری پارێزگاکەی، بەڵکو لە کۆشکە بیانییەکانیشەوە دەهاتن، ئەو عەترانە کە پاریسیان هێنابووە جۆش و خرۆش، پاریس بۆیان شێت ببوو. باڵدین بیری لەوە دەکردەوە، بۆ ئەوەی بتوانێت وەڵامی ئەم هەموو داخوازیانە بداتەوە، لقێکی فرۆشگاکەی و کارگەیەکی بچووکی گونجاو لە فۆبۆخ سانت ئەنتوان بکاتەوە. ، هەر لەوێوە شووشۆلەی جوان و خنجیلانە، بە دەست و پەنجەی کیژی شەنگ و نەشمیل، پڕ بکرێن لە تێکەڵەی بۆنەکان و بپێچرێنەوە، ئەوجا بنێردرێن بۆ هۆڵەندا، ئینگلستان، هەروەها بۆ ئیمبراتۆریەتی ئەلمانی. ئەوە بۆ وەستایێک کە کارگەکەی لە پاریس بێت، کارێکی ئاوا زۆر ئاسایی و یاسایی نەبوو، بەڵام باڵدین، بەم دواییە بە هۆی عەترە نایابەکانی، مۆڵەتی کارکردنی بۆ سنوورێکی بەرفراوان وەرگرتبوو، ئەو مۆڵەتی نەک هەر لە چاودێرە بەرپرسەکان وەرگرتبوو، بەڵکو مۆڵەتی تایبەتی لە لایەن کەسایەتییە گرنگەکانەوە پێ درابوو، وەک جەنابی سەرۆکی باجگرانی پاریس، هەروەها ئەندامێکی دەزگای دارایی پاشایەتیی، هەروەها لە لایەن چەند کەسایەتییەک لە دەستەی

کۆمەککار و بەلێندەرانی برەودانی ئابووری، وەک جەنابی فیدۆ دۆ برۆ. تەنانەت ئەوەیان هەرێی ئەوەی پێ دابوو، کە ئیمتیازی پاشایەتی بۆ وەربگرێت، دیارە شتێکی لەمە باشتر نەبوو، ئەو ئارەزووی بکات، ئەو ئیمتیازە وەک پەساپۆرتیک بوو، کە دەیتوانی خۆی پێ لە تەواوی دامودەزگاو نوێنەرایەتییەکانی دەوڵەت بپەڕێنێتەوەو، ئیتر هیچ خەم و کۆسپێک لە رێگای بازرگانیکردنەکەیدا نەدەماو، دەبوو بە دڵنیایی و مسۆگەرییەک بۆ ئاسوودەیی ژیانی.

کەڵکەلەی نەخشەیەکی تریش کەوتبووە سەری باڵدین، نەخشەیەکی زۆر گرنگ، نەخشەی جۆرە پرۆژەیەک بەرامبەر پرۆژەکەی کارگەی فۆبۆخ سانت ئەنتوان، بەڵام تایبەت بۆ بەرهەمهێنانی ئەو کەلوپەل و عەترانەی کە بە هەموو کەس نەدەکڕدران: نیازی ئەوەی هەبوو، کە بۆ دەستەیەکی بژاردەی موشتەریەکانی، بۆ کڕیارە پایە بڵندەکان، عەتری تایبەت بهێنێتە بەرهەم، راستتر، وا بکات کە بهێنرێنە بەرهەم، وەک جلوبەرگی بڕدراو و بە ڕاداندراو، عەتری تایبەت و گونجاو بۆ کەسانی تایبەت، واتە تەنها ئەو کەسە بۆی هەبێت ئەو عەترە بەکاربهێنێت و ناوی بەڕێزیان لەسەر عەترەکە نووسرا بێت. بۆ نموونە، بیری لە عەتری "مارکیز سێرنی" کردبووەوە، یان عەتری "ماریشال دو ڤیلاخ"، یان عەتری "دۆق دێ گیۆ" هەروەها هی تریش. خەونی بە عەترێک دەدیت بە ناوی "عەتری مادام لا مارکیز دێ پومپەدۆخ"، تەنانەت بە عەتریکیش بە ناوی عەتری "ماژیستی لۆ خوا" لە شووشەیەکی لووس و خنجیلەی ناسک، کە پشتێنەیەکی زێڕ کرابێتە کەمەرەی و لە ڕووی ناوەوەی بنکەکەشی بە شاراوەیی و بە هەڵکۆڵدراوی نووسرابێت "عەترساز جۆزێف باڵدین". ناوی پاشاو ناوی خۆی بە هەمان ماددەو بە هەمان شێوە دەنووسی. باڵدین کەڵکەڵەی ئەو بیر و ئەندێشە بەرزەفڕانەی کەوتبووە سەری! لەو دەمەشدا گرێنوی نەخۆش کەوتبوو. گریمال، خوای لێ خۆش بێت، خۆ سوێندی خواردبوو، کە ئەو کوڕە لە هیچی کەم نیە، بەرگەی هەموو شتێک دەگرێت، تەنانەت بەرگەی تاعونی رەشیش دەگرێت. جا بەڕاستیش هیچی نەبوو، دەرد لە من بێت لەو نەبوو، لە کاوڕا وا هاتە سەر رۆخی مەرگ. ئەگەر ئەو کوڕە بمرێت؟ ئەوە کارەساتێکە! چونکە بە مردنی ئەو، نەخشە گرنگەکانی کارگەکانی، کیژە شەنگ و نەشمیلەکان، عەترە تایبەت و نایابەکانی پاشا، هەموو بە جارێک دەمرن و دەبن بە بڵقی سەرئاو.

بۆیە باڵدین بڕیاری دا، هەموو هەوڵێک بدات، بۆ ئەوەی ژیانی گرانبەهای شاگردەکەی رزگار بکات. نەیهێشت چیتر لەسەر تەختی ناو کارگەکە بمێنێتەوە، گواستییەوە بۆ سەر تەختێکی خاوێن لە نهۆمی سەرەوەی خانووەکە. دۆشەگەکەی بە چەرچەفێکی نەرمی شامی داپۆشرا بوو. بە دەستی خۆی یارمەتی گواستنەوەی نەخۆشەکەی دا، کە بە پلیکانە تەسکەکە بەرەو سەرەوەیان برد،

فەرمانی دا، ژنەکەی چەلاوی مریشکی بە شەراب بۆ لێبنێت. ناردی بە دوای پرۆکۆپ، باشترین پزیشکی گەڕەکەکە، کە دەبووایە پێشەکی پارەی بدەنێ، بیست فرانک! بۆ ئەوەی زەحمەتی هاتن بداتە بەرخۆی. پزیشکەکە هاتە سەری، بە سەری پەنجەکانی لێفەکەی لەسەر لادا، تەماشاییێکی جەستەی گرێنوی کرد، کە بەڕاستی وا دەهاتە بەرچاو، وەک ئەوەی بە سەد گوللە کون بەدەر کرابێت، ژوورەکەی بەجێهێشت، بێ ئەوەی جانتا پزیشکییەکەی بکاتەوە، کە هەمیشە بەردەستەکەی  بە دواییەوە، بۆی هەڵگرتبوو. دەستی کرد نەخۆشییەکەی گرێنوی بۆ باڵدین رۆن بکاتەوە: "نەخۆشییەکەی زۆر ئاشکرایە، بریتییە لە نەخۆشی فەرەنگی، جۆری لاڕەشە، تیکەڵ بە سورێژەی کێمکردوو، نەخۆشییەکەی گەیشتۆتە قۆناغی دوایی، بۆیەشە ئیتر پێویستی بە چارەسەر نیە، چونکە ناتوانرێت ئامێری خوێنبەردان لەو جەستە رزیو و تلاوە گیربکرێت، ئەوە پتر جەستەیەکی مردووە، نەک ئۆرگانێکی زیندوو، بەهێچ شێوەیەک ناتوانرێت دەستی لێ بدرێت. هەرچەندە هێشتان بۆگەنی نەکردووە، ئەو بۆگەنییەی کە مۆرکی دواقۆناغی ئەو جۆرە نەخۆشییەیە، ئەوەش ئەگەر بە چاوی زانست تەماشای بکەین، جێگەی سەرسوڕمانە، جا هیچ گومانێک لەوەدا نیە، کە لە چلوهەشت سەعاتی داهاتوو، دەمرێت، هەروەک چۆن گومان لەوەدانیە، کە من ناوم دختۆر پرۆکۆپ." جا بیست فرانک هەقی هاتنی و پێنج فرانکیشی بۆ دەستنیشانکردنی نەخۆشییەکەی وەرگرت، بەڵام ئەوەشی روونکردەوە، کە ئەو پێنج فرانکەی دووابیان دەداتەوە، ئەگەر لاشەی مردووەکەی بدەنێ، بۆ ئەوەی لێکۆلینەوەی پزیشکی لەسەر بکات. ئەمەی گوت و خوداحافیزی کرد. باڵدین ئاگای لەخۆی نەما بوو. لە حەژمەتان گلەیی لە چارەنووسی خۆی دەکردو هاواری دەکرد. لە تووڕەییان خەریک بوو پەنجەکانی خۆی دەکرۆشت. جارێکی تریش نەخشەکانی بۆ سەرکەوتنێکی زۆر زۆر گەورە، کەمێک بەر لەوەی بگاتە ئامانج، هەڵوەشاندەوە. کاتی خۆی پلیسیێ و شاگردە پیسکەکانی، سەبارەت بە داهێنانە زۆروزەوەندەکانیان ببوونە هۆی سەرنەکەوتنی، ئەمرۆش ئەو کوڕەو بەهرەی لەبننەهاتووی بۆ دۆزینەوەی بۆنەکان، ئەو کوڕیژگە چەپەڵە، کە بە زێڕ نەدەکێشرا، لە زێدە هەموو وەختان، ئێستا، لە کاتی بووژانەوەی بازرگانییەکەی، هات تووشی فەرەنگی و لاڕەشەو سوریژەی کێمکردوو بوو، گەیشتۆتە قۆناغی دوایی، قۆناغی مەرگ! چ وەخت نەما ئێستا! بۆ دوو ساڵی تر نا؟ بۆ یەک ساڵی تر نا؟ تا ئەو کاتەش دەکرا وەک کانەزیوێک تێکبدرێت، یان وەک ئەو کەرەی لە جیاتی تەرس زێڕی دەردەدا. دوای ساڵێکی تر دەیتوانی بە نەوازش بتۆپێت. بەڵام نا! تازە مرد، ئاخ خودای ئاسمان، ئای لەو نەگبەتییە! ئاخ بۆ چلوهەشت دەمژمێری تر!

چرکەساتێکی کورت، باڵدین هاتە خەیاڵی، بچێ بۆ ئەو بەر، بۆ کڵێسای نۆتردام، مۆمێک دابگیرسێنێت و لە خودای گەورە بپاڕێتەوە کە گرێنوی بۆ چاک بکاتەوە. بەڵام وازی لەم ئەندێشە هێنا، چونکە کاتەکەی زۆر تەنگەتاو بوو. رایکرد مەرەکەب و کاغەزی هێناو ژنەکەی لە ژووری نەخۆش دەرکردە دەرەوە. خۆی پاسەوان بۆ نەخۆشەکە دەگرێت. ئەوجا لەسەر کورسییەک و لە تەنیشت تەختەکە دانیشت، کاغەزی تێبینییەکانی خستە سەر ئەژنۆکانی، خامە بە مەرەکەبە تەڕبووەکەی لەدەستگرتوو، هەوڵی دا، هەواڵی بۆنێک لە گرێنوی دابچۆڕێت. لە ڕاهی خوا، ئەو گەنجینەی کە لە هەناوی خۆی هەڵیگرتووە، خۆ هەمووی لەگەڵ خۆی نابات! بەڵکو خوا حەز بکات، ئێستا لە دوا سەعاتی ژیانی، وەسیەتێک بداتە ئەو دەستە ئەمینانە، بۆ ئەوەی لە دوای خۆیدا دنیا لە باشترین عەتری هەموو سەردەمەکان بێبەش بەجێنەهێڵێت! ئەو، باڵدین، ئەو وەسیەتە، ئەو قانوونی فۆرمی تەواوترین و باشترینی بۆنەکان، بە دەستپاکی بەکاردەهێنێت و پەرەیان پێ دەدا. ناوی گرێنوی بە نەمریی و جاویدانی دەپارێزێت، بەڵێ، ئەو لێرە سوێند بە هەموو شتە پیرۆزەکان دەخوات، باشترینی بۆنی پاشاکان، بەخۆی بخاتە ژێر پێی، لە شووشەیەکی کریستاڵی زێڕکەش، لێی هەڵکۆڵرابێت: "ئاغای جۆن پاتێست گرێنوی، عەترسازی پاریس" باڵدین وای گوت، یان باشتر وای لە بن گوێچکەی گرێنوی چرپاند. بە سوێندخواردن، بە پاڕانەوە، بە کلکەسووتێ، بێ وچان. بەڵام هەمووی بێ هوودە بوو. گرێنوی هیچی لێ هەڵنەدەچۆڕا جگە لە ئاو و زەلزەلەیەکی سپی رەنگ و کێمێکی خوێناوی. وەک لاڵێک لە سەر جێگە کەوتبوو، ئەو خیزاوە بێزەوەرەی لێ دەهاتە دەرەوە، بەڵام گەنجینەکانی نا، زانیارییەکانی نا، کەمترین فۆرمولەی بۆنێکیشی لێ نەدەهاتە دەرەوە. باڵدین دەیویست بیخنکێنێت، حەزی دەکرد لێی بدات، ئەوەندەی لێ بدات تا نهێنییە بە نرخەکانی لە جەستە مردووەکەیدا دەردەهێنێت. ئەوەی دەکرد، ئەگەر هاتبا ئومێدی سەرکەوتنی بەم کارە هەبووایە، یان ئەو کارە ئاوا بە زەقیی دژی باوەڕە مەسیحایەتیەکەی نەبووایە، واتە دژی خۆشەویستی بۆ مرۆڤەکانی تر.

بە شیرینترین ئاواز لە نووزە نووز و منگە منگی خۆی بەردەوام بوو، نەخۆشەکەی نەوازش دەکرد، بە پەڕۆی شێدار نێوچەوانی بە ئارەق تەڕبووی فێنک دەکردەوە، زامەکانی بۆ پاک دەکردەوە، کە دەتگوت کوانووی ئاگرن، ئەمەش ئازارێکی وەحشەتناک بوو بۆ گرێنوی، بە کەوچک شەرابی لە دەم دەکرد، تا زمانی بهێنێتە قسە، بە درێژایی شەو، بەڵام بێ سوود بوو. بەرە بەری بەیانی کۆڵی دا، بە داهێزراوی خۆی خستە ناو قەنەفەیەک لە بنەبانی ژوورەکە و کەوتە ڕامان. چیتر تووڕەییەکەی نەمابوو، ئەوە نەبێت کەوتبووە باری بێ هیواییەکی ئارامتر،

چاوی بەرامبەر جەستەی بچووک و مردووی گرێنوی لەسەر تەختەکە، لەو بەر، لە ئەبڵەق مابوو، نە دەیتوانی رزگاری بکات و نە بیرووتێنێتەوە، نە دەشیتوانی هیچ شتێکی بۆ خۆی لێ رزگار بکات، بە ناچاری و بێ دەسەڵات تەماشای رۆچوونی ئەو مرۆڤەی دەکرد، وەک چون ناخودایێک تەمەشای نقوومبوونی کەشتیەکەی بکات، کە تەواوی سامانی لەگەڵ کەشتییەکە نغرۆ ببێت.

لە ناکاوێک لێوەکانی ئەو نەخۆشە مردووە کرانەوە، بە دەنگێک، کە زۆر بە رۆشنی و تۆخی ئەوەی ئاشکرا دەکرد، کە ئەو ئاگاییێکی لەو مەرگ و ئاوابوونە نیە، دەستی کرد بە قسەکردن: "پێم بڵێن، بەرێز: هیچ رێگاییێکی تر هەیە جگە لە گوشین و دڵۆپاندن، کە بتوانرێت بە هۆیەوە بۆن لە جەستەیەک وەربگیرێت؟"

باڵدین بڕوای بە گوێچکەی خۆی نەکرد، وای زانی ئەوە دەنگێکە لە خەیاڵی خۆیەوە دێت، یان لە دونیاکەی ترەوە، وەک مەکینەیەک وەڵامی دایەوە: "بەڵێ، هەیە."

لەسەر جێگەکەیەوە کوڕە پرسی: "چ رێگاییێک؟". باڵدین چاوە خەستەکانی خۆی زەق کردەوە. گرێنوی بێ هیچ جووڵەیەک لە ناو جێگاکەی کەوتبوو. "ئایا ئەو مەیتە بوو قسەی کرد؟"

"چ رێگاییێک؟" دیسان گرێنوی پرسیاری کرد، ئەمجارەیان جووڵەی لێوەکانی سەرنجی باڵدینان راکێشا. "ئیتر ئەمە کۆتاییێتی" هاتە خەیاڵی باڵدین، "ئیتر دەچێتە ئەو دنیا، ئەوە هوڕێنەی تایە، یان هوڕێنەی سەرەمەرگە." هەستایەوە سەر پێیان، چووە ئەو بەر، لە تەختەکە نزیک کەوتەوە، خۆی چەماندەوە سەر نەخۆشەکە. نەخۆش چاوی کردبووەوە، کەمینگرانە تەماشای باڵدینی دەکرد، وەک تەماشای کاتی یەکەمین رووبەرووبوونەوەی لەگەڵ باڵدین.

"چ رێگاییێک؟" گرێنوی پرسی.

ئەوجا باڵدین ورەی هێنا بەرخۆی، حەزی نەکرد دوا ویستی کەسێکی سەر سەرەمەرگ رەت بکاتەوە، وەڵامی دایەوە: "سێ رێگا هەیە کوڕەکەم: "هەڵمژین بە گەرمی، هەلمژین بە چەوری، هەڵمژین بە ساردی. ئەمانە لە زۆر لایەنەوە کاری زۆرتر و وردتریان دەوێت لە دڵۆپاندن، تەنها بۆ بەرهەمهێنانی پاراوترینی هەموو بۆنەکان بەکاردەهێنرێن: عەتری یاسەمین، هی سۆرگوڵ، هی گوڵەنارنج."

"لە کوێ؟" گرێنوی پرسی. باڵدین وەڵامی دایەوە:

"لە باشوور، بە تایبەت لە شاری گراس." گرێنوی گوتی.

"باشە"

ئیتر چاوەکانی نوقاندەوە. باڵدین بە هێمنی خۆی راست کردەوە. زۆر خەمناک بوو. کاغەزی تێبینییەکانی کۆکردەوە کە تاکە رستەیەکیشی لەسەر نەنووسیبوون، پفێکی لە مۆمەکە کرد و کوژاندییەوە. دنیا رۆناک ببووەوە. هێندە ماندوو بوو، دەتگوت ساڵێکە نەنووستووە. لە دڵی خۆیدا بیری کردەوە، کە دەبووایە قەشەیەکی بهێنابایە سەر. پاشان بە دەستی راستی و بە خێرایی نیشانەیەکی خاچی کێشاو چووە دەرەوە.

بەڵام گرێنوی زۆر دوور بوو لە مردن. تەنها خەوێکی گرانی لێ کەوتبوو، خەونی قووڵی دەدیت، شلاوەکانی هەڵدەمژییەوە ناوەخۆی. پفکەکانی دەستییان بە وشکبوونەوە کردبوو، خیزاوەکان دەبوون بە قەتماغە، زامەکانی دەستییان بە سارێژبوون کردبوو. لە ماوەی هەفتەیەکدا هاتەوە سەرخۆی.

## ٢١

پێی خۆش بوو دەسبەجێ بەرەو باشوور بکەوێتە ڕێگا، بەرەو ئەو شوێنەی کە دەیتوانی تێیدا ڕێگا نوێکان فێر ببێت، ئەوانەی پیرەکە بۆی باس کردبوو. بەڵام بێگومان نەدەکرا بیر لەمە بکاتەوە. چونکە ئەو تەنها شاگردێک بوو و بەس، واتە ئەو هیچ نەبوو. خۆ ئەگەر ڕاستیت دەوێت –دوای ئەوەی خۆشحاڵییەکەی باڵدین بە بۆنەی چاکبوونەوەو هەستانەوەی گرێنوی باری ئاسایی خۆی وەرگرتەوە- باڵدین گوتی، ئەگەر ڕاستت دەوێت، گرێنوی لە هیچیش کەمترە، چونکە بۆ ئەوەی کەسێک بە شێوەیکی ڕێسایی بە شاگرد وەربگیرێت، پێویستە لە خێزانێکی بە شەرەف و بێ کەموکورتی هاتبێت، مەرجی گشتیش پلەی خزمایەتی و گرێبەستی فێربوونە، بەڵام ئەو خاوەنی هێچ یەکێک لەم مەرجانە نیە. ئەگەر ئەو، باڵدین، سەرەڕای ئەوەش، ڕۆژێک لە ڕۆژان دەستی یارمەتی بۆ درێژ بکات و بڕوانامەی شاگرداتی بداتێ، ئەوە هەر لەبەر ئەوە دەبێت، کە گرێنوی خاوەنی بەهرەیەکی نائاساییەو، ئەگەریش لە ئایندە ئاکاری باش بێت، هەروەها لەبەر خاتری دڵباشی بێ سنووری باڵدین، هەرچەندە ئەگەریش ئەو دڵباشییە هەمیشە بە زیان بۆی گەڕاوەتەوە، هەرگیز ناتوانرێت نکۆڵی لێ بکرێت.

بەڵام تا ئەو بەڵێنە خۆشە جێبەجێ کرا، کاتێکی باشی خایاند، نزیکە سێ ساڵی ڕەبەقی خایاند. لەو ماوەیەدا باڵدین توانی بە یارمەتی گرێنوی خەونە بەرزەفڕەکانی خۆی بهێنێتە دی. کارگەیەکی لە فۆبۆخ سانت ئەنتوان دامەزراند، بە هۆی عەترە تایبەتییەکانی، خۆی بەسەر کۆشکەکاندا سەپاند، مافی ئیمتیازی پاشایی وەگرت، بەرهەمی بۆنە پاراوەکانی دەگەیشتنە پێتەرسبورگ، دەگەیشتنە پالێرمۆ، دەگەیشتنە کۆپنهاگن. جۆرە عەترێکی میسکبۆنی دەگەیشتە قوستەنتینییە و لەوێ زۆر ئارەزووی لەسەر بوو، هەرچەندە هەر خوا بۆ خۆی دەیزانی، خۆیان چەندین بۆنی هەمەجۆریان هەبوو. لە کۆگاکانی لەندەن بۆنی عەترەکانی باڵدین دەهات، هەروەهاش لە کۆشکەکانی پارما و وارشۆ، هەروهاش لە کوشکی گرافەکان جگە لە بۆنەکانی

باڵدین، بۆنی تر نەدەهاتن، هەروەهاش لەوانەی وڵاتی لیپە-دێتمۆلد. ئیتر باڵدین کە وازی لەو بیرە هێنا بوو، تەمەنی پیری خۆی بە هەژاری لە مێسین بباتە سەر، لە تەمەنی حەفتا ساڵی بێ ئەملاوئەولا بووە گەورەترین عەترسازی ئەوروپاو دەوڵەمەندترین هاووڵاتی شاری پاریس.

لە سەرەتای ساڵی ١٧٥٦ بە دواوە، خانووە لاچەپەکەی سەر پردی ئۆشۆنژی تەنها بۆ ژیانی خۆی بەکاردەهێنا، چونکە سەرتاپای کۆنە خانووەکەی تری، لە عەردەوە تا بنمیچ، بە مانای وشە، بە ماددە عەترییەکان و ئامرازاکانی عەترسازی، پڕاوپڕ، ئاخنرا بوو. ئەوجا ڕێگای لە گرێنوی ئاوەڵا کرد، کە دەتونێت ئازاد ببێت، بەڵام سێ مەرجی بۆ ئەم ئازادکردنەی دانا: یەکەم نابێت تەواوی ئەو عەترانەی کە لە ژێر سایەی باڵدین بەرهەمهێنراون، لە دوا ڕۆژ، نە لە لایەن خۆی بێنە بەرهەم، وە نە فۆرمولەکەیان بدات بە کەسی تر، دووەم، پێویستە پاریس بەجێبهێڵێت و تا باڵدین مابێت، نابێت پێ بخاتەوە ناو پاریس، سێیەم مەرجیش ئەوە بوو، کە ئەو دوو مەرجەی پێشوو، وەک نهێنییەکی یەگجاری، لای خۆی بپارێزێت و لای کەس نەیاندرکێنیت. بۆ ئەمەش پێویستە بە هەموو پیرۆزایەتییەکان، بە گیانی هەژارانەی دایکی و بە شەرەفی خۆی سوێند بخوات، کە ئەم مەرجانە جێبەجێ دەکات.

گرێنوی، کە نە دەیزانی شەرەف چیەو، نە پیرۆزایەتی، نە باوەڕیشی بە گیانی هەژاری دایکیشی هەبوو، سوێندی خوارد. سوێندی بە هەمووان خوارد. هەموو مەرجێکی قەبول دەکرد، چونکە دەیویست ئەو باوەڕنامە عەنتیکەیەی شاگردی وەربگێت، کە بەهۆیەوە دەیتوانی بێ پەروا بژیت و سەفەر بکات و کارێکی پێ بدۆزێتەوە. ئیتر شتەکانی تر لای ئەو گرنگ نەبوون. ئەو مەرجانە چ بوون بۆ ئەو! جارێکی تر پێ نەنێێتە ناو پاریس؟ ئەو چ پێوسیتی بە پاریس هەبوو! ئەو بە هەموو شارەکە ئاشنا بوو، تا بۆگەنترین گۆشەی، بۆ هەر شوێنێک بچووبایە، پاریسی لەگەڵدا بوو، ئەو چەندین ساڵ بوو خاوەنی پاریس بوو. هیچ لە بۆنە سەرکەوتووکانی باڵدین بەرهەم مەهێنە، هیچ فۆرمولێکیان مەدە بە کەس؟ وەک ئەوەی ئەو نەتوانێت هەزاری تر دابهێنێت، وەک ئەوان باش، بگرە باشتریش، ئەگەر بخوازێت! بەڵام ئەو هەر هیچی نەدەویست. نیازیشی نەبوو پێشبڕکێ لەگەڵ باڵدین، یان لەگەڵ هەر عەترسازێکی تری ئەهلی بکات. ئەو ئەوەی لە پێشدا نەبوو، بە هونەرەکەی پارەیەکی زۆر پەیدا بکات، تەنانەت ئەو نەیدەویست بە هونەرەکەی بژی، ئەگەر بیتوانیبایەو بۆی بکرابەیە بە شتێکی تر بژیت. ئەو دەیویست ناوەوەی خۆی دەرببڕێت، دەروونی خۆی، کە لای خۆی لە هەموو ئەو شتانەی تر باشتر و پەسندتر بوو، کە لە دنیای دەرەوەدا هەبوون. لەبەرهەندێش مەرجەکای باڵدین بۆ گرێنوی مەرج نەبوون.

کەژی بەهار بوو کە گرێنوی کەوتە ڕێ، لە بەیانییێکی زووی ڕۆژێکی مایس. کۆڵەپشتێکی بچووکی لە باڵدین وەرگرت، کراسێک، دوو جووت گۆرەوی، باسترمەیەکی گەورە، جلەماینێک و بیست و پێنج فرانک. باڵدین پێی گوت: "ئەوە زۆرتریشە لەو هەقەی کەوتۆتە لای". بە تایبەت لەبەر ئەوەی گرێنوی قرانێکی نەداوەتێ، بۆ کرێی مەشق و فێربوونی لای ئەو. ئەو لەسەریەتی تەنها دوو فرانکی پارەی ڕۆیشتنی بداتێ، دەنا هیچ هەقێکی تری لای ئەو نیە. بەڵام نەشیدەتوانی نکۆلی لەو ڕەزامەندی و سۆزە بکات، کە لە ماوەی ئەو ساڵانەدا لە دڵی خۆی کۆیکردبوونەوە بەرامبەر جۆن پاتیست گرێنوی. هیوای بەختەوەرییێکی زۆری بۆ خواست لە گەشتی گەڕانەکەی و جارێکی تریش بە جەختەوە ئاگاداری کردەوە، کە نەکا سوێندەکانی خۆی فەرامۆش بکات. تا دەروازەی کاروباری پەیکیی، لەگەڵی چوو، لەوێ لەو شوێنەی کە یەکەم جار پێشوازی لێ کردبوو، ئازادی کرد.

تا ئەو رادەیە سۆزی بۆی نەبوو دۆقەی لەگەڵ بکات، بۆیە دەستی نەخستە دەستی. ئەو هەرگیز دۆقەی لەگەڵ نەکردبوو. هەمیشە خۆی لەوە پاراستبوو، دەستی بەر دەستی بکەوێت، وەک بڵێیت جۆرێک قێزی لێ دەبووەوە، وەک ئەوەی مەترسی ئەوەی هەبووبێت، نەخۆشی لێ بگرێتەوە، نەبادا پیس ببێت. بە ئاستەم گوتی: خوداحافیز. گرێنوی ملی چەماندەوەو کەوتە ڕێ، لەوێ دوور کەوتەوە. جادەکە چۆل و هۆل بوو.

## ٢٢

باڵدین تەماشای دەکرد، چون بە پەلە لە پردەکەوە بەرەو خوار شۆڕدەبێتەوە، بۆ ئەو بەر، بەرەو دوورگەکەی ئەوبەر، بچووک، چەماوە، کۆڵەپشتەکەی پشتی هەڵگرتبوو، دەتگوت کووڕی پشتییەتی، لە پشتەوە وەک پیاوێکی بەساڵاچوو دەهاتەبەرچاو. لەم بەر، لە نزیک تەلاری پەرلەمان، لەو شوێنەی کە کوچەکە دەسووڕایەوە، لەبەرچاوی ون بوو، لە رادەبەدەر باڵدین هەستی بە بارسووکی کرد.

ئەو هەرگیز ئەو کوڕەی خۆشنەویستبوو، ئیتر ئێستا کاتی ئەوە هاتبوو بتوانێت دان بەمەدا بنێت. ئەو هەموو کاتە، کە ئەو لە ماڵەکەی خۆی پەنای دابوو، تاڵانی کردبوو، بەڵام قەت دڵی پێ خۆش نەببوو. ئەوە بۆ وی ئازایەتییەک بوو، کە وەک کەسێک قەت سزا نەدرابێت و بۆ یەکەمین جار لە ژیانی شتێکی قەدەغە بکات، گەمەکردنێک بوو بە شتێکی رێگەپێنەدراو. راستە مەترسی ئەوەی کە کارەکەی ئاشکرا ببێت، زۆر کەم بوو، ئاسۆی سەرکەوتنیشی زۆر فراوان بوو، بەڵام دڵەڕاوکێ و ئازاری ویژدانیشی زۆر بوو. جا بەڕاستی لەو هەموو ساڵەدا رۆژێک نەبوو، کە خەیاڵێکی خراپی بۆ نێت. ئەو هەر دەبێت بە شێوەیەک لە شێوەکان سزای ئەمە وەربگرێت، کە رێگەی ئەو مرۆڤەی دا بێتە ماڵەکەی. هەمیشە بە ترسەوە لە خوا دەپاڕایەوە کە ئاکامەکەی باش بکەوێتەوە: ئەگەر شتەکە باش بکەوێتەوە! بەس ئەگەر دەرفەتی ئەوەم هەبێت، ئەو دەستبردنەم بۆ ئەو کارە گیانبازییە سەرکەوتنی لێ بکەوێتەوە، بێ ئەوەی باجەکەی بدەم! ئەگەر بێت ئەوەم بۆ هەڵبکەوێت! هەرچەندە ئەوەی دەیکەم، شتێکی دروست نیە، بەڵام خودا چاوپۆشی لێ دەکات، بێگومان چاوپۆشی لێ دەکات! خودا لە درێژایی ژیانمدا زۆرجاران بە بێ هۆ بەشی پێویست سزای داوم، ، کەواتە هەر ئەوکاتە رەوای هەقە، ئەگەر ئەو ئەوجارە دۆستایەتیم لەگەڵدا بکات و بمبوورێت. ئەوجا خراپەی من چیە، ئەگەر تەنها هەر ئەوە تاکە خراپەکەم بێت؟ ئەوپەڕەکەی کەمێک لە دەرەوەی دەستووری پیشەگەریی جووڵاومەتەوە، بەوەی

کە سوودم لە بەهرەیەکی پەڕجووئاسای نەخوێندەوارێک وەرگرتووە، بەهرەی ئەوم بە بەهرەی خۆم داوەتە قەڵەم. ئەو پەڕەکەی کەمێک لە ڕێچکەی چاکییەکانی پیشەگەرەکان لام داوە، ئەو پەڕەکەی من ئەوڕۆ کارێک دەکەم، کە تا دوێنێ نەفرەتم لێ کردووە. ئایا ئەوە تاوانە؟ بە درێژایی ژیان خەڵکی هەڵبفریوێنیت. من تەنها چەند ساڵێک فێڵم کردووە. ئەویش تەنها لەبەر ئەوەی، کە ڕێکەوت تاکە شانسێکی بۆ ئەمە پێشکەش کردم. لەوانەشە ئەمە ڕێکەوتیش نەبێت، لەوانەیە ئەمە هەر خوا بۆ خۆی بوو بێت، ئەو جادووبازەی ناردبێتە ماڵەکەم، بۆ قەرەبووکردنەوەی ئەو نشەست سوکایەتییانەی کە بە ڕێگای پلیسێ و هاوکارە بەدەکانی پێی کردم. لەوانەشە خودا ئەو کارەی لەبەر خاتری من نەکردبێت، بەڵکو دژی پلیسێ ئەمەی کردبێت! ئەوەیان زۆر ڕێی تێ دەچێ! ئەدی خودا بتوانێت بە چ ڕێگایێکی تر پلیسێ سزا بدات، جگە لەوەی من دژی ئەو بەرز بکاتەوە؟ بەم جۆرە بەختی من بووەتە ئەو ئامرازەی کە ڕەوایەتی خودایی پێ چەسپێنراوە، ئەوەش نەک هەر بۆ من هەیە کە پێی ڕازی بم، بەڵکو پێویستە پێی ڕازی ببم، نە شەرمی تێدایەوە نە کەمترین پەشیمانی...

باڵدین لە ساڵەکانی ڕابردوو زۆرجاران ئاوا بیری کردبووەوە، کاتێک سبەینان بە پەیژە تەسکەکە دەچووە خوارەوە، ئێواران کاتێک پارەی فرۆشگاکەی بەرەو سەرەو دەبرد، کاتێک پارەی قورسی زێڕ و زیوی دەژمارد و دەیخستنە ناو سندووقی قاسەکەی، شەوانیش کاتێک لە تەنیشت پرخە پرخی ژنەکەی پاڵدەکەوت و لە ترسی بەختی خۆی خەو نەدەچووە چاوی.

بەڵام ئاخیری ئەو ئەندێشە ناخۆشانە کۆتاییان هات. ئەو مێوانە سامناکە وەل بوو، ئیتر بۆ هەمیشە ناگەڕێتەوە. بەڵام سامانەکەی بۆ مایەوە، ئیتر پاشەڕۆژی مسۆگەر بوو. باڵدین دەستی خۆی خستە سەر سنگی خۆی و لە ژێرەوەی بەروانکەکەی هەستی بە دەفتەرەکەی سەر دڵی کرد. شەش سەت فۆرمولەی لەم دەفتەرەدا نووسی بوو، پتر لە هەموو ئەو عەترانەی کە یەک نەوەی عەترسازان پێکەوە ڕۆژێک لە ڕۆژان بتوانن بەرهەمیان بهێنن. ئەگەر ئەمڕۆ هەموو ئەوانەی کە هەنە لە دەستی بچن، ئەوا ئەو دەتوانێت تەنها بە هۆی ئەو دەفتەرە بە نرخ و بەرزە لە ماوەی ساڵێکدا بە جارێک ببێتەوە پیاوێکی دەوڵەمەند. جا بەڕاستی، لەمە زیاتر ئەو چیتری گەرەکە!

تیشکی خۆری بەیانی زەرد زەرد، گەرم گەرم، کەوتە سەر دیواری لاتەنیشتی خانووەکانی بەرامبەر و سەر دەموچاوی باڵدین. هێشتان باڵدین تەماشای لای باشووری دەکرد، تەماشای شەقامەکەی دەکرد کە بەرەوخوار شۆڕدەبووەوە، بەرەو کۆشکی پەرلەمان. هەستی بە ئاسوودەییەکی زۆر دەکرد، بەوەی کە هیچ شتێکی گرێنوی دیار نەبوو! لە ژێرِ

هەرەشەی ئەو هەستانەی کە بە خەیاڵیدا دەهاتن، بڕیاری دا هەر ئەمڕۆ لە ڕووی سوپاسەوە بچێتە ئەوبەر بۆ زیارەتی کڵێسای نۆتردام، بۆ ئەوەی لەوێ سێ مۆم دابگیرسێنێت و کڕنووش بۆ خودای خۆی ببات و شوکرانەبژێری بکات، بۆ ئەو هەموو بەختەوەرییەی بەسەریدا باراندوویەتی و، لە سزا پاراستوویەتی.

بەڵام لە نەگبەتی دیسان شتێک هاتە پێشەوەو ڕێگەی لێ گرت، چونکە ئەو پاشنیوەڕۆیە کە خەریکی خۆئامادەکردن بوو بەرەو کڵێساکە، دەنگۆی ئەوە بڵاوبووەوە، کە ئینگلیزەکان بانگەوازی شەڕیان لە دژی فەرەنسا ڕاگەیاندووە. لە ڕاستیدا خودی ئەم بانگەوازە شتێک نەبوو، کە بۆ باڵدین ببێتە مایەی نائارامی، بەڵام ئەو ڕۆژە باڵدین نیازی وا بوو، بارێک لە عەترەکانی بەرەو لەندەن بنێرێت، بۆیە سەردانی نۆتردامی دواخست و لە جیاتی ئەوە چووە ناو شار، هەتا بزانێت دەنگوباس چییە، ئەوجا بچێتە کارگەکەی فۆبۆخ سانت ئەنتوان و هەناردنی عەترەکانی جارێ ڕابگرێت. شەو، کەمێک بەر لەوەی چاوی بچێتە خەو، بیرێکی بلیمەتانەی بۆ هات: بە لەبەرچاوگرتنی ئەو دانوستاندن و بارودۆخە شەڕاوییەی کە لەسەر وڵاتە کۆلۆنیکراوەکان چاوەڕوان دەکرا، ویستی، عەترێک بخاتە بازاڕ بە ناوی "ناوبانگیی بە کوڤێبێک"، کە بۆنێکی خۆشی تایبەتی پیاوانەی هەبێت، بە جۆرێک سەرکەوتنی مسۆگەر بوو، وە قەرەبووی زیانی نەمانی بازرگانییەکەی ئینگلیستانیشی دەکردەوە. لەگەڵ ئەو خەیاڵە شیرنانەی ناو کەللە گەلۆرە پیرەکەی، کە بە سووکی خستییە سەر سەرین، لە خوا پاڕایەوە، بە شێوەیەک پاڵکەوت، کە بە ئاسوودەیی هەستی بە دەفتەری فۆرمولەکانی ناو باخەڵی کرد. ئیتر جەنابی باڵدین خەوی لێ کەوت و چیتر لە ژیاندا هەڵنەستایەوە.

چونکە ئەو شەوە کارەساتێکی بچووک ڕوویدا، نەدان و دواخستنی کرێ ببووە هۆی ئەوەی کە بە فەرمانی پاشا، تەواوی خانووەکانی سەر پردەکانی شار دەبووایە یەک لە دوای یەک بڕوخێندرێن: بەڵام بەبێ هۆییێکی زانراو پردی ئۆشۆنژ لەلای ڕۆژئاوایەوە، نێوانی ستوونی سێیەم و چوارەمی هەرەسی برد و ڕما. لە بەختەوەری تەنها دوو کەس بوونە قوربانی، ئەوانیش جۆزیف باڵدین و تێرێزای ژنی بوون. خزمەتکارەکان، بە مۆڵەت یان بێ مۆڵەت خۆیان دەرباز کرد. چێنیر کە بەرەبەری بەیان کەمێک بە مەستی بەرەو ماڵەوە دەهاتەوە، - پتر لەوە دەچوو کە بیەوێت بەرەو ماڵەوە بێتەوە، بەڵام کە دیتی ماڵەکەی لەوێ نەماوە- تووشی تاسان و حەپەسان ببوو. ئەو سی ساڵان بە هیوای ئەوە دەژیا، باڵدین، کە چ منداڵ و خزمی نەبوو، ناوی وەک خاوەن میرات لە وەسیەتنامەکەی بنووسێت.

بەڵام ئێستا لە پڕێک هەموو میراتەکەی لەدەستچوو، هەمووی، خانووەکە، فرۆشگاکە، کەرەسە خاوەکان، هەروەها کارگەکەش، کە لەوانە ئەویشی بۆ جێبهێڵێت!

هیچی نەدۆزرایەوە، نە لاشەکانیان، نە قاسەی پارە، نە دەفتەری شەش سەت فۆرملیی. تاکە شتێک کە لە دوای جۆزێف باڵدین، گەورەترین عەترسازی ئەوروپا جێ ما، تێکەڵە بۆنێک بوو لە میسک، عەنبەر، دارچین، سرکە، گوڵەخەزێمە و هەزاران ماددەی تر، کە چەندین هەفتە هەوری بۆنەکەی بەسەر پاریس و هەتا لوئاڤر دەسووڕایەوە.

# بەشی دووەم

## ٢٣

لەو کاتەی کە خانووەکەی جۆزێف بالدین هەرەسی هێنا، گرێنوی ڕێگای ئۆرلییەنس گرتبووە بەر و بەرەو ئۆرلییەنس دەچوو. پشتی کەوتبووە ئاوایی، هەراو هاڵاوی شارە گەورەکەی لە دوای خۆی بەجێهێشتبوو. هەنگاو بە هەنگاو، هەرچەند پتر لە شار دوور دەکەوتەوە، هەوای دەوروبەری سافتر دەبوو، پاک و پاراوتر دەبوو، تەنک و سووکتر دەبوو. چیتر مەتر دوای مەتر، سەدان و هەزاران بۆنی جیاجیا بە هەڵپە جێگۆڕکێیان نەدەکرد و نە دەگۆڕان، تەنها هەستی بە چەند بۆنێکی کەم دەکرد، بۆنی جادە زیخییەکان، بۆنی چیمەنەکان، بۆنی خۆڵ، بۆنی ڕووەکەکان و بۆنی ئاو، بە بەربڵاوی بەسەر دەشت و دەرەکە دەخشین و بە ئارامی بڵاودەبوونەوەو هێدی هێدی دەتوانەوە، مەگەر بە دەگمەن، دەنا قەت لە هیکڕا نەدەپچڕان.

گرێنوی بەرامبەر ئەو سروشتە سادە هەستی بە ئازادبوونێک دەکرد. بۆنە خۆشەکان بەر لووتی دەکەوتن و لووتیان نەوازش دەکرد. بۆ یەکەمین جار بوو لە ژیانیدا ئیتر پێویستی بەوە نەبوو، لەگەڵ هەر هەناسەوەرگرتنێک بیر لەوە بکاتەوە، کە بۆنێکی نوێ، چاوەڕواننەکراو یان بۆنێکی دژ و نامۆ یەقەی دەگرێت، وە یاخود سەرەداوی بۆنێکی خۆش و گونجاوی لێ گوم دەبێت. ئەمە یەکەمین جاری بوو کە دەیتوانی نزیکەی بە ئازادی هەناسە هەڵبمژێت، بێ ئەوەی  بە ناچاری سایەدی بۆنکردن بێت و بە سرکی هەناسەبدات. دەڵێین "نزیکە"، چونکە لە ڕاستیدا هیچ شتێک بە ئازادی خۆی، بە کونە لووتەکانی گرێنوی ڕەت نەدەبوو. ئەگەر کەمترین هۆ و پوازشیشی بۆ ئەمە نەبووایە، ئەوە هەر وەک هەستێکی غەریزی، هەستێکی یەدەک و پەرۆشدار، بەرامبەر هەموو ئەو شتانەی کە لەدەرەوە ڕا دەهاتنە ژوورەوەی جەستەی، واگاو لە بۆسە دەمایەوە. لە هەموو ژیانی

خۆیدا، ئەگەر بۆ چرکە ساتێکی کەمیش، هەستی بە دابینبوون، ئاسوودەیی، یان لەوانەیە بەختەوەری کردبێت، ئەوا پتر حەزی لە هەناسەدانەوە کردووە وەک لە هەناسەهەڵمژین، بەڵێ، هەروەک چۆن ژیانی خۆی بە وەرگرتنی هەناسەیەکی پڕ هیوا دەستپێنەکردبوو، بەڵکو بە زریکەیەکی بکوژ، ئاوا. بەڵام بە چاوپۆشی لەو بارە مەرزدارە، کە بۆ ئەو مەرزێکی زگماکی سروشتیی بوو، چەند لە پاریس دوور دەکەوتەوە، ئەوەندە پتر هەستی بە ئاسوودەیی دەکرد، سووکتر و ئاسانتر هەناسەی دەدا، بە زەوقتر هەنگاوی دەهاویشت، تەنانەت جەستەی خۆی پتر راست دەکردەوەو رێکوپێکتر دەرۆیشت، بە شێوەیەک کە لە دوورەوە تێی ڕادەمای، دەتگوت وەک کەسێکی پێشەگەری ئاسایی دەهاتە بەرچاوان، واتە تەواو وەک مرۆڤێکی ئاسایی.

لە هەموو شتێک پتر کە هەستی ئازادبوونی پێ دەبەخشی، دوورکەوتنەوەی بوو لە مرۆڤەکان. لە چاو هەموو شارەکانی سەرزەوی، پتر لە شاری پاریسدا ژمارەیەکی زۆری مرۆڤ لە فەزایەکی تەنگدا دەژیان. شەش- تا حەوت سەت هەزار مرۆڤ لە شاری پاریسدا دەژیان. شەقام و مەیدانەکانی سیخناخ بوون لە ئاپۆڕەی خەڵک، خانووەکانی هەر لە ژێرزەمینەکانیانەوە تا بنمیچەکانیان تژی بوون لە مرۆڤ. بە دەگمەن گۆشەیەکی پاریس هەبوو، کە بە مرۆڤ دانەپۆشرابووایە، بەردێک نەبوو، بستە زەوییەک نەبوو کە بۆنی مرۆڤی لێ نەهاتبووایە.

ئەوە هاڵاوی ئاپۆڕەی ئەو مرۆڤانە بوو، کە هەژدە ساڵان وەک رەهێڵەیەکی برکدار تەنگەنەفەسی کردبوو، تازە بە تازە گرێنوی ئەوەی بۆ رۆشن دەبووەوە، چونکە خەریک بوو لێێ دەرباز دەبوو. تا ئەوکاتە وای دەزانی، کە دونیا هەمووی هەر وەسایەو پێویستە خۆی لێ لابدات. بەڵام ئێستا بۆی دەرکەوت، کە ئەمە دنیا نەبوو، بەڵکو ئەمە مرۆڤەکان بوون وا بوون، دەنا دنیاییێکی خاڵی لە مرۆڤ، شایانی ئەوەیە لێی بژیت.

لە سێیەمین رۆژی سەفەرەکەیدا کەوتە ناو کایەی راکێشانی بۆنەکانی شاری ئۆلیانس. زۆر پێش ئەوەی کە هیچ نیشانەیەکی ئەوە دەرکەوتبێت، کە لە شارەکە نزیک بووەتەوە، بە بۆنی هەوا هەستی بە چڕی ئاپۆڕەی مرۆڤەکان کرد، بۆیە بە پێچەوانەی ئەو نیازەی کە هەیبوو، بڕیاری دا کە خۆ لە شاری ئۆلیانس لابدات. نەیویست ئازادی هەناسەهەڵمژینی خۆی، کە تازە دەستی کەوتبوو، ئاوا زوو جارێکی تر بە کەش و هەوای مرۆڤەکان ئالوودە بکات. بە کەوانەیەکی گەورە لە دەوری شارەکە پێچی کردەوە، لە نزیک شاتیانۆفەوە رووبەڕووی زێی لۆیر بووەو لە نزیک شاری سۆلی لێی پەڕیەوە. باسترمەکەی بەشی کرد تا ئەوێ. لەوێ باسترمەیەکی نوێی کڕی، ئەوجا بە کەناری رووبارەکە و بە تەختایی دەشتەکاندا کەوتەوە ڕێ.

ئیتر نەک خۆی هەر لە شارەکان لا دەدا، بەڵکو خۆی لە ئاوایی و گوندە بچووکەکانیش دوور دەخستەوە. دەتگوت بەو هەوایە، کە هەر پتر و پتر دوورە مرۆڤ و سووک و بێگەردتر دەبوو، مەست ببوو. تەنها بۆ نوێکردنەوەی پریاسکەی خواردنی ڕێگە، خۆی لە ئاواییەک یان لە ماڵە جوتیارێکی تاک و تەنیا  نزیک دەکردەوە، نانی خۆی دەکڕی و لەبەرچاوان گوم دەبوو، دیسان دەکەوتەوە ناو دارستانەکان. دوای چەند هەفتەیەکی کەم، ئەوەشی پێ زۆر بوو، کە لە ڕێگاوبانەکان تووشی ژمارەیەکی کەمی ڕێبوار و موسافیران دەبوو، چیتر بەرگەی ئەوەشی نەدەگرت، کە جێ جێ و ناوە ناوە  بۆنی ماڵە جوتیارەکانی بۆ بێت، ئەوانەی لەسەر کێڵگەکان خەریکی دروێنەی گیاکەڵەی تازەشینبوو بوون. بە ترسەوە خۆی لە هەموو مێگەلە مەڕێک لادەدا، نەک لەبەر مەڕەکان، بەڵکو لەبەر بۆنی شوانەکان. بە بەرینی بەناو کێلگەکاندا دەڕۆیشت، لاڕێکانی دەگرت و چەندین میل ڕێگای خۆی دوور دەخستەوە، ئەگەر سەعاتە ڕێیەک، دوور بۆنی دەستە سوارێک بهاتبایە. نەک لەبەر ئەوەی، ترسی هەبوویێت، کە وەک کوڕێکی پیشەگەر، یان وەک کەسێکی بەرەڵلا، تەماشا بکرێت و داوای کاغەز و ناسنامەی لێ بکرێت، یان لەوانەش بێت کە رایکێشن بۆ خزمەتی سەربازیی، ئەو هەر نەیدەزانی کە شەڕ دەستی پێ کردووە، بەڵکو تەنهاو تەنها لەبەر ئەوە بوو، کە قێزی لە بۆنی سوارەکان دەبووەوە. ئیتر ئاوا، هەر لە خۆیەوە، بەبێ بڕیارێکی تایبەت، نەخشەکەی، کە پێشتر دانابوو، کە بە خێراترینی ڕێگاکان بگاتە شاری گراس، هەڵوەشایەوە. نەخشەکەی وەک بڵێی لە ئازادیدا توایەوە، وەک هەموو نەخشەو مەبەستەکانی تری. گرێنوی نەیدەویست بچێتە هیچ جێگاییێک، ئەو دەیەویست، تا بۆی دەکرێت لە مرۆڤ دوور و دوورتر بکەوێتەوە.

تا لە ئاکامدا تەنها شەوان ڕێگای دەگرتە بەر. ڕۆژەکانیش دەخزیە بن کوڵکەدارێک، بن گەوەڕێک، سەر تاوێرە بەردێک، لەناو دەوەن و پنچکان، لەسەر پووش و پەڵاشان، تا دەکرا لە جێگەیەک کە مرۆڤ ڕێی نەکەوتێ، وەک زیندەوەرێک خۆی لوول دەداو جلەماینە خاکییە مەیلەو قاوەییەکەی بەخۆی دادەداو سەری خۆی دەبردە ناوەوە، لووتی خۆی دەخستە نێوان هەردوو بازووی و دەیقرمساندە خۆیی و ڕووی لە زەوی دەکرد، تا کەمترین بۆنێکی نامۆ خەوەکانی لێ تێکنەدەن و بێزاری نەکەن، بەو جۆرە  لێێ دەنووست. کە ڕۆژ دەگەیشتە ئاوابوون، واگا دەهات، بە هەموو ئاراستەکان هەستی بۆنی خۆی رادەگرت، کاتێک لەوە دڵنیا دەبوو، کە هەموو جوتیارەکان کێڵگەکانی خۆیان بەجێهێشتووەو ئازاترین ڕێبواری ڕێگاکان، پەناگاییێکیان دەستکەوتووە، ئەوجا کاتێک شەو لە مەترسی بوونی مرۆڤەکان پاکژ دەبووەوە، ملی ڕێگای سەفەرەکەی دەگرتە بەر. ئەو پێویستی بە چرا نەبوو، تا ڕێگا ببینێت. هەر لە سەردەمانی زوو، کاتێک ڕۆژانە بە ڕۆژ دەگەڕا،

چەندین سەعات بە چاوی قوچاوەوە بە ڕێگەوە دەڕۆیشت، تەنها دەکەوتە دوای کەپوی خۆی. وێنەی ڕۆشنی دیمەنەکان، تیشکە بە هێزەکان، دیتنی لە هیکرا، دیتنی ساف بە چاوەکانی، ئەویان ئازار دەدا. ئەو تەنها حەزی لە ڕۆناکی مانگەشەو دەکرد. ڕۆناکی مانگەشەو ڕەنگەکانی دەرنەدەخست، تەنها بە ئاستەم مەرز و هێلی زەوی و زارەکانی پێشاندەدا.

تاریکاییێکی ئەنگوستەچاو دەشت و دەرەکەی داپۆشی، بە درێژایی شەوێک ژیانی کوژاندەوە. ئەو جیهانە کە دەتگوت لە قورقوشم داڕێژراوە، جگە لە با هیچ شتێکی تری تێدا نەدەجولایەوە، ئەو بایەی کە هەندێک جار وەک سێبەر دەکەوتە سەر دارستانە تاریکەکان، کە جگە لە بۆن و بەرامەی زەوی رووتەن چێتریان تێدا نەدەژیا، ئەمە تاکە جیهان بوو لای ئەو، چونکە ئەو جیهانە وەک جیهانی روحی گرێنوی بوو.

بەم جۆرە بە ئاراستەی باشوور رۆیشت. نزیکە بە ئاراستەی باشوور، چونکە ئەو بە پێی هیچ قیبلەنومایێک نەدەڕۆیشت، بەڵکو کەوتبووە دوای قیبلەنومای لووتی خۆی، ئەو قیبلەنومایەی ئەوی لە هەموو شار و گوند و ئاواییەک دووردەخستەوە. چەندین هەفتە بوو چاوی بە هیچ مرۆڤێک نەکەوتبوو. ئەو دەیتوانی بە باوەڕێکی ئارامی بەخش لەوە دڵنیا بێت کە خۆی تاکە کەسە لەو جیهانە تاریک و ساردەی بەر ڕۆناکی مانگەشەو، ئەگەر بهاتبا قیبلەنوما ورد و هەستیارەیەکەی ڕێگاییێکی باشتری پێشان نەدابایە.

شەوانەش مرۆڤەکان لەو دەشت و دەرە هەبوون. لە ناوچە زۆر لاچەپەکانیش مرۆڤ هەبوون. بەڵام هەموو وەک جورج خۆیان خزاندبووە گۆشەو کونجەکانی حەوانەوەیان و نووستبوون. زەوی لەوان پاکژ نەبووبووە، چونکە ئەوان لە خەویشدا هاڵاوی بۆنیان لێ دەهات، ئەو بۆنەی لە پەنجەرەی کراوە و درزی ماڵەکانیان دەهاتە دەرەوەو لە هەوای ئازاددا بڵاودەبووەوە، ئەو سروشتە، کە وا دەهاتە بەرچاوان لەوان ئازاد بووە، بە بۆنەکانیان بۆگەن و ئالوودە دەبوو. هەرچەند گرێنوی پتر لە هەوای پاکتر رادەهات، ئەوەندە پتر بەرامبەر بۆنی مرۆڤەکان هەستییارتر دەبوو، لە ناکاوێک، بێ هیچ چاوەڕوانییەک، بۆنێک وەک بۆگەنی چالەپیسایی دەهات، دەیزانی کە هەبێ و نەبێ پێشتر پەناگەیەک، کورەخەڵووزێک یان گەوەڕێکی ڕێگران لەو نزیکانەدا هەبووە. هێندەی تر هەڵدەهات و دوور دەکەوتەوەو هەستییارتر هەستی بە کەمبوونەوەی بۆنی مرۆڤان دەکرد. بەمجۆرە لووتی رانمایی دەکرد بۆ شوێنە پتر لاچەپەکان، بەردەوام دووری دەخستەوە لە مرۆڤەکان و جار لە جار خێراتر بەرەو ترۆپکی گەورەترین تەنهایی راکێشی دەکرد.

## ٢٤

ئەو ترۆپکە، واتە دوورترین پنت لە مرۆڤەکان، لە تەواوی سەرزەمینی پاشایەتی، کەتبووە چەقی بەردەلانیی ئۆڤێرنیە، نزیکەی پێنج رۆژ رێ دوور لە باشووری شاری کلێرمۆنت، لەسەر لووتکەی دووهەزار مەتر بەرزی شاخێکی بورکانیی بە ناوی شاخی "پلۆم دو کێنتل".

شاخەکە وەک قوچەکێکی زەبەلاح لەو ناوە چەقی بوو، پێکهاتبوو لە بەردێکی بۆری وەک قورقوشم، دەوروبەری بێ شومار بە ڕەوەزە بەردی دەرپۆقیو دەورە گیرابوو، روویان هەموو بە قەوزەو گژ و گیای رەنگ مشکیی گیرابوو. لێرەو لەوێ نووکی تاشەبەردی رەنگ قاوەیی، وەک ددانی کلۆر و بۆگەن، لەگەڵ چەند کۆڵکە دارێکی سووتاوی بە خەڵووزبوو دەرپۆقیبوون. هەمووی بۆر دەچوونەوە، ئەو دەوروبەرە ئەوەند رووتەن و بێ خۆراک بوو، بە رۆژی رۆناکیش هەژارترین شوانی ئەو ناوچەیە -کە هەر خۆشی ناوچەیەکی هەژار بوو- مەڕ و ئاژەڵەکانی نەدەهێنایە ئەو شوێنە بۆ لەوەڕ. خۆ لە شەوانی مانگەشەویشدا، لەبەر رۆناکی زەردی مانگ، ئەو سەرزەمینە رووتەنە، کە خوداش فەرامۆشی کردبوو، دەتگوت چیتر بەشێکی ئەم جیهانە نیە. تەنانەت لێبرون، چەتەی بەناوبانگی ئۆڤێرنیە پێی باشتربوو کە لە شاخەکانی کێڤێنندا بەسەری دابدەن و بیگرن و بیکەنە چوار لەت، نەک خۆی لە چیای پلۆم دو کێنتل حەشار بدات، ئەگەرچی لەوە دڵنیابوو کە لەوێ هیچ کەسێک بەدوای دا نەدەگەڕاو نەدەدۆزرایەوە، بەڵام ژیانی ئەو شوێنەی لە مەرگ و زیندانیی تەنهایی و هەتا هەتایی پێ ناخۆشتر و خراپتر بوو. چەندین میل دوور لە بازنەی دەوری ئەو چیایە هیچ مرۆڤێک و هیچ زیندەوەرێکی خوێنگەرمی ماقوول نەدەژیا، جگە لە چەند شەمشەمەکوێر و چەند قالۆنچەو پیسپیسۆکەو چەند تیرەمارێک نەبێت. دەیان ساڵ بوو هیچ مرۆڤێک بەسەر ئەو لووتکەیەدا هەڵنەگەڕابوو.

لە شەوێکی مانگی ئابی ساڵی ١٧٥٦ گرێنوی گەیشتە سەر ئەو شاخە. لە تاریکوروونی سبەینەیەک لەسەر ترۆپکی شاخەکە راوەستا. ئەو هێشتان نەیدەزانی، کە سەفەرەکەی ئا لێرەدا گەیشتۆتە کۆتایی. ئەو هەر وای دەزانی ئەوە قۆناغێکە لە قۆناغەکانی ئەو ڕێگایە کە بەردەوام بەرەو

هەوای پاراوتر و بێگەردتری هێناوە، بە بازنەیی سووڕایەوەو بە چاوی لووتی دیمەنی فەلامەرزی ئەو سەرزەمینە رووتەنە  بورکانییەی تەی کرد: بەرەو رۆژهەلاّت، ئەو شوێنەی کە گردۆلّکە بەرزەکانی سانت فلۆر و زەلّکاوەکانی رووباری ریۆی لێ هەلّکەوتبوو، بەرەو باکوور، بۆ ئەو ناوچەیەی، کە خۆی لێی هاتبوو، لەو شوێنەی کە بە درێژایی رۆژ بە ناو ناوچە شاخاویە رووتەن و پڕ لە شەقارەکان ڕەوی کردبوو، بەرەو رۆژئاوا، لەو شوێنەی کە شنەبای بەیانی جگە لە بۆنی بەردو وشکەگیا چیتری بۆ نەدەهێنا، بەرەو باشوور، بەرەو ئەو شوێنەی کە دامێنەکانی شاخی پلۆم بە بەرینایی چەندین میل بەرەو خوار شۆڕدەبوونەوە تا دەگەیشتنە دۆلّ و خەرەندە تاریکەکانی تروێ. لە هەموو لایێک تابلّیی لە مرۆڤ و ئاوەدانی بە دوور بوو، لە هەمانکاتدا هەر هەنگاوێکی تری بۆ هەر لاییّک بهاویشتبا ئەوا مانای وابوو لە مرۆڤان نزیکتر دەکەوتەوە. قیبلەنوماکە چەرخایەوە. هیچ ئاراستەیەکی تر نەبوو. گرێنوی گەیشتبووە ئامانج، بەلاّم لە هەمان کاتدا گیرا بوو.

کاتێک خۆر بەرز بووەوە، هێشتان هەر لە شوێنی خۆیدا وەستا بوو، لووتی خۆی دابووە بەر هەوا. بە دلّەڕاوکێ هەولّی ئەوەی دەدا، بۆنی ئەو ئاراستەیە هەلّبمژێت، کە هەڕەشەی بۆنی مرۆڤی لێ دەهات، هەروەها بۆنی ئەو ئاراستە پێچەوانەی کە دەبووایە هێشتان بەرەو ئەوێ ڕابکات. هەستی خۆی بەرامبەر هەموو ئاراستەکان راگرت، بەلّکە کەمە بۆنێکی شاراوەی ئادەمیی بدۆزێتەوە، بەلاّم ئێرە هیچ بۆنێکی ئادەمیزادی لێ نەبوو. ئەوێ تەنها ئارامیی و بێدەنگیی بوو، ئەگەر بکرێت ئاوا بلّێین، ئارامیی بۆن. لە هەرچوار دەور تەنها خوڕەی هێمنی بۆن و بەرامەی بەردە مردووەکان دەهات، هی قانە بەردە بۆرەکان و هی کژۆگیا وشک هەلاّتووەکان، دەنا بۆنی هیچی تر نەدەهات.

زۆری برد تا گرێنوی باوەڕی کرد، کەوا بۆنی هیچ شتێک ناکات، چاوەڕوانی ئەو شانسە باشە نەبوو، بۆیە خۆی بۆ هەبوونی بەختێکی ئاوا ئامادە نەکردبوو. دەمێکی درێژ بوو دلّەڕاوکێ و بێ بڕوایی وایان لێ کردبوو، کە روانگەیەکی باشتر لە ژیاندا نەبینێت. تەنانەت کە رۆژ کەوتە ئاسمان، بە یارمەتی چاوەکانی کەوتە پشکنینی ئاسۆ، دەگەڕا بەدوای کەمترین نیشان و شوونی بوونی مرۆڤ لەو ناوە، بەدوای بانی کەپرێک، دووکەلّی ئاگرێک، پەرژینێک، پردێک، ڕەوە ئاژەلێک. دەستی لەسەر گوێچکەکانی داناو هەستی خۆی راگرت، بەلّکو دەنگی دروێنەی داسێک، حەپەی سەگێک یان قیژەی منداڵیک بێتە گوێی. تەواوی رۆژەکە لەبەر چرقەی گەرما، کە دەتگوت گڕی ئاگرە، لەسەر ترۆپکی لووتکەی چیای پلۆم دو کێنتل بێ سوود چاوەڕوانی کرد، هەستی بە هیچ نیشانێک نەکرد. ئەو کاتەی کە رۆژ هاتە ئاوابوون، ئەوجا هەستێکی دلّخۆشی و شاگەشکەبوون،

که بەرە بەرە بەهێزتر دەبوو، گومانەکەی ڕەواندەوە: لە دەستی ئەو جانەوەرە ڕزگاری ببوو! ئەو بەڕاستی و بە تەواوی تاک و تەنها بوو! ئیتر ئەو تاکە مرۆڤێک بوو لەو جیهانەدا!

لە خۆشیان یەک بە دەنگی خۆی قیژاندی. وەک کەشتیەوانێکی گومبوو، کە لە دوای ئەوەی بە درێژایی هەفتە ڕێگای لێ گوم بووبێت و تازە گەیشتبێتە کەنار دورگەیەکی ئاوەدان و خەڵکی ئەوێ بەخێرهاتنی بکەن، ئاوا گرێنوی لە خۆشی گەیشتنی بە شاخی تەنهایی ئاهەنگی دەگێرا. لە خۆشییان هاواری دەکرد. پریاسکەو جلەماین و دارەکەی دەستی فڕێ دا، بە قاچەکانی زەوی دەکوتاو لە خۆشییان هەڵدەپەڕی، بازووەکانی بەرز دەکردەوەو بە بازنەیی سەمای دەکرد، ڕووی لە هەموو لاییێک دەکردو بە نەڕاندن ناوی خۆی بانگ دەکرد. دەستەکانی خۆی دەکردە کۆڵەمست و بە خۆشییەوە بەرەو دەشت و دەرەکانی خوارەوەو بەرەو خۆری ئاوابوو ڕایدەوەشاندن، بە ئاهەنگ و خۆشیی، وەک ئەوەی بە خۆی بە خۆری ئاسمانی ڕاو کردبێت. بەو جۆرە وەک شێتێک تا قووڵایی شەو ڕایبوارد.

## ٢٥

لە ڕۆژانی دواتر گرێنوی خەریکی ئەوە بوو، خۆی لەسەر شاخەکە دابمەزرێنێت، چونکە ئەو لەوە دڵنیا بوو، کە وا زوو ئەو ناوچە خۆش و دڵگیرە بەجێناهێڵێت. بەر لە هەموو شتێک بەدوای بۆنی ئاودا گەڕاو لە شەقارێکی خوار لووتکەکە ئاوێکی دۆزیەوە، تەڕاتییێکی تەنک تەنک بەسەر تاشە بەردێکدا دەهاتە خوارەوە، تەڕاتییەکە زۆر نەبوو، ئەگەر ئەو بە سەبرەوە دەمژمێرێکی تەواو بەردەکەی بلستبایەوە، ئەوجا بەشی ڕۆژێک ئاوی لێ هەڵدەمژت. خواردنیشی پەیداکرد، واتە مارمیلک و کوێرەماری بچکۆلە، دوای ئەوەی سەریانی دەپلیشاندەوە بە ئێسک و پێستەوە قووتی دەدان. جگە لەمانەش هەرچی دەستکەوتبایە لە بەری وشکهەڵاتووی گیاکەڵەو پنچکە گیاو قەوزە و قارچکی وشکبوو، دەیخواردن. ئەو تەرزە خۆراکانە، کە بە پێوەرەکانی مرۆڤێکی ئاسایی، هی ئەوە نین وەک خۆراک ناو بهێنرێن، ئەو زۆر بە بێ باکی وەک گەزۆ و حەلوا دەیخواردن. گرێنوی چەند هەفتە پێشتریش هیچ خۆراکێکی نەخواردبوو، لەوانەی کە بەدەستی مرۆڤ ئامادەدەکرێن، وەک نان و باسترمەو پەنیر، بەڵکو کە برسێتی هێرشی بۆ دەهێنا، هەموو ئەو شتانەی کە دەکەوتنە سەر ڕێگای و بۆ خواردن دەشییان، پێکەوە هەڵیدەلووشین. ئەو هیچی کەمتر نەبوو لەوانەی پسپۆری چێژکردنی خواردن و خواردنەوەن، بەڵام بۆ ئەو چێژ پێوەرێکی نەبوو، ئەگەر بهاتبایە چیژی خۆراکەکان شتێکی جودا ببووان لە بۆن و بەرامەی بێ جەستە. لای ئەو ئاسوودەییش شتێکی وا نەبوو، ئەو بەوە خۆشحاڵ دەبوو، ئەگەر تاشەبەردێکی دەستبکەوتبایەو شوێنی حەوانەوەی خۆی لەسەر دابمەزراندبایە. بەڵام ئەو شتێکی باشتری دۆزیەوە.

لە نزیک شوێنی ئاوەکە گەوەڕە ئەشکەوتێکی سروشتیی دیتەوە، کونێکی تەنگی پێچاو پێچ بەرەو ناوەوەی شاخەکە دەچوو، نزیکە دوای سی مەترێک بە کۆمەڵە بەردێکی هەرەسبردوو کۆتایی دەهات. کۆتایی ئەشکەوتەکە ئەوەندە تەنگ بوو، شانەکانی گرێنوی لەم لاو لەو لا بە دیوارەکانی دەکەوتن، میچەکەی ئەوەندە نزم بوو، دەبووایە خۆی کووڕ بکاتەوە، تا سەری پێ نەکەوێت. بەڵام دەیتوانی بە ئاسانی لە ناویدا دابنیشێت،

خۆ ئەگەر خۆی گرمۆلە کردبایە، دەیتوانی لە ناویدا رابکشێت. ئەو جێگەیە هەموو ئاتاجییەکانی ئەوی دابین دەکردو لێشی زیاد بوو، دەیتوانی بۆخۆی بە ئاسوودەیی تێیدا بژیت. چونکە ئەو شوێنە شتی یەگجار بەنرخی تێدا بوو: کۆتایی تونێلەکە بە درێژایی رۆژ شەوێکی تاریکی ئەنگوستەچاو بوو، ئارام وەک ئاشی ئاو لێبڕاو، هەواکەی ناوی بۆنێکی فێنکی خوێاوی لێ دەهات. گرێنوی یەکسەر بۆنی شوێنەکەی کردو زانی، کە تا ئێستا قەت هیچ زیندەوەرێک رێگەی نەکەوتۆتە ئێرە. کە پێی خۆی نایە ژوورەوە، وەک بڵێی هەستی بە پیرۆزایەتی جێگەکە کرد، زۆر بە ئاگاییەوە جلە ماینەکەی لەسەر عەردەکە راخست، وەک ئەوەی سەکۆی قوربانگەیەک داپۆشێت ئاوا، ئەوجا لەسەر جلەماینکە راکشا. وای دەزانی هاتۆتە بەهەشت. گرێنوی پەنجا مەتر لە قوڵایی هەناوی شاخێکی تەنهای فەرەنسا، لە ژێر زەوی، پاڵ کەوتبوو، وەک ئەوەی لە گۆڕی تایبەتی خۆی راکشابێت. هەرگیز لە هەموو ژیانی خۆیدا ئەوەندە هەستی بە دڵنیایی نەکردبوو، تەنانەت لە ناو زگی دایکیشیدا. ئەگەر لە دەرەوە دونیا ئاگریشی تێ بەربیا، ئەو لێرە هەستی پێ نەدەکرد. دەستی کرد بە گریان، گریانێکی ئارام. نەیدەزانی بۆ ئەو بەختە گەورە خۆی، سوپاسی کێ بکات.

لە رۆژانی دواتر تەنها بە خێرایی بۆ لێستنەوەی شوێنئاوەکەو میز و خۆخالیکردن و ڕاوی مار و مارمیلکە، دەچووە دەرەوەو پاشان دەگەڕایەوە ژوورەوە. ئەو زیندەوارانە بە شەو بە ئاسانی ڕاودەکران، چونکە بۆ حەوانەوە دەگەڕانەوە بن پانەبەردەکانیان، یان بۆ ناو کونەکانیان. گرێنویش بە لووتی خۆی دەیدۆزینەوەو دەیگرتن.

لە هەفتەی یەکەم چەند جارێکی تر بە خۆشییەوە، چووەوە سەر لووتکەی شاخەکە، تا بۆنی ئاسۆ و دەوروبەرەکە بکات. بەڵام هەر زوو ئەوە بوو بە خووێکی ڕووتی وەڕسکەر و چیتر پێویستی پێ نەبوو، چونکە هیچ جارێک بۆنی شتی نامۆ ۆ مەترسیداری نەکرد. ئەوەبوو ئیتر وازی لەم پشکنینە هێنا، ئەگەریش بۆ شتە زۆر پێویستەکانی ژیانی بهاتبایە دەرەوە، ئەوا زۆر بە پەلە دەگەڕایەوە کونەکەی خۆی. چونکە بە ڕاستی ئەو هەر لە ناو ئەشکەوتەکە دەژیا. واتە لە هەر رۆژێکدا پتر لە بیست سەعات لە ناو تاریکاییێکی ئەنگوستەچاو و ئارامی و بێ جووڵەییەکی تەواو، لەسەر جلەماینەکەو لە بنەبانی ئەشکەوتەکە دادەنیشت، پشتی خۆی دەدایە قۆمەتی بەردەکان و شانەکانی خۆی لە نێوان تاشەبەردەکان دەقرمساندو قناعەتی بەمە دەهێنا.

زانراوە، کە هەندێک مرۆڤ هەن، بە دوای ژیانی تەنهایی عەودالّن: چلەکێشەکان، تۆبەکار و دەروێشەکان، بەزیو و شکستخواردووەکان، پیاوچاک و پێغەمبەرەکان. ئەوانە پتر خۆدەکێشننەوە بۆ ناو بیابانەکان، لەو شوێنانەی کە دەتوانن بە خواردنی کوللەو هەنگوێنی کێویی بژین.

هەندێکییان لە ناو گەوەڕ و ئەشکەوتی هەوراز دوورگەکان دەژین، یان بە شێوەیەکی زۆر سەرنجراکێش خۆیان دەئاخننە ناو قەفەس خۆ لە هەوا شۆڕ دەکەنەوە. ئەمانە ئەوە دەکەن، تا خۆیان لە خودا نزیک بکەنەوە. ئەوانە بە چلەکێشی و تەنهاییکردن خۆیان سزای خۆیان دەدەن. ئەوان باوەڕیان وایە، کە بەم تەرزە ژیانە، خودا لەخۆیان رازی دەکەن. یاخود بە سالآن و مانگان چاوەڕوانی دەکەن، بەڵکو لەو تەنهاییەدا سروشێکی خودایيان بۆ بێت، تا بە پەلە لەناو مرۆڤەکانی تر بڵاوی بکەنەوە.

ئەمانە هیچی گرێنوییان نەدەگرتەوە. ئەو هەر نەشیدەزانی خودا چیە، نیازی تۆبەکردن و خۆسزادانیشی نەبوو. چاوەڕوانی هیچ سروشێکی ئاسمانیشی نەدەکرد. تەنها بۆ خۆشی و ئاسوودەیی خۆی، خۆی کێشابووە ناو ئەو تەنهاییە، تەنها بۆ ئەوەی خۆی لە خۆی نزیک بکاتەوە. ئەو خۆی لە ناو خودی خۆی پاراو دەکرد، خۆی لە ناو خۆی دەشۆرد، ئەو دەیویست جلەوی بوونی خۆی بخاتە دەستی خۆی. ئەمەش بۆ ئەو زۆر گرنگ بوو. وەک تەرمی خۆی کەوتبووە ناو بەردەکانی گەوەڕەکە، هەناسەی دەداو نەدەدا، بە ئاستەم دڵی لێی دەدا، لەگەڵ ئەوەش زۆر چڕ و پڕ دەژیا، بە جۆرێک، کە هیچ کەسێکی بەختەوەر و خواپێداو لە دەرەوە، لە سەر دونیا، ئاوا نەژیاوە.

## ٢٦

قەت نەدەكرا هۆی ئەو بێباكییەی گرێنوی شتێكی تر بووبێت جودا لە سەرزەمینی دەروونی. ئەو سەرزەمینەی كە ببوو بە مەملەكەتی هەموو ئەو بۆن و بەرامانەی كە هەر لەكاتی لەدایكبوونیەوە تا ئێستا، رۆژێک لە رۆژان تووشی هاتبوون. وێنەی هەمووانی لەو زەمینەدا هەڵكۆڵیبوو. بۆ ئەوەی بێتەوە سەرەخۆی، بڕیاری دا جارێ یادی كۆنەبۆنەكان بكاتەوە، ئەوانەی كە زۆر زوو، بەر لە هەمووان پاشەكەوتی كردبوون: بۆنە ناحەز و هەڵماویی و هاڵاویەكەی ژووری خەوەكەی مادام گایارد، بۆنی پێستی ترشاو گەنیوی دەستەكانی، هەناسەی ترشاو و بۆن سركەی قەشە تێرییێ، بۆنی ئەرەقی شڵەژاو و دایكانەی جان بویسی دایەن، لاشە بۆگەنەكانی گۆڕستانی ئینۆسۆم، بۆگەنی كوژەری دایكی خۆی. چێژی لەو بۆنە هێڵنجهێن و كینەئامێزانە وەردەگرت، دەتگوت رۆنی سەگە، لە لەشی هەڵدەسوون، شاگەشكە دەبوو، لە خۆشییان موچڕكی دەهاتێ و مووەكانی قیت دەوەستان.

ئەگەریش هەندێک جار بەو پێكە سەرەتاییە قێزەونانە، بەشی پێویست مەست و گەرم نەبووبایە، ئەوا رێگای بەخۆی دەدا لە لای گریمال، نۆشی قومێک بۆنی بۆگەنی خاو و گۆشتاویی چەرمەكان و شۆربای دەباغكردن هەڵبمژێت، یان لە بۆنی هاڵاوی شەش سەت هەزار دانیشتووانی پاریس، كە لە هەوای خنک و گەرمی چلەی هاویندا بەناو شاری پاریسدا پەرش و بڵاودەبووەوە.

پاشان بە جارێک هەڵدەچوو _هەر ئەوەش بوو ئامانجی مەشقەكەی _ ماسولكەكانی رەپ و گرژ دەبوون و كینە پەنگاوخواردووەكانی خۆی بە جارێک دەتەقاندەوە. وەک گەواڵە بەسەر ئەم بۆنانەدا دەینەڕاند، كە زاتی ئەوەیان كردبوو، قەرە لە قەرەی لووتی هەستیاری بدەن و ئازاری بدەن. چۆن تەرزە دادەبارێتە سەر دەغڵودان، ئاوا دادەبارییە سەریان و دەیپوكاندنەوە، وەک گەردەلوول بە بای دەكردن و وەک لافاوێكی ئاوی هەڵمێندراو هەڵیدەمژین و نۆشی دەكردن. تووڕەییەكەی ئاوا ڕەوا بوو، تۆڵەكردنەوەكەی ئاوا مەزن بوو. ئای! كە ئەوە چ ساتەوەختێكی ورد و هەستیار بوو! گرێنوی، مرۆڤە بچووكەكە، ئەوەندە هەڵدەچوو، سەرتاپای گیانی دەلەرزی،

جەستەی شەتەک و پڕ دەبوو لە ئاسوودەییێکی خۆش، بە کووڕی هەڵدەستایەوە سەرپێیان، بە شێوەیەک بۆ ماوەیەکی کورت تەوقی سەری بە میچی ئەشکەوتەکە دەکەوت، بۆ ئەوەی سەرلەنوێ، بە هێواشی خۆی نزم بکاتەوە و رابکشێت، بۆ ئەوەی ئازاد ببێت و بگاتە قووڵایی رەحەتبوون. بە راستی ئەم کارە شتێکی زۆر خۆش بوو، وروژاندن و کردنەوەو هەڵتەکاندنی کوتوپڕ و بە لەزی ئەو هەموو بۆنە قێزەونانە، بەراستی ئەمە کارێکی زۆر خۆشیبەخش بوو... لەو شانۆگەریە دەروونییەی، وەک بڵێی ئەم پەردەیەی لە هەموو پەردەکانی تر لا خۆشتر بوو، چونکە بە هۆی ئەمەوە هەستی بە ماندووبوونێکی ڕەوا دەکرد، ئەو هەستەی کە تەنها عەودالّی کاری مەزن و قارەمانانە بوو.

ئەو دەیتوانی تەنها بۆ ماوەیەکی کورت، ویژدانی خۆی ئاسوودە بکات. لەسەر جلەماینەکەی درێژ بوو، چەندی دەکرا بە جەستە، خۆی لەناو کونە تەنگە بەردینەکە درێژ کرد، بەڵام بە دەروون، لەسەر دۆشەکی پاکی گەسکدراوی روحی، بە هەموو درێژیی جەستەی خۆی، بە ئاسوودەیی راکشا، بە بورژاوی کەوتە هەڵمژینی بۆنە بێگەرد و ناسکەکان: بۆنێکی سووکی بەهاراتیی، وەک بۆنی گیاکەڵەی بەهاران، شنەباییێکی نەرمی مانگی گوڵان، کە تازە بەناو گەڵا ساوا سەوزەکانی سوورەچناراندا هەڵبکات، باییێکی دەریا، مەیلەو سوێر، وەک باویی سوێرکراو. دوا نیوەڕۆییێکی درەنگ بوو، کە واگاهات و خۆی قیت کردەوە، با بڵێین دوانیوەڕۆییێکی درەنگ، چونکە بێ گومان هیچ دوانیوەڕۆ یان پێشنیوەڕۆ یان ئێوارەو سبەینە بوونی نەبوو، هیچ رۆناکی یان تاریکییێک بوونی نەبوو، هەروەهاش هیچ چیمەنی بەهار و گەڵای سەوزی چنار لە ئارادا نەبوون... بێجگە لە بۆنی شتەکان هیچ شتێکی تر لە جیهانی ناوەوەی گرێنویدا نەبوو. (لەبەر هەندێش تەرزە زمانێکی تایبەتیمان پێویستە بۆ قسە کردن لە بارەی ئەو دیمەنە، بێگومان تەنها بە زمانێکی تایبەت دەتوانین باسی ئەو رووداوانە بکەین، چونکە زمانی ئێمەمانان بۆ ئەوە ناشێت، وەسفی جیهانی بۆنەکانی پێ بکەین، یان بەسەرهات و رووداوەکانی جیهانی گرێنوی پێ بگێڕینەوە). کەواتە با وا دابنێین کە دوا نیوەڕۆییێکی درەنگ بوو، وا ناوی بنێین، باشترە بڵێین، بار و ساتەوەختێکی روحی گرێنوی بوو، وەک لە وڵاتانی باشوور، لە کۆتایی خەوی نیوەڕۆ ڕوودەدات، کاتێک هێدی هێدی خەوی نیوەڕۆ کۆتایی دێت و، ژیان خەریکە دیسان دەستپێدەکاتەوە. گەرمی تووڕەو سووتێنەری چرقەی نیوەڕۆ، دوژمنی سەرسەختی کزە بۆنێک، ڕەویەوەو نەما، نەخشەی ئەهریمەن لەناوچوو. بەهەشتەکانی ناوەوە رووت و نەرم و نیان کەوتبوونە ناو ئارامی دوای واگاهاتن و، چاوەڕوانی فەرمانی (خان)یان دەکرد، تا بزانن چیان بەسەر دێت.

گرێنوی خۆی بەرزکردەوە، وەکو دەڵێن، تۆزی خەوی لە چاوەکانی خۆی هەڵتەکاند. بەڵام ناوەوەی مەزنی گرێنوی بە هەموو هەیبەت و مەزنی خۆیەوە هەستایەوە، وەک فەلامەرزێک لەسەر پێیان راوەستا، دیمەنێکی زۆر جوان بوو بۆ تەماشاکردن، بەڵام مەخابن، کەس نەیدەدیت! لێوان لێو لە شکۆ و سەروەری و شانازی، تەماشای چواردەوری خۆی کرد:

بەڵێ! ئەوە مەملەکەتی خۆی بوو! مەملەکەتی تاک و تایبەتی گرێنوی! لەلایەن خودی خۆی، لەلایەن گرێنوی بە تەنێ و بە تایبەتی ئافرێندرابوو، فەرمانڕەواش بە تەنها هەر خۆی بوو، هەر لەلایەن خودی خۆی تەخت و وێران دەکرێت، ئەگەر فەرمان بدات، هەر بە فەرمانی خۆشی دادەمەزرێتەوە، دەتوانیت سنوورەکەی بێ پایان فراوان بکات و بە شمشێری ئاگرینیش دژی ئەو کەسانەی بیانەوێت لێی داگیربکەن، بەرگری لێ دەکات. لێرە جگە لە فەرمانی خۆی، شتێکی تر ناخوات، فەرمانی خاوەنشکۆ، گرێنوی تاک و تەنهاو مەزن و باڵادەست. جا دوای ئەوەی بۆنە بۆگەن و چەپەڵەکانی رابردوو وەڵ بوون و نەمان، دەیویست ئێستا مەملەکەتەکەی پڕ بێت لە بۆنە نایاب و دڵڕفێنەکان. بە هەنگاوی گران و سەنگین کەوتە پیاسە بەسەر ڕاڕەوە بەیارەکانی  و تۆوی بۆنی هەمەجۆری بەسەردا پرژاندن، لە هەندێ جێگە بە گۆڵمی پڕ و دەستکراوەیی و لە هەندێ شوێن بە دەستگری و کابانیی، بەم جۆرە، گۆڵم گۆڵم بێ پایان مێرگ و لاتی گچکەو گەورەی تۆ کرد، جا یان گۆڵمەکانی دەپرژاند، یان دانە دانە لە شوێنی دیاریکراودا دەیخستنە ژێر زەوی. گرێنوی مەزن، باخەوانی بەلەنگاز، سەختترین و لاچەپترین چمک و شوێنی مەملەکەتەی پڕ کرد لە تۆی بۆنەکان، هەر زوو هیچ گۆشەو کەڵێنێک نەما تۆیان بەرنەکەوتبێت.

جا کە دیتی، کارەکەی باش هەڵکەوت و، سەرتاپای وڵاتەکەی تێر بوو لە تۆی خودایی گرێنوی، گرێنوی مەزن لێی گەڕا تا نەرمەبارانێک لە گیانی شەراب بەسەر کێڵگەکانیدا ببارێت، تا بە ئارامی زەویەکان تێراو بوون لە گیانی شەراب، ئیتر لە هەموو لایێک تۆکان چەکەرەیان کرد و گۆپکەیان دەرکرد، گیاکەڵە سەریان دەرهێناو ئەویش دڵی پڕ بوو لە ئاسوودەیی. مێرگەکان گەشانەوە، لاسکی تەڕ و ناسک ڕووی باخچەکانیان داپۆشی. کاسەی خونچە گوڵەکان کرانەوە خونچەکان گەش گەش سەریان لە قاوغی خۆیان دەرهێنا.

لێرەدا گرێنوی فەرمانی راگرتنی بارانەکەی داو باران وەستا. ئەوجا بە خۆری سووکی زەردەخەنەی خۆی رۆناکی پەخشی سەر زەویەکە کرد،

پاشان بە یەکجار لەو ملیۆنەها گوڵ و کوڵیکە جوان و رەنگینانە، لەم بەر تا ئەو بەری مەملەکەتەکەی، تاکە مافوورێکی رەنگاوڕەنگی بۆخۆی چنی، کە لە ملیۆنەها گرێ لە شووشەگوڵاوی

پڕبەها چنرابوو. گرێنوی مەزن دیتی کە مافوورەکە زۆر باش بوو، زۆر زۆر باش. بایێکی هەناسەی خۆی بەسەر زەویەکەدا پوف کرد. گوڵەکان بە ناسکی بۆن وبەرامەکانی خۆیان بەسەر گرێنویدا پرژاندو، ملیۆنان بۆنی خۆش تێکەڵی یەکتری بوون و، هەموو بوون بە تابلۆییێکی بۆنیی بە زریق و باق، کە بە بەردەوامی ڕەنگی دەگۆڕا، بەڵام وەک بۆنێکی خۆشی دلڕفێنی جێگیر، سەرتاپای جیهانی دادەپۆشی، ئەم بۆنە بەسەر گرێنوی تاک و تەنها و مەزندا دەپرژا، ئەویش لەسەر تەختێک کە لە هەورەبۆنی زێڕین داتاشرابوو، دانیشتبوو، بە بۆنکردن لەو بۆنە خۆشەی هەڵدەمژی، بۆن و بەرامەی ئەو قوربانیدانەی پێ خۆش بوو. کڕنووشی دەبرد، بۆ ئەوەی چەندین جار ئافرێنراوەکەی خۆی پیرۆز بکات، ئەویش لە لایەن ئافرێنراوەکەی بە رووخۆشی و ئاهەنگ و بە تایبەتیش بە پرژانی بۆنێکی یەکجار خۆش سوپاس دەکرا. بەو چەشنە بوو بە ئێوارەو، بۆنەکانیش بەردەوام و بە تەوژم بڵاودەبوونەوە و تێکەڵی یەکتری دەبوون و، لە شینایی شەودا دەبوون بە جوانترین ئاواز. ئیتر شەوێکی ڕاستی سەمای بۆنەکان دەستی پێ دەکرد و ئاگرێکی زەبەلاحی بۆنەکان، لە رادەبەدەر قەشەنگ و جوان، بلێسەی دەداو دەدرەوشایەوە. بەڵام گرینۆی مەزن کەمێک ماندوو ببوو، باوێشکی دەهاتێ و قسەی دەکرد: "تەماشا بکە، من کارێکی چەند مەزنم ئەنجام داوە، ئەو کارەم لا زۆر پەسندە، بەڵام وەک هەر شتێکی تر کۆتایی دێت، خەریکە بێزار دەبم، من دەمەوێ هەستم، لە کۆتایی ئەو رۆژە پڕ کارە، بگەڕێمەوە ژوورەکانی دڵم و کەمێکی تر ئاسوودە ببم."

کەواتە گرێنوی مەزن فەرمانی دا، بەم جۆرە لە کاتێکدا کە گەلی سادەی بۆنەکان بە خۆشحاڵیەوە لە ژێرەوە سەمایان دەکرد و ئاهەنگیان دەگێڕا، گرێنوی باڵەکانی خۆی بە فراوانی ئاوەلاکردبووەو، لە هەورە زێڕینەکانەوە بەرەو خوارەوە، دادەبەزیە سەر زەوی سروشتی رۆحی خۆی، بەرەو ماڵەکەی ناو دڵی.

## ٢٧

پێی خۆش بوو، کە بەرەو ماڵەکەی دەگەڕێتەوە! بەرەو کۆشکی تۆڵەسێن و دونیائافرێن، کە شوێنێکی خراپ نەبوو بۆ قەرەبووکردنەوە، ئەگەریش چەند دەمژمێرێک ئازادبوون لە ئافرێندراوەکانی، پشووێکی پوخت و بێ گەرد نەبوو. بەڵام بەهۆی شەکەتی ئەرکی خودایی و ئەرکی ئافراندن و نوێنەرایەتی، گرێنوی مەزن غەریبی خۆشییەکانی ماڵەوەی کردبوو.

دڵی گرێنوی کۆشکێکی ڕەنگاوڕەنگ بوو. کەوتبووە ناو سارایێکی بەردەڵان، باهۆز بە شاخێک لە زیخی بیابان داپۆشیبوو، لە پشت حەوت دیواری بەردین، دەورەگیرابوو بە مێرگێکی زۆنکاوی. تەنها بە فڕین دەکرا بگەیت بەو شوێنە. ئەو کۆشکە هەزار هۆدەی هەبوو، هەزار سەردابی هەبوو، هەروەها هەزار هۆڵی رازاوەی هەبوو، لە یەکێک لەو هۆڵانەدا قەنەفەیەکی ساکاری رەنگاوڕەنگ دانرابوو. گرێنوی، کە چیتر گرێنوی مەزن نەبوو، بەڵکو هەر گرێنویێ خاکییەکەی جاران بوو، یان ئاسانتر بڵێین جۆن پاتیست گرێنوی بوو، لە خەستەیی کاری رۆژ، بۆ پشوودان خۆی خستبووە ناو ئەو قەنەفە ساکارە.

بەڵام هۆدەکانی کۆشکەکە پڕ بوون لە هەرزاڵە، لە زەویەوە تا میچەکانیان، هەموو بۆنەکان، ئەوانەی کە گرێنوی لە هەموو ژیانی خۆی کۆی کردبوونەوە، لە ناو ئەو هەرزاڵانە دانرابوون، چەندین ملیۆن بۆن دەبوون. ژێرزەمینەکانی کۆشکیش پڕ بوون لە بەرمیل، کە باشترین بەرامەبۆنی ژیانی گرێنوییان تێدا هەڵگیرابوو. کاتێک ئەو بەرامەبۆنانە پێ دەگەیشتن دەخرانە ناو شووشەو لە ڕاڕەوێکی شێداری فێنکی چەندین کێلۆمەتر درێژ دادەندران، بەپێی ساڵ و تەمەنیان ریز دەکران، ئەمانە ئەوەندە زۆربوون، کە ژیانێکی تەواو بەشی نۆشکردنی هەمووی نەدەکرد.

ئەوجا جۆن پاتیست گرێنوی خۆشەویست هاتەوە، گەیشتەوە ناو ماڵەکەی خۆی، لە هۆڵە ڕەنگاوڕەنگەکە، خۆی خستە ناو قەنەفە ساکارەکە، پۆتینەکانی لە پێ داکەند،

ئەگەر بشێت ناوی بنێین پۆتین، چەپڵەی کوتاو بانگی خزمەتکارەکانی کرد. دەست لەسەر سینگ: بەڵێ قوربان؟ بەڵێ قوربان؟

ئەو خزمەتکارانە نەدەدیتران، نابەرجەستە بوون و نەدەگیران، نەدەبیستران، لە هەمووانیش گرنگتر بێ بۆن بوون بۆن نەدەکران، کەواتە بەتەواوی خزمەتکاری ئەندێشەیی بوون. گرێنوی فەرمانی دەدا، بچن بۆ ژوورەکان و لە کتێبخانە گەورەکەی بۆن و بەرامەکان، فلانە کتێب یان فلانە بەندەکتێبی بۆ بێنن و بچن بۆ سەردابەکان خواردنەوەی بۆ بهێنن. خزمەتکارە ئەندێشەییەکان بەلەز دەچوون، گرێنویش بە تەنگەتاوی و بە هەشتاوی گەدەی خۆی وێکدێنایەوە و چاوەڕوانی دەکرد. لە ناکاوێک، وەک کەسێک کە خووی بە خواردنەوەوە گرتبێت، ترسی ئەوە دایدەگرت، داخوازیەکەی بە هۆیێک لە هۆیەکان، رەت بکرێتەوەو بادە شەرابەکەی بۆ نەهێنرێت. چی دەکات ئەگەر سەرداب و هۆدەکان هەموو خاڵی بوون؟ چی دەکات ئەگەر شەرابی ناو بەرمیلەکان هەموو تێکچووبن؟ بۆچی خزمەتکارەکان دوا کەوتن؟ بۆ ناتوانن دەستبەجێ بگەڕێنەوە؟ ئەو هەر ئێستا ئاتاجی شەرابە، زۆر تێنووی خواردنەوەیە، ئەو خووی بە مەینۆشیی گرتبوو، ئەگەر شەرابی نەگەیەننێ. ئەوا دەستبەجێ لە جێگەی خۆی گیان دەدات.

بەڵام جۆن پاتیست ئارام ببە! خۆشەویست سەبرت هەبێت! ئەوە دێن، بەڵی ئەوە دێن، ئەوەت بۆ دێنن، کە تۆ ئارەزەووی دەکەیت. ئەوە خزمەتکاران هاتنەوە، لەسەر سینیێکی نادیار کتێبی بۆنەکانیان بۆ هێنای، بە دەستی نادیاری بە پەڕۆی سپی داپۆشراویان گۆزە گرانبەهاکانیان هەڵگرتووە، ئەوا دەیخەنە بەردەمت، زۆر بە ئاگایی، کڕنووش دەبەن و بزر دەبن.

ئۆخەی! باش بوو، دیسان بە تەنها جێیان هێشتم! جۆن پاتیست دەستی برد بۆ باشترینی بۆنەکان، شووشەی یەکەمی کردەوە، پەرداخێکی لێوان لێوی بۆخۆی لێ پڕ کرد، خستیە سەر دەمی و نۆشی کرد. گلاسێک بۆنی فێنکی بە یەک هەناسە خاڵی کرد، بادەیەکی زۆر بە چێژ بوو! نەشئەبەخش بوو، زۆر پوخت بوو، وەک ئازادی بە تام بوو، لە خۆشییان جۆن پاتیستی خۆشەویست موچڕکی هاتێ و ئاوی لەچاو قەتیس ما، یەکسەر گلاسی دووەمی لەو بۆنە پڕ کرد: بۆنێکی دێرین بوو، لە ساڵی ۱۷۵۲-وە دایکردبوو، زۆر زوو، لەو ساڵە، لە کاتی رۆژئاوابوون، لەسەر پردی رۆیال، کاتێک رووی لووتی لە رۆژئاوا کردبوو، لەو شوێنەی شنەباییێکی سووک دەهات، بۆنی دەریاو دارستانی لەگەڵ کەمە بۆنێکی قەترانی کەشتییەکان تێکەڵ بەیەک دەکرد و دەیهێنایە دەم کەنار. ئەوە دوایین کاتی یەکەمینی ئەو شەوانە بوو، کە بەبێ مۆلەت وەرگرتن لە گریمال، بە پیاسەو گەڕان، لێرەو لەوێ، لە پارس بەسەری

دەبرد. ئەوە بۆنێکی فێنک و تازەی ڕۆژی دوایی بوو، بۆنی شەبەقی بەیانی دوای ئەو شەوە بوو، کە بە ئازادی ژیانی تێیدا بەسەر برد بوو. ئەوە بۆنی ناسکی تاریکورونی ڕۆژێکی نوێ بوو، بۆنی ئازادی بوو. ئەوێ ڕۆژێ ئەو بۆنە ئەوی بە تامی ئازادی ئاشنا کرد، بە تامی جۆرە ژیانێکی تر. بۆنی ئەوێ سبەینێ بوو، بۆ گرێنوی بۆنی هیواو ئاواتەکان بوو. زۆر بە ئاگایی ئەو بۆنەی پاشەکەوت کردبوو. هەموو ڕۆژێک لەو بۆنەی دەخواردەوە.

دوای ئەوەی پێکی دووەمیشی نۆش کرد، هەموو دەمارگرژی و ناڕەحەتییەکی توایەوە، دوودڵی و دڵەڕاوکێی لێی تەکینەوە، هەموو جەستەی پڕ بوو لە ئارامی و ئاسوودەیی. پشتی خۆی دایە سەر پشتۆکی نەرمی قەنەفەکە، کتێبێکی واڵاکردەوە دەستی کرد بە خوێندنەوەی بیرەوەریەکانی. بۆن و بەرامەکانی سەردەمی منداڵی خۆی خوێندەوە، بۆنەکانی قوتابخانەکە، بۆنەکانی جادەو کون و قوژبنەکانی شار، بۆنی مرۆڤەکان. بارانێکی خۆش بەسەریا داباری، چونکە بەڕاستی ئەمانە بۆنە ناهەموارەکان بوون، بۆنە قێزەونەکان، دەهاتنەدەرەوەو لەوێ دەردەکەوتن. بە مەراقێکی بەقێزەوە گرێنوی ئەو بۆنە قێزەونانەی لەم کتێبە دەخوێندەوە، کاتێکیش ئیرادەی بەسەر مەراقەکەی زاڵ دەبوو، ئەو کتێبەی وەلا دەناو یەکێکی تری هەڵدەگرت.

لە پاڵ ئەمەشدا بێ وچان لە بۆنە نایاب و خانەدانەکانی دەخواردەوە. دوای داچۆڕینی شووشەی بۆنی هیواکان، تەپەدۆری شووشەیەکی ساڵی ١٧٤٤ی هەڵپچراند، کە پڕ بوو لە بۆنی گەرمی داری بەردەم ماڵەکەی مادام گایارد. دوای ئەوەش شووشەیەک بۆنی هاوینەئێوارەیەکی نۆش کرد، بۆنی عەتر و گرانگوڵی قەراغی باخچەیەکی سانت گێرمە دی برێس ئاننۆ، هی ساڵی ١٧٥٣ ئەو ناوەی پڕ کرد.بە خەستی هەموو جەستەی پڕ بوو لە بۆنەکان. ئەندامەکانی وردە وردە گرانتر ڕۆدەچوونە ناو قەنەفەکە. تەمی شەراب بە جوانی گیانی داپۆشی بوو، بەڵام ئەو هێشتان نەگەیشتبووە کۆتایی ئەو ژەمە. ڕاستە چاوەکانی چیتر توانای خوێندنەوەیان نەبوو، دەمێک بوو کتێب لە دەستەکانی خزابوونە خوارەوە، بەڵام ئەو نەیدەویست کۆتایی بەم ئێوارەیە بهێنێت، بەر لەوەی دوا شووشەی بۆنە یەگجار خۆشەکە خاڵی نەکات: ئەوەیان بۆنی کیژەکەی شەقامی ماری تێدا بوو... بە هەموو ئەندێشەی خۆیەوە ئەو شووشەیانی نۆش کرد، بەر لەمە بە ڕێکی لەسەر قەنەفەکە دانیشت، هەرچەندە بەم حاڵەی ئەوە ئاسان نەبوو، چونکە لەگەڵ هەر جووڵەیەکی هۆڵە ڕەنگاوڕەنگەکە لەبەر چاوی وەک جۆلانە دەهات و دەچوو، دەسووڕایەوە. ئەژنۆکانی خۆی کوشییە سەریەکتری، پێیەکانی بە یەکتریەوە قرمساند، دەستێکی خستە سەر رانی چەپی،

ئەوجا گرێنوی ئەو بۆنە بە چێژ و گرانبەهایەی ناو ژێر زەمینی دڵی نۆش کرد، پێک دوای پێک، لەگەڵ هەر قومێک و هەر پێکێک خەمبارتر دەبوو. دەیزانی زۆری خواردۆتەوە. دەیزانی کە بەرگەی ئەو هەموو بۆنە خۆش و باشانە ناگرێت. لەگەڵ ئەوەش هەر خواردیەوە، تا شووشەکە خاڵی بوو: بە ناو جادە تاریکەکاندا رۆیشت، بەرەو حەوشەی دواوە. چووە بەردەم رۆناکی مۆمەکە. کچەکە دانیشتبوو هەڵووژەی زەردی کووز دەکرد. لە دوورەوە دەنگی تەلقەتەنوور و راکێتان دەهات...پەرداخەکەی دانا، بەڵام هەر لە شوێن خۆی مایەوە، مەست و سەرخۆش، گێژ، دەتگوت بووە بە بەرد، چەند دەقیقەیەک ئاوا دانیشت، تا ئەو کاتەی دوا تنۆکی چێژی شەرابەکە لە دەمیدا چکی کرد. لە شوێنی خۆی گۆد ببوو. لە ناکاوێک مێشکیشی وەک شووشەکان خاڵی بوون. ئینجا بەلاداهات، لە تەنیشتەوە کەوتە سەر قەنەفە رەنگاورەنگەکەو لە خەوێکی بەنگاویدا نقووم بوو.

لە هەمان کاتدا گرێنوی دەرەوەش لەسەر جلە ماینەکەی خەوی لێ کەوت. خەوی ئەویش وەک خەوی گرێنوی ناوەوە، خەوێکی خەست و قووڵ بوو، چونکە ماندووبوون و شەکەتی گرێنوی دەرەوەش بەو کارە پاڵەوانبازییانە لە هی گرێنوی ناوەوە، کەمتر نەبوو. خۆ لە راستیشدا هەردووکیان هەر یەک بوون و، هەمان کەس بوون.

بەڵام کاتێک واگا هات، لە ناو هۆڵی رەنگاورەنگی کۆشکە بە زریقوباقەکەو لە پشتی حەوت دیواری بەردین واگا نەهات، هەروەها لە ناو ماجەرای بەهاری رۆحی خۆی بەخەبەر نەهات، بەڵکو تاک و تەنها لەناو گەوەرە بەردایەکەی و لە کۆتایی تونێلەکە لەسەر عاردی رەق و تەق و لە تاریکییەکی ئەنگوستەچاو واگا هات. لە برسان و لە تێنان زگی ژانی دەکرد، داماو هەژار وەک هەر بادەنۆشێکی بە بادە خووگرتوو، دوای شەوی خواردنەوە. بە هەرچوار پەلی خۆی بەناو ئەشکەوتەکەدا خشی.

لەدەرەوی ئەشکەوتەکە کاتێک لە کاتەکانی رۆژ بوو، پتر بە دەستپێک یان کۆتایی شەوێک دەچوو، بەڵام خۆ ئەگەر نیوەشەویش بووایە، ئەوا تیشکی ئەستێرەکان وەک دەرزی دەچەقینە چاوەکانی. وا هەستی کرد کە هەواکەی تۆزاوییە، تیژە، سییەکانی دەسووتاندەوە، دیمەنێکی دڵڕەق، خۆی هاویشتە سەر بەردەکان. تەنانەت ناسکترین بۆن بە توندی کاری لێ دەکرد، کونەلووتەکانی دەزووراندەوە. گرێنوی، گەنەکە، زۆر هەستیار ببوو، وەک قرژاڵێک، کە قەپێلکی خۆی جێهێشتبێت و بە ڕووت و قووتی بەناو دەریادا بگەڕێت.چووە سەر چاوگی ئاوەکە، شوێنە تەڕەکە، زمانی بە بەردە تەڕ و شێدارەکە دادەهیناو بەردەکەی دەلستەوە، یەک، دوو دەمژمێری تەواو. ئەوە ئەشکەنجەدانێک بوو، دەمێکی بێ کۆتایی بوو، دەمێک بوو، دەتگوت تێیدا دونیای

راستیی لەسەر پێستی دەسووتێنن. چەند پنچکە گیاییێکی لە بەردەکان هەڵپچراند، لەناوەوەی خۆی دەپەستاو، بە لەز ئاودیوی دەکردن، لەسەر چیچکان دانیشت، لەکاتێکدا قەوزەکانی هەڵدەلووشی، لەهەمان کاتدا خۆی خاڵی دەکرد "زوو کە، زوو کە، دەی! دەبێت هەمووی زوو کۆتایی بێت"، دەتگوت ڕاویان ناوە، وەک زیندەوەرێکی گۆشتینی نەرم، کە لە هەواوە داڵ و باشووکە لە دەوری بسووڕێن و بیانەوێت ڕاوی بکەن، بە خێرایی گەڕاوە ناو ئەشکەوتەکەی خۆی و تا کۆتایی کونەکەی نەوەستا، تا ئەو شوێنەی کە جلەماینەکەی لێ ڕاخرابوو. ئۆخەش دیسان لێرە هەست بە دڵنیایی دەکات.

پشتی خۆی دایە قۆمەتی بەردەکان، قاچەکانی درێژ کردن و کەوتە چاوەڕوانی. ئێستا پێویستە جەستەی خۆی بە تەواوی ئارام ڕاگرێت، ئارام ئارام، بێ هەست بێ خوست، وەک بەرمیلێک کە لەبەر شلەقانی زۆر، مەترسی ئەوەی لێ بکرێت لێی بڕژێت. وردە وردە توانی جلەوی هەناسەدانی خۆی بەرزەفت بکات. لێدانی دڵی هەڵچووی ئارامتر بووەوە، شەپۆڵەکانی ناوەوەی هێدی بوونەوە. لە پڕێک تەنهایی وەک پارچە ئاوێنەیەکی ڕەش کەوتە روح و هەستی. چاوەکانی خۆی قوچاند. دەروازە تارییکەکانی ناوەوەی خۆی واڵا کرد، چووە ناوەوە. شانۆگەرییێکی تری روحیی گرێنوی دەستیپێکرد.

## ٢٨

بەو جۆرە هەموو رۆژ و هەموو هەفتەو هەموو مانگەکانی لێ گوزەرا. گرێنوی حەوت ساڵی تەواوی ئاوا بەسەربرد.

لە ماوەی ئەو حەوت ساڵەدا لە جیهانی دەرەوە جەنگ قەوما، جەنگی جیهانیی. لە شلێزیەن و زاکسن، لە هانۆڤەر و بەلچیکا، لە بوێمن و لە پۆمێرن، کوشتن و پێکدادان قەوما. لە هێسن و لە ڤێستفالن، لە بالێریەن، لە هیندستان، لە میسیسپی، لە کەنەدا، سەربازەکانی پاشا کوژران و لەناوچوون، ئەگەر لە رێگا بە نەخۆشی لەرز و تا نەمردبن. یەک ملیۆن مرۆڤ لەم جەنگە گیانیان لەدەستدا، پاشای فەرەنسا ئیمبراتۆریەتی کۆلۆنیایی خۆی لەدەستدا، هەموو ئەو وڵاتانەی کە لە جەنگیشدا بەشداربوون، ئەوەندە پارەیان زیان پێکەوت، کە لە ئاکامدا بە ناچاری و بە دڵێکی گران، بڕیاری کۆتایی هێنانی جەنگەکەیان دا.

لەو کاتانەدا بوو، گرێنوی بێ ئەوەی بۆخۆی هەستی پێ بکات، جارێکیان خەریک بوو لە ناو سەرماوسۆڵی زستانێکدا ببێتە شەختەو ڕەق هەڵێت. پێنج رۆژی رێک کەتبووە ناو کۆشکە ڕەنگاوڕەنگەکەی، کاتێکیش کە لەناو ئەشکەوتەکەی واگا هات، لە سەرمان نەیدەتوانی لە جێی خۆی بجووڵێت. یەکسەر دیسان چاوی خۆی قوچاندەوە، بۆ ئەوەی ئەم جارە بۆ مردن بخەوێت. بەڵام زستان تووشی شکەست بوو، جەستەی توایەوەو لە مردن رزگاری بوو.

جارێکیان بەفر ئەوەندە باری بوو، ئەوەندە لەسەر یەک کەڵەکە ببوو، ئیتر توانای پێ هەڵگەڕانی نەبوو، بچێتە دەرەوەو خۆ بگەیەنێتە پنچکە گیاکان. دەستی کرد بە کرۆشتنی ئەو شەمشەمەکوێرانەی، کە لە سەرمان ببوون بە شەختە.

جارێکیان قەڵەباچکەیەکی مردار بووی لەبەر دەم ئەشکەوتەکە دۆزیەوە، دەستی کرد بە خواردنی. ئەوانە تاکە ڕووداو بوون، کە لە ماوەی ئەو حەوت ساڵە ئەویان بە دونیای دەرەوە بەستبووەوە. ئەگەر نا ژیانی لە دەروونی شاخەکەو لە ناو مەملەکەتی روحی خۆی بردە سەر، ئەو مەملەکەتەی کە ئافرێندراوی خۆی بوو. خۆ ئەگەر ئەگەر هیچ کارەساتێک رووی نەدابایەو لە شاخەکەیان وەدەر نەنابەیە، ئەوا هەتا کۆتایی مەرگیشی هەر لەوێ دەمایەوە، (چونکە لە هیچ شتێکی کەم نەبوو).

## ٢٩

کارەساتەکە بۆمەلەرزەیەکی زەوی نەبوو، سووتانی دارستان نەبوو، خزین و هەرەسی شاخ نەبوو، هەروەها دارمانی ئەشکەوتەکەشی نەبوو. هیچ جۆرە کارەساتێکی دەرەکی نەبوو، بەڵکو کارەساتێکی ناوەکیی بوو، هی ناوەوەی خۆی. ئەو کارەساتە زۆر شلەژێن و نەگونجاو بوو، چونکە ئیتر ڕێگای هەڵاتنی لە گرێنوی گرت. ئەو کارەساتە لە کاتی خەوتندا، یان باشتر وایە بڵێین لە خەوندا ڕوویدا. لەمەش باشتر لە خەونی خەویدا لە ناو دڵی ئەندێشەکانیدا.

لەسەر قەنەفەی ناو هۆڵە ڕەنگاوڕەنگەکەی دانیشتبوو. دەوروبەری پڕ بوو لە شووشەی خاڵی. یەگجار زۆری خواردبووەوە، لە کۆتایی هەموو خواردنەوەکەی، دوو شووشەی لە بۆنی کیژە قژ سوورەکە نۆش کردبوو. لەوانەیە ئەمە زۆر بوو بێت، چونکە نووستنەکەی وەک قووڵاییێکی مەرگاوی بوو، ئەم جارە خەوەکەی بێ خەون نەبوو، بەڵکو نووستنێک بوو پڕ لە خەوی تارماییاوی و جناوی. تارماییەکان بە ئاشکرا دەناسرانەوە، بریتی بوون لە تیلمی بۆنەکان. ئەو تارماییانە لە سەرەتا وەک رووبەری تەنک و سووک بە لای لووتی گرێنوی تێدەپەڕین، پاشان هێدی هێدی چڕتر دەبوون و شێوەی هەوریان وەردەگرت. تا وای لێ دەهات وەک ئەوەی لە ناوەندی زەوییێکی مرداو وەستا بێت، هەڵم و هاڵاو لە مرداوەکە بەرز دەبووەوە. هەور و هاڵاوەکە هێدی هێدی بەرز دەبووەوە. تا دەوری گرێنوی بە تەواوی بە تەم دەگیرا، نقوومی ناو تەم دەبوو، لە ناو چینی تەمەکان هیچ هەواییێکی ئازاد نەدەما. بۆ ئەوەی نەخنکێ بە ناچاری هەناسەی لەو تەمەدا هەڵدەمژت. بەڵام تەمەکە وەک بڵێی بۆنێک بوو. گرێنوی دەیزانی ئەمە چ بۆنێکە. بۆنەکە بۆنی خودی خۆی بوو. ئەو تەمە بۆنی خۆی بوو، بۆنی گرێنوی.

ئەوجا ئەوەی لەم خەونەیدا لە هەمووی سامناک تر بوو، ئەوە بوو، لەگەڵ ئەوەی کە گرێنوی دەیزانی ئەو بۆنە بۆنی ***خۆیەتی*** و، و بۆنی خۆشی بێ بۆنەو ناکرێت بۆنی بێت و،

لەوانەش بوو بە تەواوی نقوومی ناو خۆی، نقوومی ناو بۆنی خودی خۆی بێت و، ئەو حەلە هەموو شتێکی دونیا بۆ ئەو بێ بۆن دەبوو!

کە بە تەواوی ئەمەی بۆ ڕۆشن بووەوە، لە ترسان بە هەموو هێزی خۆی هاواری کرد، وەک ئەوەی کە بە زیندوویی بیخەنە ناو ئاگر و بیسووتێنن. هاوارەکەی دیوارەکانی هۆڵە

ڕەنگاوڕەنگەکەی کونبەدەر کرد، دیوارەکانی کۆشکی بڕی، لە ناو دڵەوە دەرپەڕی و بەسەر چاڵ و زۆنکاوەکاندا تێپەڕی، وەک گەرداوێکی ئاگرین بە تەوژم بەسەر دەشت و دەرەکانی روحیدا زریکاندی، لە دەمیدا دەرچوو، وەک لە ئەشکەوتەکەوە گرماندی و وەک هاواری چیاکە نەوەستا تا گەیشتە سەر بەرزاییەکانی سانت فلێر. کە لەخەو راپەڕی پەلەکوتێی بوو، بە دەست و پێیەکانی دەوروبەری خۆی دەکوتی، وەک ئەوەی بیەوێت ئەو تەمە بێ بۆنە لەخۆی دوور بکاتەوە، کە خەریک بوو تێیدا دەخنکا. زەندەقی چوو بوو، لە ترسان هەموو جەستەی وەک بینای ئاو دەلەرزی. ئەگەر هاوارەکەی تەمەکەی دانەدڕیبا، ئەوا خۆی لە ناو خودی خۆیدا دەخنکاو، ئەمەش بۆ ئەو مەرگێکی سامناک بوو. کە بیری لەمە دەکردەوە، هەموو گیانی سڕ دەبوو، موچڕکی دەهاتێ. لە کاتێکدا هێشتان بە لەرزین، دانیشتبوو، هەوڵیدەدا ئەو خەیاڵە تەماوی و ترساناکەی خۆی کۆبکاتەوە، شتێکی بە تەواوی لا رۆشن بوو: ئیتر پێویستە ژیانی خۆی بگۆڕێت، هەر نا لەبەر ئەوەی ئەو نایەوێت جارێکی تر خەونێکی ئاوا سامناک ببینێت. ئەو جارێکی تر بەرگەی خەونێکی ئاوا ناگرێت.

جلەماینەکەی خستە سەر شانی و بەرەو دەرەوەی ئەشکەوتەکە خزی. تازە لەدەرەوە پێشنیوەڕۆ بوو، پێشنیوەڕۆییێکی مانگی شوبات. رۆژ بەدەرەوە بوو. شوێنەکە بۆنی بەردی شێدار و قەوزەو ئاوی لێ دەهات. هەوا کەمێک بۆنی گوڵاڵەی لێ دەهات. لەبەردەم ئەشکەوتەکە لەسەر چیچکان هەڵکڕووکا. تیشکی رۆژ لەشی گەرم کردەوە. هەوای تازەی هەڵمژی. هێشتان کاتێک تەمەکەی دەهاتەوە بیر سامی لێ دەنیشت، ئەو تەمەی لێی هەڵاتبوو، کاتێکیش هەستی بە گەرمایی تیشکی رۆژ دەکرد، کە دەکەوتە سەر پشتی، لە خۆشییان سەرسام دەبوو. باش بوو، هێشتان دونیای دەرەوە ماوە، تەنها بۆ ئەوەی وەک پەناگایێکی تر خۆی تێدا حەشار بدات. ناتوانرێ بیهێنینە بەرچاوی خۆمان، کاتێک گەیشتە دەروازەی ئەشکەوتەکە، ئەگەر بهاتبایە هیچ دونیایێک نەمابایە، بارێکی چەندە وەحشەتناک دەبوو بۆی! هیچ رۆناکییەک، هیچ بۆنێک، هیچ شتێک نا، تەنها هەر ئەو تەمە سامناکە، ناوەو دەرەوەو هەموو لایێکی داگیرکردبایە...

هێدی هێدی ترسەکەی ڕەویەوە. وردە وردە ژەهری ترسەکە سووک بوو، وردە وردە گرێنوی هەستی بە دڵنیایی کرد. بەرە بەری نیوەڕۆ هاتەوە سەر باری خوێنساردی خۆی. پەنجەی ئاماژەو ناوەڕاستی خستە بەر لووتی و لە نێوانیاندا هەناسەی هەڵمژی. بۆنی شێدار و گوڵاوی هەوای بەهاری کرد. پەنجەکانی خۆی هیچ بۆنێکییان لێ نەهات. ئەوجا باسکە قووچاوەکانی خۆی گرژ کردو قۆڵی کراسەکەی خۆی هەڵکرد، لووتی خۆی خستە ناو چاڵی نێوان مەچەک و بازوویی و

بۆنی کرد. دەیزانی کە ئەوە ئەو شوێنەیە کە هەموو مرۆڤێک بۆ هەڵمژینی بۆنی خۆیان بۆنی دەکەن. بەڵام ئەو بۆنی هیچی نەکرد. بنهەنگڵی خۆی بۆن کرد، پێیەکانی، ناوگەڵی، تا ئەو ڕادەیەی توانی خۆی بچەمێنێتەوە، بەڵام هەستی بە هیچ بۆنێک نەکرد. حەپەسابوو: ئەو، گرێنوی، دەیتوانی چەندین میل دوور بۆنی مرۆڤەکانی تر بکات، بەڵام نەیدەتوانی بۆنی ناوگەڵی خۆی بکات، کە چەند بستێک لە لووتی دوور بوو! بەڵام تووشی شڵەژان نەبوو، لەسەرەخۆ بیری کردەوە، وا بیری کردەوە: "ئەوە وا نیە کە من هیچ بۆنێکم لێ نایێت و بێ بۆنم، چونکە هەموو کەسێک بۆنێکی هەیە. ئەوە نەبێت، کاتێک من بۆنی خۆم دەکەم، هەست بە بۆنی خۆم ناکەم، چونکە من هەر لەسەردەمی لەدایکبوونمەوە، شەو ڕۆژ بەردەوام بۆنی خۆمم هەڵمژتووەو لووتم بە بۆنی خۆم، بۆ بۆنی خۆم کوڵ بووە. ئەگەر بمتوانیبایە بۆنی خۆم، یان هەر نا هەندێک لە بۆنی خۆم، لە خۆم دووربکەمەوەو دوای ماوەیەک خۆم لە دووری بۆنەکە ڕابهێنابایە، ئەوجا بچووبام بۆنەکەم بۆن بکردبایە، ئەوسا بێگومان دەمتوانیی خۆم هەست بە بۆنی خۆم بکەم."

جلەماینەکەی فڕێ دا، کراسەکەی، یان ئەو پارچەو تیلمە جلانەی کە لەبەری مابوون، لەبەر خۆی داکەندن. حەوت ساڵ بوو ئەمانەی لە لەشی خۆی دوور نەکردبوونەوە. دەبوو ئەو جلانە پڕ بووبان لە بۆنی خۆی. هەمووی لەبەردەم ئەشکەوتەکە کەڵەکەی سەر یەکتری کردن و لێیان دوور کەوتەوە. ئەوجا بۆ یەکەمین جار دوای ئەو حەوت ساڵە چوو بەسەر شاخەکەدا هەڵگەڕا، لەوێ لە هەمان ئەو شوێنە وەستا، لەو جێیەی کە لە کاتی گەیشتنی بەو شاخە، لەسەری وەستا بوو. لووتی خۆی بەرەو ڕۆژئاوا ڕاگرت، لەشی رووتی خۆی دایە بەربا. نیازی ئەوەی هەبوو، تەواوی جەستەی خۆی بە بای ڕۆژئاوا، واتە بە بۆنی دەریاو چیمەنی شێدار، تێر تێر بشوات، تاکو بۆنی دەریا بەسەر بۆنی جەستەی خۆی زاڵ ببێت و جوداییێک لە نێوان خۆی، واتە گرێنوی و، جلوبەرگەکانی بێتە ئارا، بەڵکو بتوانێت بە ڕۆشنی هەست بەو جوداییە، واتە بە بۆنی جەستەی خۆی بکات. بۆ ئەوەی تا دەکرێت کەمتر بۆنی خودی خۆی بچێتە ناو لووتی، بەشی سەرەوەی جەستەی خۆی بەرەو پێشەوە چەماندەوە، ئەوەندەی پێی کرا ملی خۆی درێژ کردو، لووتی خۆی بەرەو رووی با بڵندکردەوەو، بازووەکانی بەرەوە پشتەوە درێژ کرد. هەر دەتگوت مەلەوانێکەو دەیەوێت بازبداتە ناو ئاو.بەو بارە عەنتیکەیە چەند دەمژمێرێک دانی بەخۆیدا گرت، بە جۆرێک پێستی، کە سەرەڕای ئەوەی دەمێک بوو بە هۆی بێ هەتاویی سپی ببوو، لەبەر ئەو هەتاوە کزە وەک تەماتە سوور ببووەوە. بەرە بەری ئێوارە بەرەو ئەشکەوتەکە شۆڕ بووەوە خوارەوە. لە دوورەوە جلوبەرگە کەڵەکەبووەکانی خۆی کەوتە بەرچاو، لە دووری چەند مەترێک لووتی خۆی

گرت و، ئەو کاتەی گەیشتە جلوبەرگەکانی و خۆی بەسەردا نەوی کردن، ئەوجا لووتی خۆی کردەوە. ئەزمایشێکی بۆنی جلەکانی کرد، وەک چۆن لە لای بالدین فێری ببوو ئاوا، لە هەوادا هەڵی تەکاندن و لێ گەڕا هێدی هێدی بۆنەکەی بۆ بێت. بۆ ئەوەی بۆنەکە بەر لووتی خۆی بگرێت، هەر دوو دەستی خۆی لە شێوەی زەنگوڵێک گرت و لووتی خۆی وەک بەندۆڵێک خستە ناوی. بە هەموو بارێک هەولی دا کە لەو جلوبەرگانەوە بۆنی خۆی بکات. بەڵام ئەو بۆنەیان تێدا نەبوو. زۆر بە ڕۆشنی تێیاندا نەبوو. هەزاران بۆنی تریان تێدا بوو. بۆنی بەرد، زیخ، گیا، قەوزە، چەسپ، خوێنی قەڵەباچکان، تەنانەت بۆنی ئەو کاڵباسەی کە بەر لە چەندین ساڵ لە نزیک ئاوایی سۆڵی کڕیبووی، زۆر بە ڕۆشنی هەستی پێ دەکرا. جلوبەرگەکانی دەتگوت دەفتەرێکی بیرەوەری بۆنەکانی حەوت، هەشت ساڵی رابردوون. تەنها بۆنی خۆی، بۆنی گرێنویان تێدا نەبوو، واتە بۆنی ئەو مرۆڤەی کە حەوت ساڵ بێوچان ئەو جلوبەرگانەی لەسەر جەستەی خۆی هەڵگرتبوو.

کەمێک هەستی بە گێژی دەکرد. رۆژ بەرەو ئاوابوون دەچوو. بە ڕووت و قووتی لەبەردەم ئەشکەوتەکە وەستا بوو، ئەو ئەشکەوتەی حەوت ساڵی تەواو لە بنەبانە تاریکەکەی ژیانی بەسەر بردبوو. باییێکی سارد دەهات، خەریک بوو دەبوو بە شەختە، بەڵام هەستی پێ نەدەکرد، کە سەرمایەتی، چونکە شتێکی دژ بە سەرمای لە ناو جەستەدا بوو، ئەویش ترس بوو. ئەوە هەمان ئەو ترسە نەبوو، کە لە خەوەکەی تووشی هاتبوو، ترسی سامناکی خنکان لە ناو خۆیدا، ئەوەی ئێستا هەستی پێ دەکرد، ترسی نەناسینی خۆی بوو. ئەو ترسە بەرامبەر ترسەکەی تر وەستا. ئەو نەیدەتوانی لەو ترسە ڕابکات، بەڵکو دەبووایە ڕووبەڕووی بووەستێتەوە. ئەو دەبووایە بزانێت، پێویست بوو هەر ئێستا دەمودەست و بە دڵنیایی بزانێت، کە ئایا ئەو هیچ بۆنێکی هەیە یان نا، ئەگەریش ئەو زانیارییە زۆر سامناک بوو بۆی. گەڕایەوە ناو ئەشکەوتەکە. دوای چەند مەترێک تاریکیێکی ئەنگوستەچاو دەوریان گرت، بەڵام لای ئەو وەک رۆژی ڕۆناک وا بوو. چەندین هەزاران جار ئەو رێگەیەی تەی کردبوو، شارەزای هەموو کون و قوژبنێکی ببوو، لە دوای هەر هەنگاوێکدا بۆنی بەردێکی شۆڕبووەوەی بانەکەی، یان بەردێکی دەرپەڕیوی ئەملاو ئەو لای دەکرد. دۆزینەوەی رێگا بۆ ئەو دژوارییێکی تیدا نەبوو. ئەوە دژوار بوو کە تەم و هاڵاوی خەونە وەحشەتناکەکەی دەهاتەوە بەرچاو، چەند بەرەو بنەبانەکە دەچوو، ئەوەندە توندتر وەک لافاو شەپۆڵیان دەداو بەرز و نزم دەبوونەوە. بەڵام ئەو جەربەزە ببوو، واتە بەو ترسە بەربەرەکانێ ئەوەی دەکرد، کە هەست بە ترسی زانینی واقیع نەکات، لەوەشدا سەرکەوتوو بوو، چونکە بۆی دەرکەوت جگە لە ئاشکراکردنی واقیعی خۆی رێگاییێکی تری لەبەردەمدا نیە. کە گەیشتە کۆتایی تونێلی ئەشکەوتەکەو بەسەر قۆمەتی بەردە

کەڵەکە بووەکە کەوت،  هەردوو ترسەکەی ڕەوییەوە. هەستی بە ئارامی کرد، مێشکی تەواو ساف بوو، لووتی وەک دەمی گیزان تیژ بوو. لەسەر چیچکان دانیشت، دەستەکانی خستە سەر چاوی و دەستی کرد بە بۆنکردنی ئەو جێگەیە، ئەو حەوت ساڵی تەواو لە ناو ئەو گۆڕە دوورە ئاوەدانییە پاڵ کەوتبوو. ئەگەر شوێنێک هەبێت لەو کەونە بۆنی گرێنویان لێ بێت، دەبێت هەر ئێرە بێت. بە هێواشی هەناسەی وەرگرت. زۆر بە وردی ئەزمایشی کرد. پەڵەی لە هەڵسەنگاندن و حوکمدان نەکرد. چارەگە سەعاتێک لەسەر چیچکان دانیشت. زاکیرەی هی ئەوە نەبوو دەستخەڕۆی بکات، بە تەواوی شتەکەی لا رۆشن بوو، ئەو حەوت ساڵان ئا ئەلێرە بۆنی کردووە: بۆنی بەرد و شێ، بۆنی فێنکی خوێاوی، بۆنێکی ئەوەندە ساف، ئەوەندە بێگەرد، چونکە رۆژێ لە رۆژان هیچ بوونەوەرێک، مرۆڤێک، گیانەوەرێک نەیتوانیوە پێی بگاتە ئێرە... هەروەک ئێستا، کە هەر وەک خۆی بە سافی بۆنی دێت.

کەمێکی تر لەسەر چیچکان مایەوە، زۆر بە ئارامی، تەنها بە هێمنی سەری خۆی دەچەماندەوە. پاشان خۆی سووڕاند رۆیشت، لەسەرەتا بە کووڕی، کاتێکیش میچی ئەشکەوتەکە مۆڵەتی دا، ئەوجا خۆی بەرز کردەوەو بە ڕێکی بەرەو دەرەوە چوو.

پەڕۆپاتاڵەکەی لەبەر کرد، پێڵاوەکەی چەندین ساڵ پێشتر  هەڵا بە هەڵا ببوو، جلەماینەکەی خستە سەر شانەکانی و هەر ئەو شەوە شاخی پلۆم دو کێنتلی بە جێهێشت و ڕێگای بەرەو باشوور گرتە بەر.

## ٣٠

شێوەیەکی زۆر ترسناکی هەبوو. مووی سەری هەتا قۆرتی ئەژنۆکانی  شۆڕبووبوونەوە، ڕیشێکی تەنکی درێژ تا سەر ناوکی. نینۆکەکانی وەک جنجڕۆکی پەڵەوری لێ هاتبوو، لە باسک و لاقەکانی و، لەو شوێنانەی بزگوڕەکانی بەشی ئەوەی نەکردبوو دایانبپۆشی، تیلم تیلم پێستی لێ هەڵدەوەری.

ئەو کەسانەی یەکەمین جار چاویان پێ کەوت، جوتیارەکان ئەوانەی لەسەر کێڵگەکانیان لە نزیک شاری پییەرفۆرت خەریکی کار بوون، کە چاویان بە گرێنوی کەوت لە ترسان هاواریان لێ هەڵساو تێیانتەقاند. لە ناو شاریشدا بوو بە هەراو هەڵلاییێکی سەرنجڕاکێش. سەدان کەس پێکەوە بۆ تەماشاکردنی غاریان دەدا. هەندێک وایان دەزانێ حەپسێکی سەر دەریایەو ڕایکردووە، لەوانەی کە بە سەوللدانی بێگاری لەسەر کەشتیە جەنگییەکان حوکمدرابوون. هەندێکیشان دەیانگوت، ئەوە مرۆڤی ئاسایی نیە، بەڵکو گیاندارێکی دوو ڕەگە لە مرۆڤ و ورچ هاتۆتە ئاراو گیاندارێکی دارستانییە. یەکێکیان کە کاتی خۆی سەفەری دەریای کردبوو، بانگاشەی ئەوەی دەکرد، کە ئەو مرۆڤە سەر بە تیرەیەکی کێوی هیندیی ناوچەی کاینە، هی ئەو ناوچەیەی کە دەکەوێتە ئەوبەری ئۆقیانووسی گەورە.

خەڵکی گرتیان و بردیانە لای پارێزگاری شار. شتێکی زۆر سەیر و چاوەڕواننەکراو بوو، گرێنوی لەوێ نامەی شاگردییەکەی خۆی پێشانی ئامادەبووان دا، زاری خۆی کردەوەو بە چەند وشەیەکی کوڵ و بە فرتە فرت دەستی کرد بە قسەکردن، چونکە یەکەمین جاری بوو لە دوای حەوت ساڵان قسەی دەکرد، بەڵام هەر باش بوو، ئامادەبووان تێێ دەگەیشتن، گێڕایەوە، کە گوایە لە سەفەر دابووە، جەردە ڕێگایان پێ گرتووەو فڕاندوویانە، حەوت ساڵان لە ناو ئەشکەوتێکدا دەستبەسەریان کردووە. لە ماوەی ئەو حەوت ئەو ساڵەدا نە تیشکی خۆری دیوەو نە چاوی بە هیچ مرۆڤێک کەوتووە، بە هۆی دەستێکی نادیار لە تاریکاییەوە بە سەبەتە خواردنیان بۆ شۆڕکردۆتەوە، پاشان بەهۆی پەیژەیەک ئازاد کراوە، بێ ئەوەی بزانێت بۆچی فڕاندوویانە، وە بێ

ئەوەی چاوی بە ڕێگرەکان بکەوێت، یان چاوی بەو کەسە بکەوێت کە ڕزگاری کردووە. گرێنوی بۆخۆی ئەو چیرۆکەی هۆنیەوە، چونکە ئەو چیرۆکە پتر جێگەی باوەڕ بوو لە بەسەرهاتی ڕاستەقینەی خۆی، جا بەڕاستیش ئەو جۆرە ڕووداوانە، واتە کاری جەردەیی و ڕێگری، لە شاخەکانی ئۆڤێرنیەو لانگویدۆک و کێڤێنن کەم نەبوون. هەرچۆنێکی بوو پارێزگاری شار بێ ئەوەی بیری لێ بکاتەوە ناوی لە پرۆتۆکۆل تۆمارکردوو، ڕاپۆرتێکیشی لەبارەی بەسەرهاتەکەی بۆ گراڤی تایادە- ئێسپیناس نووسی، ئەو پیاوە دەرەبەگێکی شار و ئەندامێکی پەرلەمانی تولوس بوو.

گراڤ تایادە- ئێسپیناس لە تەمەنی چل ساڵیەوە پشتی لە ژیان و کاروباری کۆشکی ڤێرسایی کردبوو، گەڕابووەوە سەر موڵک و سامانی خۆیی و خەریکی زانست و لێکۆڵینەوە بوو. کتێبێکی بە نرخی لەبارەی دونامیکی ئابووری نەتەوەیی نووسی بوو، کە تێیدا باجی زەوی و بەرووبوومی کشتوکاڵی لابردبوو، بە پێچەوانە پێشنیاری سەندنی باجی دەستکەوتی کردبوو، لەوەش لە هەمووان پتر چینی هەژاران زیانییان پێ دەگەیشت و دەشبوو بە هۆی گەشەو بەهێزبوونی چالاکی ئابووریەکەی خۆی و هی کەسانی وەک خۆی. سەرکەوتنی لەو نامیلکەیەدا هانیدا کە نامیلکەیەکی تر لە بارەی پەروەردەکردنی کوڕ و کچان، لە تەمەنی پێنج تا دە ساڵان، بنووسێت. پاشان ڕووی لە ئەزمایشی ئابووری کشتوکاڵیی کرد و هەوڵیدا، بە هۆی پڕژاندی تۆمی گا بەسەر گیای هەمەجۆر، جۆرە دووڕەگێکی تێکەڵی گیانداریی- ڕووەکیی بۆ بەرهەمهێنانی شیر پێبگەیەنێت، واتە جۆرێک لە گوانەگوڵ. دوای سەرکەوتنە سەرەتاییەکانی، توانی لە شیری گیا جۆرە پەنیرێک بێنێتە بەرهەم، کە بە پێی ئەزمایشکردنی لەلایەن ئاکادیمیای لیۆن، "تامی بزنی لێ دەهات، ئەگەریش کەمێک تاڵ بوو". دوای ئەمە ئیتر ناچار بوو بە هۆی خەرجی یەگجار زۆری ئەو هەوڵە، کۆتایی بە تاقیکردنەوەکانی بهێنێت. چونکە دەبووایە چەندین هێکتاری زەوی بە تۆمی گا بپڕژێنێت، کە ئەوەش دەری نەدەهێنا. بەڵام هەر باش بوو، بە هۆی ئەو خۆخەریککردنەی بە کێشەکانی کشتوکاڵ و بیۆلۆگی نەک هەر بایەخی کەوتە سەر زەوی و چاندن، بەڵکو بە گشتی بایەخی کەوتە سەر عارد و پەیوەندییەکانی بە زیندەوەر.

هێشتان بە تەواوی وازی لە کارە پراکتیکییەکانی پەیوەند بە گوانەگوڵ نەهێنا بوو، کە بە گەرمی کەوتە خۆخەریککردن بە لێکۆڵینەوە لە ئەزمایشێکی تری مەزن لە بارەی پەیوەندییەکانی نێوان "نزیکایەتی لە زەوی" و "توانای ژیان". تێزی بابەتەکەی بریتی بوو لەوەی، کە ژیان تەنها لە دوورایەتییێکی دیار لە زەوی توانای بەردەوامی و برەودانی هەیە،

چونکە بەردەوام زەوی گازاوێکی لەنێوبەر دەردەدات، "گازاوی مەرگ" ئەو گازاوەش توانای ژیان پەک دەخات و نزیک یا دوور بە تەواوی لەناوی دەبات. بۆیەشە هەموو زیندەوەرێک لە کاتی گەورە بوون و فراژی بوون رووی لە هەوا دەکات و خۆی لەزەوی دوور دەخاتەوە، لە جیاتی بچێتە ناویەوە، پێکهاتەو ئەندێشەکانیان هەمیشە سیمای ئاسمانییان پێوەدیارە، بۆ نموونە: فەریکی دانەوێڵە، گوڵی دارگوڵ، سەری مرۆڤ هەموو، بەرەو ئاسمان بەرز دەبنەوە، کاتێک پیری دەیانچەمێنێتەوەو بەرەو زەوی کووڕیان دەکاتەوە، بۆ ئەوەیە، تا بە ناچاری بکەونە بەر گازاوی مەرگی زەوی و، لە ناویدا بکەونە بەر پرۆسەی تلانەوەو رزیبوون، لە ئاکامیشدا دوای مردنیان، خۆشیان دەبن بە بەشێک لە گازاوی مەرگ.

کاتێک گراڤ تایادە- ئێسپیناس بیستی، کەسێک لە شاری پییەرفۆرت دۆزراوەتەوە، حەوت ساڵی تەواو لەناو ئەشکەوت ژیانی بەسەر بردووە، واتە حەوت ساڵان بە تەواوی لە ناو گازاوی مەرگی زەوی ژیاوە، لە مەراقان وەخت بوو دیق بکات، هەناردی دەسبەجێ گرێنویان بۆ هێناو یەکسەر بردیە ناو تاقیگاکەی خۆی، بۆ ئەوەی لەوێ بە تەواوی و زۆر بە وردی بیپشکنێت و تاقیکردنەوەی لەسەر بکات. گراف دۆزینەوەی گرێنوی بە سەلمێنەری بیردۆزەکەی خۆی دەزانی: "گازی مەرگ ئەوەندە کاریگەری لە گرێنوی کردووە، جەستەی بیست و پێنجساڵەی پوکاندۆتەوەو وەک جەستەی مرۆڤێکی پیر، ماکەکانی رزانەوەی کەوتۆتە سەر". گراڤ تایادە- ئێسپیناس دەیگوت: "بەڵام ئەوەی راستی بێت، ئەو خۆراکانەی کە لە کاتی دەستبەسەربوونی بۆی شۆڕکراونەتەوە، ڕووەکهاییەکی دوورە زەوی بووینە، لەوانەیە نان یان بەرە رووەکییەکان بووبن، ئەمانە ئەویان لە مەرگ پاراستووە. ئێستاش لەوانەیە بتوانرێت کە بهێنرێتەوە سەر باری تەندروستی جارانی خۆی، ئەگەر بێت و بە هۆی یەکێک لە ئامێرە گونجاوەکانی خۆی، ئامێری هەڵمژی گازاوی مەرگ، بە وردی چارەسەری بۆ بکرێت. ئامێرێکی ئاوای لە کۆگای کۆشکەکەی خۆی لە شاری مۆنتپلییێردا هەیە، ئەگەر گرێنوی ئامادەبێت، خۆ بخاتە بەر لێکۆلینەوەیەکی زانستیی، ئەوا ئێمە نەک هەر لەو نەخۆشی و بێ هیوابیە رزگاری دەکەین، کە بە هۆی ئالوودەبوونی بە گازاوی مەرگ تووشی هاتووە، بەڵکو پارەیەکی باشیشی لە دەستدا دەنێین..."

ئیتر دوو سەعات دواتر هەردووکیان لە ناو پەیتوکەیەک دانیشتن. هەرچەندە تا بڵێی رێگاکە خراپ و پڕ کۆسپ و قۆرت بوو، بەڵام توانییان شێست و چوار میلی ڕێگە، نزیکە بە دوو ڕۆژ ببڕن، چونکە گراڤ تایادە- ئێسپیناس ئەوەندە بەو دۆزینەوەیە شاگەشکە ببوو، ئیتر پیری و تەمەنی بە ساڵاچووی رێگەی ئەوەیان لێ نەگرت، خۆی پەیتوونەکە لێ بوخڕێت و جڵەوی ئەسپەکان بگرێتە دەست و بیانداتە بەر قامچییان و چەندین جار بۆخۆی مژانەو چەرخەکانی پەیتوونەکەش

دابمەزرێنێتەوە. بۆ ئەوەی تا دەکرێت زوو بیردۆزەکەی خۆی بخاتە بەردەم ڕای گشتی و بەرچاوی خەڵک. هەرچی گرێنوییە بۆی نەبوو تاقەجارێکیش پەیتوونەکە بەجێبهێڵێت. بەتەواوی نقوومی ناو بزگوڕە خۆڵاوی و شێدارەکەی ببوو، بۆی هەبوو لە ناو پەیتوونەکە دابنیشێت و لە شوێن خۆی نەبزووێت. لە ڕێگاش بۆ خواردن بەردەوام ڕەگی خاوی رووەکی دەخرایە بەردەم. ئامانجی گرافیش لەمەدا ئەوە بوو، کە ئالوودەبوونەکەی گرێنوی بە گازی مەرگ بۆ ماوەیەک وەک خۆی بمێنێتەوە.

گەیشتنە شاری مۆنتپلییێر، یەکسەر گرێنوی بردە ژێرزەمینی کۆشکەکەی و، بانگهێشتننامەی بۆ هەموو ئەندامانی بەشی پزیشکی و یەکێتی رووەکزانان و قوتابخانەی ئابووری و یەکێتی شێمۆ-فوزیکییەکان و ناوەندی پیشەو زانستەکان، هەموو کۆمەڵە و یەکێتییە زانستییەکانی تر نارد، کە ژمارەیان لەو شارە لە دە دوازدە کۆمەڵەیەک کەمتر نەبوون. چەند ڕۆژێک دواتر، یان بە تەواوی هەفتەیەک دوای ئەوەی گرێنوی ژیانی سەختی تەنهایی ناو ئەوشکەوتەکەی بە جێهێشت، لەسەر سەکۆی گەورەترین هۆڵی زانکۆی شاری مۆنتپلییێر، وەک ڕووداوێکی سەرنجڕاکێشی زانستیی، خرایە بەرچاوی ئاپۆڕەیەکی سەدەها کەسی.

تایادە- ئێسپیناس لە سمینارەکەیدا گرێنوی وەک بەڵگەی زیندووی ڕاستی بیردۆزی گازاوی مەرگی زەوی، پێشاندا. لە کاتێکدا وردە وردە بزگوڕە رزیوەکەی لە لەشی گرێنوی دادەپچڕاند، کاریگەری زۆر بە هێزی گازاوی مەرگی لەسەر جەستەی گرێنوی ڕۆشن دەکردەوە: "ئا ئەلێرە پاشماوی کێم و هەڵاوسان و پفکەو جێبرین دەبینین، ئەوە هەمووی پاشماوەی سووتانەوەیە بە گازاوی مەرگ، ئێرێهێ، لەسەر سینگی، لووێکی سووری گەورەی زەق دەبینن، ئەوە کاریگەری ئەو گازاوەیە، گازاوەکە نیوەی پێستی رزاندوەو تەنانەت جومگەکانی ئێسکیشی پەکخستووە، ئەوەش لە شەلی قاچەکانی و کووڕبوونەوەی پشتیدا دەردەکەوێت. ئەندامەکانی ناوەوەی لەشیشی وەک سپڵ و جەرگ و سی و زەرداو و گەدەی زۆر زیانییان پێ گەیشتووە، وەک لە ئەزمایشێکی پاشەڕۆکی بە ڕۆشنی دەرکەوتووە، هەرکەس بیەوێت دەتوانێت سەیری پاشەڕۆکەکەی بکات، کە بۆ پێشاندان خراوەتە ناو ئەو لەگەنە. بە کورتی دەتوانین بڵێین، نەخۆشی و پەککەوتنی هێزی ژیان لە ئەنجامی حەوت ساڵ ئالوودەبوون بە گازاوی مەرگی زەوی، ئەوەندە لێی تیر کردووە، بە جۆرێک زۆر بە ئاشکرا لە دیاردەکانی دەرەوەی لەشی دیارە، کە وەک کونەجورج لەسەر جەستەی هەڵکۆڵدراون، لە ڕاستیدا پێویستە پتر وەک بوونەوەرێکی مردوو، نەک زیندوو تەمەشای بکەین." سەرەڕای ئەوەش خاوەن کوڕ ئامادەیی خۆی پێشاندا، کە بە ڕێگای چارەسەری بە هۆی ئامێری هەڵمژی گازاوی مەرگ و بە پارێزی تایبەت لە خواردن، لە ماوەی هەشت ڕۆژدا دەیهێنێتەوە سەر

باری خۆی، بە شێوەیەک کە هەموو کەس چارەسەری تەواو لە چاوەکانیدا ببینێت، بۆیە داوای لە بەشداربووان کرد کە لە ماوەی هەفتەیەکی تر، بێنەوەو بە چاوی خۆیان سەرکەوتنی ئەو پێشبینییەی ببینن، کە ئەمەش بێگومان دەبێتە بەڵگە، بۆ سەلماندنی بیردۆزەکەی، بۆ ئەوەی ئیتر لە راستی بیردۆزی گازاوی مەرگ دڵنیا بن.

کۆڕەکەی کۆڕێکی یەگجار سەرکەوتوو بوو. بەشداربووانی کۆڕەکە زۆر بەگەرمی چەپڵەیان بۆ لێداو پاشان بە ڕێزە بە لای سەکۆی هۆڵەکەدا تێپەڕین، کە گرێنوی لەسەردا وەستا بوو. گرێنوی وەک ئەوەی ئەو خەڵکە بە هیچ بزانێت ئاوا خوێنسارد و نەبان وەستا بوو، بەو شێوە وەستانەی و بە جێبرینە کۆنەکانی و کووڕیەکانی، ئەوەندە ترسناک و سەرنجڕاکێش دەکەوتە بەرچاوان، هەر بەڕاستی هەموو کەس وای دەزانی، کە نیوەی رزیوەو ئیتر کەس ناتوانێت فریای کەوێت، هەرچەندە ئەو بۆ خۆی هەستی بە وزەو تەندروستی دەکرد. هەندێک لە بەشداربووان وەک کەسانی پسپۆر و شارەزا دەستییان لە جەستەی دەداو جەستەیان دەکوتاو دەیان پێواو، تەمەشای ناو دەم و چاویان دەکرد. هەندێک رووی پرسیاریان لێ دەکرد و دەیانویست بزانن چۆن لە ناو ئەشکەوتەکەی ژیاوەو ئێستاش هەست بە چی دەکات. بەلام گرێنوی بە توندی وابەستەی ئەو ئاماژەو ئامۆژگاریانە بوو، کە پێشتر لە گراف وەری گرتبوو، تەنها بە گەرووێکی گیراو وەلامی ئەو جۆرە پرسیارانەی دەدایەوەو، بە هەردوو دەستی ئاماژەی بۆ گرێی گەرووی دەکرد، کە گوایە ناتوانێت قسە بکات، بۆ ئەوەی بە بەشداربووانی رابگەیەنێت، کە گەرووشی بە "گازاوی مەرگی زەوی" پارە پارە بووە.

لە کۆتایی کۆڕەکەیدا گراف تایادە- ئێسپیناس قۆڵی گرت و بەرەو کۆگای کۆشکەکەی راپێچی کرد. لەوێ بە ئامادەبوونی چەند دکتۆرێکی بەشی پزیشکیی خستیە ناو ئامێری هەڵمژی گازاوی مەرگ. ئەو ئامێرەش پێک هاتبوو لە ژوورۆکەیەکی بێ درز و کەڵێن لە داری کاژ، بە هۆی باکێشێکی بڵند کە بەرز ببووەوە بۆ بانەوەی سەربان، هەوای سافی بێ گەرد لە گازاوی مەرگ هەڵدەمژرایە ناو ئەو ژوورەو لە لای ژێرەوەش بە هۆی دەرچەیەکی چەرمین هەواکە دەچووە دەرەوە. ئامێرەکە لەلایەن دەستەیەک خزمەتکار خرایە کار، ئەرکی ئەو دەستە خزمەتکارە ئەوە بوو، کە شەو و رۆژ مشووری ئەوە بخۆن، کە هەواکێشەکان بێ وچان کار بکەن و نەوەستن. لەو ماوەیەشدا کە گرێنوی بەردەوام بە تەوژمی هەوای خاوێن و پاکژکەرەوە دەوری گیرابوو، هەر دەمژمێرێک جارێک لە دەرکۆکەیەکی لاچەپ، لە ناو تێپەڕگەیەکی جووت دیوار، بە پێشکەشکردنی خواردنی دوورەعەرد پارێزی پێ دەکرا: چەلاوی کۆتر، ماجوونی گۆشتی باڵندە، گۆشتی مراوی کێوی بەهاراتکراو و سوورەوەکراو، مێوەی لە قووتوو کراو، نانی تایبەت لەو جۆرەگەنمانەی کە

لاسکەکانیان زۆر بڵند دەبنەوە، شەرابی شاخە بەرزەکانی پیروینێ، شیری بزنە کێوی، سپیڵکاوی هێلکەمریشک، ئەمانە هەمووی لەسەربانی کۆشکەکەی گرافدا هەڵگیرا بوون.

ئەم پاکسازی و چاکسازیە لە گازاوی مەرگ و بوژاندنەوەی هێزی ژیان تێیدا، پێنج رۆژی خایاند. ئەوجا گراف فەرمانی دا باکێشەکان راگرن، گرێنوی بردە ژووری گەرماو، لەوێ چەندین سەعات لە ناو باراناوی شیڵەتێن خووساندیان، پاشان بە رۆنی گوێزی شاری پۆتۆسی ئاندنی لە تەوقی سەریەوە هەتا پێی شوشتییان. نینۆکی پەنجەکانی دەست و پێیان کرتاند، ددانیان بە مەعجوونێکی پاراوی کاڵکی دۆلۆمیت پاکژ کردەوە، ریشیان تاشی و، قژیان کورت کردەوەو بۆیان داهێنا و پۆدرەیان لێ داو ئارایشتییان کرد. بەرگدروو و پێڵاودروویان بانگکردوو، کراسێکی ئاوریشمی یەک بە قەد خۆیان بۆ دروو، بەروانکەو بنکراسێکی سپی، گۆرەوی ئاوریشم، رۆکێک، پانتۆڵ، هێلەگێک بە سیمی شین و پێڵاوێکی چەرمی کەشخەی قەیتاندار، رێکیی پێلاوەکە قاچە گۆجەکانی بەرێکی داپۆشت. گراف بە دەستی خۆی بە سپیاو جێبرینەکانی سەر دەموچاوی بۆ ئارایشت کردو هەندێک سووراوی لە لێو و رووومەتەکانی هەڵسووی و بڕۆکانی بە قەڵەمێکی نەرمی رەژووی داری سنجو وەک کەوانە بۆ نەخش کرد. ئەوجا هەندێک لە عەترە تایبەتییەکەی خۆشی پێدا پرژاند، کە بریتی بوو لە عەترێکی تارادەیەک سووکی بۆنە وەنەوشەییەکان. ئەوجا چەند هەنگاوێک لێی دوورکەوتەوە، ساتێکی درێژی برد، تا گراف توانی شاگەشکەیی خۆی بە وشە دەرببڕێت، بەم جورە دەستی کرد بە ئاخاوتن:

"جەناب! بەڕاستی زۆرم شایی بە خۆ دێت. سەرم لە بلیمەتیی خۆم سوڕماوە. هەرچەندە من هەرگیز گومانم لە راستی بیردۆزی گازاویی خۆم نەدەکرد، بێگومان گومانم لێ نەدەکرد، بەڵام لە بەکارهێنانێکی پراکتیکیدا بەو چەشنە بتوانرێت ئاوا بە جوانی بسەلمێنرێت، ئەوە منی حەپەساندووە. ئێوە گیانەوەرێک بوون، من مرۆڤێکم لە ئێوە دروستکرد. ئەوە بە ڕاستی کارێکی خوداییە. لێمی مەگرن کە وا من سەرم سوڕماوە! بڕۆنە پێش بۆ بەردەم ئەو ئاوێنەیە، جەنابتان تەماشای خۆتان بکەن! بۆ یەکەمین جار لە ژیانتان دەبینن، کە جەنابتانیش مرۆڤێکن. مرۆڤێکی زۆر تایبەت یان زۆر کەشخە نا، بەڵام هەر باشە، بە تەواوی لە مرۆڤ دەچن. دەی جەناب بڕۆنە پێش! تەماشای خۆتان بکەن، با سەرتان لەو پەڕجووە سووڕ بمێنێت، ئەو پەڕجووەی کە بۆ ئێوەم هێنایە ئارا".

ئەوە یەکەمین جار بوو، کەسێک بە گرێنوی بڵێت "جەناب".

گرێنوی چووە بەردەم ئاوێنەکەو تەماشای ناو ئاوێنەکەی کرد. تا ئەو رۆژە چ جاران تەماشای ئاوێنەشی نەکردبوو. ئاغاییێکی کەوتە بەرچاو، بە بەرگێکی شینی خاوێن، کراسێکی سپی، گۆرەوی

ئاوڕیشم، بێ ویستی خۆی و بەشێوەیەکی زۆر غەریزی خۆی چەماندەوە، هەر وەک چۆن هەمیشە خۆی بۆ ئاغا خاوێن و پۆشتەکان دەچەماندەوە. بەڵام ئاغا پۆشتەکەش خۆی بۆ ئەو چەماندەوە، جا کە خۆی ڕاست کردەوە، ئاغا پۆشتەکەش خۆی ڕاست کردەوە، ئەوجا هەردووکیان لە شوێنی خۆیان جەمدین و بەرامبەر یەکتری ڕامان.

ئەوەی لە هەموو شتێک پتر گرێنوی گێژ کردبوو، ئەو ڕاستییە بوو، کە خۆی زۆر بە ئاسایی هاتە بەرچاو. گراف تایادە- ئێسپیناس ڕاستی گوتبوو: ئەوەندە تایبەت نە دەهاتە بەرچاوان، جوان نەبوو، بەڵام ئەوەندەش ناشیرین نەبوو. هەندێک بچووک ببووەوە، ڕەفتاری کەمێک فێڵبازانە دیاربوو، هیچی لە دەموچاودا دەرنەدەکەوت، بە کورتی وەک هەزاران لە مرۆڤەکانی تر دیار بوو. ئێستا ئەگەر بچێتە سەر جادە، کەس خۆی بۆ وەرناسووڕێنی و کەس ئاوڕی لێ ناداتەوە. تەنانەت خۆشی ئەگەر جارێک لە جاران تووشی کەسێکی ئاوا ببێت، کەسێکی وەک ئێستای خۆی، ئەوا ئەو کەسە زۆر سەرنجی ڕاناکێشێت. ئەوە نەبێت، کە بۆنی ئەوە دەکات، کە ئەو کەسە، جگە لە بۆنی وەنەوشە، وەک ئاغای ناو ئاوێنەکەو وەک خۆی، کە لەبەردەم ئاوێنەکە وەستاوە، هیچ بۆنێکی تری لێ نایەت.

بەڵام دە ڕۆژ بەر لە ئێستای، جوتیارەکان کە چاویان پێ دەکەوت دەیان زریکاند و لە ترسان تێیان دەتەقاند. ئەوان ڕۆژان، ئەو هەمان هەستی هەبوو هەروەکو ئێستا، ئێستا هەست بە شتهاییێکی نوێی جیاواز ناکات. خۆ ئەگەر چاوەکانی خۆی بنووقێنێت، کەمێکیش هەست بە جودایی ناکات لەگەڵ ئەو کاتدا. هەوای هەڵمژت، ئەو هەوایەی لە جەستەی بەرز دەبووەوە، بۆنی عەترە خراپەکەی هەڵمژت، بۆنی سیم و پێستی تازە دەقکراوی پێڵاوەکەی کرد، بۆنی بەرگە ئاوڕیشمییەکەی کرد، بۆنی پۆدرەو ئارایشتەکانی کرد، بۆنی سووکی سابونی پۆتۆسیی کرد، ئەوجا لە پڕێک تێگەیشت ئەوە چەڵاوی کۆتر و جادووی ئامێرە هەڵمژەکە نەبووە، کە ئەویان وا بۆ مرۆڤێکی ئاسایی گۆڕیوە، بەڵکو تەنهاو تەنها چەند پارچە جل و قژبڕین و هەندێک مەسخەرەی ئارایشتە کە ئەویان وا گۆڕیوە.

بە پەلە چاوی خۆی کردەوەو دیتی، کە چۆن گراف لە ئاوێنەکەوە بە بزە تەماشای دەکات و چۆن هەوڵی سڕینەوەی بزەی سەر لێوی وەک سۆراو سووری دەدات، بە تەواوی وەک ئەوەی بیەوێت ئاماژە بەوە بکات، کە ئەو ئەوەندە ئەمی لا بێ بایەخ نیە. گرێنویش هەر ئاوا لە ئاغای ناو ئاوێنەکە گەیشت، لەو مرۆڤە پۆشتەکراوە، دەمامک کراوە، لەو پەیکەرە بێ بۆنە، کە ئەوەندە یەگجار چنە نیە، بەلای کەم لای گراف،

وەک ئەوەی ئەگەر ئەو پەیکەرەش ئەگەر بە تەواوی دەمامک بکرێت، ئەوا کاریگەرییێکی لەسەر دونیای دەرەوەی خۆی دەبوو، بەڵام ئەویش وەک گرێنوی، وەک خۆی، هەرگیز ئەو باوەڕەی بەخۆی نەبوو. سەری ڕەزامەندی بۆ پەیکەرەکە لەقاند، لە کاتێکدا کە پەیکەرەکەش سەری بۆ لەقاندەوە، بە دزیەوە لووتی فیشاندی...

# ٣١

ڕۆژی دواتر لە کاتێکدا گراف خەریکی ئەوە بوو گرێنوی فێری ئەتەکێتی وەستان و پۆزە پێویستەکان و جوڵان و هەنگاوەکانی سەماکردن بکات، بۆ ئامادەکاری و بەشداری لە بۆنەیەکی کۆمەڵایەتی، گرێنوی تووشی سەرسووڕان و گێژبوون هات، دەتگوت بە تەواوی شەنگ و تاقەتی لەبەر بڕاوەو خەریکە دەخنکێت، بەلاداهات و کەوتە سەر قەنەفەیەک.

گراف تەنگەتاو بوو. هاواری خزمەتچییەکانی کرد، هاواری کرد باوەشێن و پانکە بێنن، لە کاتێکدا خزمەتکارەکان بە پەلە رایان کردە لای، گراف لە تەنیشت گرێنوی خۆی چەماندەوەو بە دەسەسڕێکی کەمێک تەڕ باوەشێنی لێ دەکرد و نزای دەکرد و لێی دەپاڕایاوە کە ئێستا لەو دەمەدا نەمرێت و، ئەگەر هەرچۆنی بێت تا دوو بەیانی سەبر بگرێت، دەنا چارەنووسی بیردۆزەکەی، بیردۆزی گازاوی مەرگی زەوی، دەکەوێتە ئەو پەڕی مەترسی.

گرێنوی خۆی وەرسووڕاند و خۆی کووڕ کردەوە، بە تەنگەنەفەسی هەناسەی دەدا، دەناڵی، چاوەکانی خۆی لە پەنای قۆڵەکانی لە دەسەسڕەکە شاردەوە، پاشان زۆر بە دژواری خۆی لە قەنەفەکە خستە خوارەوەو بە خشین خۆی گەیاندە دوورترین گۆشەی ژوورەکە. ئەوەندەی هێزی تیامابوو هاواری کرد: "ئەو عەترە نا! ئەو عەترە نا! ئەو عەترە من دەکوژێت!" تا گراف تایادە-ئێسپیناس دەسەسڕەکەی لە پەنجەرە فڕی نەدایە دەرەوەو، بەروانکە بۆن عەترە وەنەوشەییەکی فڕێ نەدایە ژوورێکی لاچەپ، گرێنوی نەهاتەوە هۆش خۆی، ئەوجا بە دەنگێکی کز و هێدی گێڕایەوە، کە ئەو وەک عەترسازێک لووتێکی هەستیاری هەیە، هەمیشەو بە تایبەت ئێستا، لەو قۆناغی چاکبوونەوەی بەرگەی بۆنی هەندێ عەتر ناگرێت و بەرامبەریان زۆر هەستییار بووە. ئەو عەترەی گرافیش، عەتری ئەو گوڵە جوان و خۆشەویستە، کە ئاوا زۆر بە توندی کاریگەری لێ دەکات، هەبێ و نەبێت، دەبێت هۆیەکەی ئەوە بێت، کە شیلەی ڕەگی وەنەوشەی زۆر تێدا بێت،

جا سەبارەت بەوەی رەگەکەشی لە ژێر زەویەوە هاتووە، ئەوا بۆ کەسێکی وەک ئەو، وەک گرێنوی دەردەداری دەستی گازاوی مەرگی زەوی، کاریگەرییەکەی زۆر خەتەرناکە. هەر دوێنێ کە بۆ یەکەمین جار ئەو بۆنەی بۆ هات، هەستی بە نارحەتییێکی زۆر کرد، ئەمڕۆش کە بە جارێک بۆنی ئەو ڕەگەی هەڵمژت، وەک ئەوە وابوو، جارێکی تر کەسێک پاڵی پێوەبنێتەوە بۆ ناو کونە ئەشکەوتە سامناکەکە، ئەو کونەی کە حەوت ساڵی تەواو ژیانێکی دژواری تیدا بەسەر برد. بەڵام دوای ئەوەی بە هۆی هونەری گراف تایادە- ئێسپیناس و بە هۆی شووشتنەوەی بە هەوای بێگەرد و خاڵی لە گازاوی مەرگ، ژیانێکی مرۆڤیی پێ بەخشرایەوە، ئیتر جەستەی وەک شتێکی سروشتی ناڕەزایی دەربڕی، کە پێی باشترە دەمودەست بمرێت، نەک دووبارە بیخەنەوە ناو گازاوی نەفرەتی مەرگ، ئەو ناتوانێت بە جۆرێکی تر ئەو رووداوە رۆشن بکاتەوە. ئێستاش کە عەتری ئەو ڕەگەی دێتەوە یاد، لەشی هەموو موچڕکێ پێدا دێت. بەڵام ئەو باوەڕی وایە، دیسان دێتەوە سەرباری خۆی و چاک دەبێتەوە، ئەگەر گراف رێگەی ئەوەی پێ بدات، خۆی بۆنێکی سافی وەنەوشە بە تایبەت بۆ خۆی دروستبکات. بۆنێکی تایبەتی سووک، بۆنێک کە نۆتەکانی گونجاو بن، بۆنێک کە بە شێوەیەکی سەرەکی لە بەرهەمە دوورە زەویەکان هاتبێتە بەرهەم، وەک لە رۆنی باوی و گوڵاوی گوڵە نارنج و کالەپتۆز و رۆنی کاژ و رۆنی سەروو. ئەگەر بێت و پرۆشکێکی عەترێکی ئاوای بە جلوبەرگیدا بپرژێنن و چەند تنۆکێکی بخەنە سەر گەردەن و روومەتەکانی، ئیتر ببڕای ببڕای جارێکی تر لە هۆش خۆی ناچێت بۆ هەمیشە بەرگری لە دژی لەهۆشخۆچوون و خووگرتن پەیدا دەکات، ئەو خووەی کە ئەمڕۆ بەسەری هات...

ئەوەی کە ئێمە وا بە رۆشنی و هەندێک بە رێکی، بە ناڕاستەوخۆیی لێرە گێڕامانەوە، لە ڕاستیدا گرێنوی بە هەزار ناری عەلی، بە نیو دەمژمێر، بە ناڕەوانی و بە کۆخە کۆخ و ئاهو تەنگەنەفەسیی، بە پچڕپچڕی و گەرووی گیراو و بە نیوەچلی، بە فڵتەفڵت و لەرزە لەرز دەریبڕین. قسەکانی زۆر کاریان لە گراف کرد، پوازشهێنانەوەکەی گرێنوی بە تەواوی لە ڕوانگەی بیردۆزی گازاوی مەرگ هەڵهێنجرابوو، لەگەڵ بیردۆزەکەی گراف جووت بوو، بۆیە قسەکانی پتر لە ئازار و دیاردەکانی نەخۆشییەکەی، گرافیان لەوە دڵنیا کرد، کە زۆر راستە، عەترەکەی، عەتری بنەوشە، بەرهەمی رووەکێکی نزیکەزەویە، تەنانەت لە پێکهاتەی بن زەوی بەرهەمهێنراوە، هەبێ نەبێ خۆشی بەو عەترە نەفرەتلێکراوە، کە ساڵەهایە بەکاری دەهێنێت، تووشی نەخۆشی بووە. ئەو چوزانی، رۆژ بە رۆژ بەهۆی ئەو عەترە لە مەرگ نزیک کەوتۆتەوە. ژانی جومکەکانی، رەقبوونی ماسوڵکەکانی، ڕەقبوونی گەردەنی، سڕبوونی ئەندامەکانی، مایەسیریەکەی، پاڵەپەستۆی ناو

گوێچکەکانی، ددانی رزیوی، هەر هەمووی، هیچ گومانێکی تێدا نیە، لەو ڕەگەوەنەوشە سەریان هەڵداوە، کە بە بۆگەنی گازاوی مەرگ ئالوودە بووە. ئەمە زۆر کاری لێ کرد. زۆری پێ خۆش بوو بچێتە لای گرێنوی و بەرزی بکاتەوەو لە باوەشی خۆی بکوشێ، بەڵام لەوە ترسا، کە هێشتان بۆنی وەنەوشەی لێ بێت. بۆیە یەک بە دەنگی خۆی هاواری کردە خزمەتکارەکانی و فەرمانی پێ دان، کە هەر عەترێکی وەنەوشە لە ماڵەکەیدا هەیە بیبەنە دەرەوەو دووری بخەنەوە، دەسبەجێ گرێنوی بخەنە ناو کەژاوەیەکەی و بیبەنە لای باشترین عەترسازی شارەکە. کتومت گرێنوی بەزمی خووەکەی هەر بۆ ئەمە بوو.

عەترسازیی پیشەیەکی نەریتی کۆن بوو لە شاری مۆنتپلیێر، هەرچەندە لەو کاتانەی دوایی لە ململانێیدا لەگەڵ شاری گراس هەندێک دواکەوتبوو، بەڵام هێشتان هەندێک عەترساز و وەستای دەستەوانەدروویی باش لە شارەکەدا دەژیان. بەرچاوترینیان عەترسازێک بوو بە ناوی رونێل. رونێل کۆشکی گراف تایادە- ئێسپیناسی بە سابوون و رۆن و عەتر باربوو دەکرد، جا بە هۆی ئەو پەیوەندییە بازرگانییەی لەگەڵ کۆشکی گراف تایادە- ئێسپیناس، بە شێوەیەکی زۆر نائاسایی و بە سنگێکی فراوانەوە رێگای دا، کە ئەو شاگردە پاریسییە تایبەتەی ناو کەژاوەکە بۆ ماوەی سەعاتێک بچێتە ناو کارگەی عەترسازییەکەی. گرێنوی هیچ پرسیاری نەکرد و نەشی ویست بزانێت، ئەو شتانەی کە ئەو پێویستیەتی لە کوێ دەیاندۆزێتەوە، گوتی، ئەو پێویستی بە هیچ نیەو خۆی دەزانێت چی دەکات، چووە ناو کارگەکەو دەرگای لەسەر خۆی داخست و سەعاتێکی تەواو لەوێ مایەوە. لە ماوەی ئەو سەعاتەدا رونێل لەگەڵ سەرکارەکەی کۆشکی گراف و لەگەڵ نۆشینی چەند پێکێک شەراب دەیەویست تێ بگات، کە بۆچی گراف تایادە- ئێسپیناس چیتر ناتوانێت بۆنی عەتری وەنەوشەکەی بکات.

کارگەو فرۆشگاکەی رونێل ئەوەندە پڕ و دەوڵەمەند نەبوو، وەک کارگەو فرۆشگا عەترییەکەی جارانی بالدین لە پاریس. عەترسازێکی نێوەندیی ئاوا نەیدەتوانی بە چەند دانە جۆرە رۆنەگوڵ و ئاوک و بەهاراتێک بازێکی گەورە بۆ پێشەوە بدات. بەڵام گرێنوی هەر لەگەڵ یەکەم هەناسەیدا زانی، ئەو کەرەسانەی کە لەوێدا هەن، بەسن بۆ مەرامەکانی. ئەو نەیدەویست عەترێکی مەزن بێنێتە بەرهەم، ئەو نەیدەویست وەک جاری جارانی لای بالدین، چەندین شیلاو و گوڵاوی بە نرخ تێکەڵ بە یەکتری بکات، بۆنێکی وا بسازێنی، کە وەک ئەوە بێت لە دەریاوە هاتبێت و خەڵک هەمووی حەیران بکات. تەنانەت نەیدەویست بۆنۆکەیەکی سادەی گوڵەنارنجیش بسازێنێ، وەک بەلێنی بە گراف دابوو. کە دەستیشی بۆ رۆنی نارنج و رۆنی گەڵای درەختی کالەپتۆز و سەروو

بردبوو، هەر بۆ ئەوە بوو، مەرامی تایبەتی خۆی بشارێتەوە، واتە ئافراندنی ئەو بۆنە تایبەتییەی، کە دەیەویست بیهێنێتە بەرهەم: ئەو بۆنەش بۆنی مرۆڤ بوو. ئەو دەیەویست هەرچۆنی بێت خۆی لەگەڵ بۆنی مرۆڤەکاندا بگونجێنێت، ئەگەریش جارێ بەدیلێکی خراپی دەستبکەوێت هەر باشە، چونکە خۆی هیچ بۆنێکی ئادەمیزادی لێ نەدەهات. بەڵام لە راستیدا چۆن مرۆڤەکان هەموو روخساریان وەک یەک نیە، ئاواش هەموویان بۆنیان وەک یەک نیە. هەر مرۆڤێک بۆنێکی تایبەتی خۆی هەیە، گرێنوی ئەمەی لە هەموو کەسێک باشتر دەزانی، ئەو هەزاران و بگرە پتریش تەرزە بۆنی تایبەتی تاکەکانی مرۆڤی دەناسی. ئەو هەر لە کاتی لە دایکبوونیانەوە مرۆڤەکانی بە بۆن لە یەکتری جودا دەکردنەوە. بەڵام ماکەبۆنێکی بنچینەیی هاوبەش، تارادەیەک سادە، لە هەموو مرۆڤەکاندا هەبوو: ماکی بۆنێکی ئارەقاوی چەور، بۆنێک وەک بۆنی پەنیریی ترشاو. ئەمە ماکەبۆنێکە لە هەموو ماکەبۆنێک قێزەوەنتر، کە بە یەکسانی وەکو یەک بە هەموو مرۆڤێک وەنووساوە، هەورەبۆنی تایبەتی هەر تاکێکیش وەک تریفەیەک لە خوناوەی ورد ورد دەوری ئەو ماکەبۆنە بنچینەییە هاوبەشەی مرۆڤەکانی گرتووە.

بەڵام ئەو تریفە زۆر زۆر ئاڵۆزە، کە جفرەی نەگۆڕی بۆنی تایبەتی هەر تاکێکە، لە لایەن زۆربەی مرۆڤەکان هەستی پێ نەدەکرا. زۆربەی مرۆڤەکان هەر نەیان دەزانی، کە خاوەنی ئەو بۆنە تایبەتەن و، بێ ئاگا هەموو کارێکییان بۆ ئەوەیە کە لە بن جلوبەرگ و بە هۆی بۆنە دەستکرد و هاوچەرخەکان بیشارنەوە. تەنها بۆنە بنچینەییە هاوبەشەکەیە، هاڵاوە سادەکەی جەستەی مرۆڤ، کە ئەوان لەگەڵی ڕاهاتوون و تێیدا دەژین و تێیدا هەست بە دڵنیایی دەکەن، وە تەنها ئەو کەسەی کە ئەو هاڵاوە بنچینەییە قێزەونەی لێ هەڵبسابایە، لەلایەن ئەوانەوە، وەک خۆیان خۆیی و وەک مرۆڤ تەماشا دەکرا.

عەترێکی عەنتیکەو سەیر و سەمەرە بوو، کە گرێنوی ئەو رۆژە دەیویست بیهێنێتە بەرهەم. تا ئەوێ رۆژێ لەسەر زەوی عەترێکی ئاوا عەنتیکە بوونی نەبوو. بۆنەکەی وەک بۆنی عەتر نەبوو، بەڵکو وەک ***بۆنی مرۆڤ بوو***. ئەگەر کەسێک لە ژوورێکی تاریکدا بۆنی ئەو عەترەی کردبا، وای دەزانی کەسێکی تری لە تەنیشت وەستاوە. ئەگەر کەسێک بۆ خۆی وەک مرۆڤێک بۆنی لێ هاتبایەو ئەو بۆنەشی لە خۆی دابایە، ئەوا ئێمە بە بۆن کردن وامان دەزانی ئەو کەسە دوو کەسە، یان خراپتر، وامان دەزانی بووونەوەرێکی دووانەیی جنۆکەییە، وەک پەیکەرێک کە نەتوانرێت بە سافی ببینرێت و وەک تارمایی، لێل دەربکەوێت، وەک وێنەیەکی بنی دەریا، کە لە ژێر شەپۆلاندا بلەرزێتەوە ئاوا.

گرێنوی لە کارگەکەی رونێل بە دوای پێکهاتە پێکهێنەرەکانی ئەو بۆنە دەگەڕا، بۆ ئەوەی لاسایی ئەو بۆنەی مرۆڤ بکاتەوە، هەرچەندە دەیزانی کە ئەمە بەس نیە، بەڵام بەس بوو بۆ ئەوەی بە باشی مرۆڤەکانی تری پێ هەڵبخەڵەتێنێت.

هەندێک پیسایی پشیلە لە پشتی ئاستانەی ئەو دەرگایە کەتبوو، کە دەچووە سەر حەوشەکە، پیساییەکە هێشتان تەڕ بوو. نیوکەوچکی بچووکی لەو پیساییە هەڵگرت، لەگەڵ چەند دڵۆپە سرکە و کەمێک خوێی هاڕاوە لە شووشەشیرێکی کردن. لە بن مێزی کاردا بە قەد پەنجەی ئەسپێکوژە، پارچەیەک پەنیری دۆزیەوە، دیاربوو کە بەرماوەی ژەمێکی رونێل بوو، کەوتبووە خوارەوە. پەنیرەکە هەندێک کۆن ببوو، بۆگەنی کردبوو، بۆنێکی تیژی لێ دەهات. قووتوێکی ماسی ساردینی لە پشتەوەی دووکانەکە دانرابوو، هەندێکی لە سەری قووتووەکە کڕاند، کە بۆنێکی بۆگەنی تازەی لێ دەهات، تێکەڵی کردن لەگەڵ هێلکەیەکی پیس و دەرداوی سەگلاو و ئەمۆنیاک و میسک و شاخی هاڕاوەو بەزی بن پێستی بەراز، هەمووی لە ناوی یەکتری کرد و بە باشی لە یەکی حەل کردن. ئەو جا بڕێکی بە ڕێژە زۆر میسکی تێکرد، ئەوەی هەموو تێکەڵی ئەلکۆل کرد، لێی گەڕا تا هەموو لە ئەلکۆڵەکەدا خووسان و تلانەوە، ئەوجا ئەو تێکوشەی لە پارزنێکی ورد پارزنی پاراوەکەی لە شووشەیەکی تر کرد. پاراوەکە بۆنێکی یەکجار ناخۆش و توندی لێ دەهات، بۆنێکی بۆگەن وەک بۆنی ئاودەست. ئەگەر هاڵاوەکەی بە راتەکاندنی دەسەسڕێک لە هەوای سافدا پەرتکردبایە، وات دەزانی لە رۆژێکی گەرمی هاوین لە شەقامی ئۆفێری پاریس، لە گۆشەی شەقامی لانگری وەستاوی، لەو شوێنەی کە هاڵاوی هۆڵەکان و قەبرستانی ئینۆسۆم و خانووە پڕەکان دەگەیشتنەوە یەک.

لەسەر ئەو بۆنە بۆگەنە، کە پتر بۆنی کەڵاکی تۆپیوی لێ دەهات وەک لە بۆنی ئادەمیزاد، گرێنوی چینێک بۆنی چەور و تازەی رووکرد: لە بۆنەکانی پونگ و گوڵەخەزێم و بەلسەم و لیمۆ و کالەپتۆز. ئەو بۆنانەشی بە بۆنی رۆنی گوڵە گیانوسک و گوڵەباخ و نارنج و یاسەمین خۆش کرد. پاشتر هەندێک ئەلکۆل و سرکەی تری رژاندە ناو و هەمووی لە ژێرەوەڕا تێکوەردا، ئیتر چیتر بۆنە قێزەونەکە بۆنی نەما. بۆنە بۆگەنەکە بەو بۆنە تازانە گوم بوو، بۆنە قێزەونەکە بە بۆنی ئەو گوڵانە ڕازانەوەو جوان بوون، بۆنەکەی نزیکە لە بۆنی گوڵەکانیش خۆشتر بوو. چیتر هەست بە بۆنی بۆگەن نەدەکرا، هەر قیچێکیش بۆنە بۆگەنەکە نەما. بە پێچەوانە بۆنێکی خۆش و بەهێزی ژیان لە عەترەکە سەقامگیر بوو.

گرێنوی دوو شووشەی بچووکی لەو بۆنە پڕ کرد و سەری بە دەمەوانە قەپات کردن و خستنیە باخەڵی خۆی. پاشان کەموڵەو هاوەن و ڕەحەتی و کەوچکەکانی بە باشی بە ئاو شۆردن. هەمووی بە ئاوی لیمۆی تاڵ بسمیل کردن، بۆ ئەوەی هەموو شوونێکی بۆنەکانی پێشوو بسڕێنەوە. کەموڵەیەکی تری هێنا. بە پەڵە عەترێکی تری تێدا سازکرد، عەترێک وەک کۆپی عەترەکەی پێشوو، بەڵام بە پێکهاتەی تازەو گوڵاویی، ئەوجارەیان بنچینەکەی ئەلکهۆڵ نەبوو، بەڵکو بنچینەیەکی زۆر ئاسایی هەبوو، لە هەندێک میسک و عەنبەر و ڕۆنی داری سیدار. بۆنێکی تری تەواو جودای هەبوو لەگەڵ ئەوەی تر، بۆنێکی سووک و سادەتر، ڕۆشنتر، نادیارتر، چونکە هیچ پێکنەرێکی وای تێدا نەبوو، کە لاساییکراوەی بۆنی مرۆڤیی بێت. بەڵام ئەگەر مرۆڤێکی ئاسایی لەخۆی دابایەو لەگەڵ بۆنی تایبەتی خۆی تێکەڵی کردبا، ئەوا هیچ جیاوازی نەدەبوو لەگەڵ بۆنەکەی یەکەم، کە گرێنوی تایبەت بۆخۆی دروستی کردبوو.

دوای ئەوەی شووشەیەکی پڕی لە بۆنی دووەم دروست کرد، خۆی ڕووت کردەوەو جلوبەرگەکانی خۆی پێ ڕشاند. بن هەنگڵ و ناوگەڵ و نێوان پەنجەکانی پێ و سنگ و گەردەن و گوێچکەو قژی خۆی بە بۆنەکەی یەکەم بە ئاستەم تەڕ کرد. ئەوجا خۆی لەبەر کرد و لە کارگەکە هاتە دەرەوە.

## ٣٢

که گەیشتە سەر جادە، لە پڕێک ترس دایگرت، چونکە دەیزانی، ئەوە یەکەمین جاریەتی لە ژیانی، کە بۆنی ئادەمیزادی لێ بێت. ئەو بۆخۆی وا هەستی دەکرد کە بۆنی بۆگەنی لێ دێت، بۆنێکی یەگجار ناخۆش. نەیدەتوانی باوەڕ بەوە بکات، کە مرۆڤەکانی تر وەکو ئەو، هەست بەو بۆنە بۆگەنەی ناکەن، بۆیە زاتی نەکرد راستەوخۆ بچێتە ناو ژووری مێوانان، بۆ لای رونێل و سەرکاری کۆشکی گراف، کە لەوێ چاوەڕوانیان دەکرد. مەترسیەکەی پێ کەمتر بوو، ئەگەر جارێ تریفەی بۆنە نوێکەی لە شوێنێکدا، کە نەناسرێت، تاقی بکاتەوە.

بە تەنگەبەرترین و تاریکترین کووچەکاندا بە ئەسپایی بەرەو رووبارەکە چووە خوارەوە، بۆ ئەو شوێنەی کە دەباغچی و خمچی و ڕەنگکارەکان کارە بۆگەنەکانی خۆیانیان تێدا هەڵدەسووڕاند. کاتێک کەسێک ڕووبەڕووی دەهات، یان بەبەردەمی ماڵێکدا ڕەت دەبوو، لەو شوێنانەی منداڵان گەمەیان لێ دەکرد، یان پیرەژنان لەوێ دانیشتبوون، زۆری لەخۆی دەکرد، تا هێواشتر بڕوات و بۆنەکەی خۆی چڕتر لە دەوری خۆی پەخش بکات.

ئەو لە سەردەمی لاویەوە لەوە ڕاهاتبوو، کە ئەو مرۆڤانەی بەلای دا ڕەت دەبوون، هیچ جۆرە سەرنجێکیان بۆ ئەو رانەدەکێشا، نەک لەبەر ئەوەی ڕکیان لەم دەبووەوە، وەک جارێک ئەو وای بۆ چوو بوو، بەڵکو لەبەر ئەوەی هەستییان بە بوونی گرێنوی نەدەکرد. ئەو وەک خەڵکی تر، هیچ ژوورایەتی و هیچ تەوژمە شەپۆلێکی لە هەوای دەوروبەری خۆی دروست نەدەکرد، وەک دەڵێن هیچ سێبەرێکی نەبوو، بیخاتە سەر دەموچاوی مرۆڤەکانی تر. تەنها ئەگەر لەبەر تەنگەتاوی، یان لە ناکاوێک، لە گۆشەی جادەیەک خۆی لە یەکێک بدابایە، ئەوجا چاوتروکانێک سەرنجی خەڵکی دەکەوتە سەر، ئەویش بە جۆرێک، ئەو کەسەی کە خۆی لێ دەدا، بەرەو پاشەوە ڕادەتەکی و، هەندێک بە واق وڕماوی تەماشای گرێنوی دەکرد، وەک ئەوەی بوونەوەرێک ببینێت، کە لە راستیدا نەدەبووایە بوونی هەبێت، کەچی حاشاهەڵنەگرانە ئەو بوونەوەرە وا لەبەردەمیدا وەستاوە، کەچی لەبەر هەر هۆیێک بێت، خودی بوونەوەرەکە ئامادە نیە. ئەوجا تەمەشای دووری دەکرد و دیسان ئەو چاوتروکانەی فەرامۆش دەکرد...

بەڵام ئێستا لە کووچەکانی شاری مۆنتیپلیێر گرێنوی بە ڕۆشنی دەیدیت و هەستی پێ دەکرد، کە کاریگەرییەک لە مرۆڤەکانی تر دەکات، هەرجارێکیش ئەمەی دەدیت جەستەی پڕ دەبوو لە شانازی و هەستێکی بەهێز. کاتێک بەلای ژنێکدا ڕەت بوو، کە خۆی چەماندبووەوە سەر لێواری بیرێک، گرێنوی هەستی بەوە کرد، کە بۆ ساتێک ژنەکە سەری خۆی بەرز کردەوە، بۆ ئەوەی بزانێت، کێ بەلایدا ڕەت دەبێت، ئەو جا دڵی داکەت و بە هێمنی خۆی چەماندەوە بۆ سەر پەقرەجەکەی. پیاوێک کە پشتی لەم بوو، خۆی بۆ سوڕاند و ماوەیەک بە فزوولی تەمەشای ئەمی کرد. منداڵان، کە ڕوو بەڕووی دەبوون، خۆیان لێ لادەدا، نەک لەترسان، بەڵکو بۆ ئەوەی ڕێگەی بۆ بکەنەوە، کاتێکیش لە ماڵەکان بە غار دەهاتنە دەرەوەو بێ دەستی خۆیان، ڕووبەڕووی گرێنوی دەبوونەوە، نەدەترسان، بەڵکو بە شێوەیەکی ئاسایی خۆیان لێ لادەداو دوور دەکەوتنەوە، وەک ئەوەی پێشتر سۆسەی ئەوەیان کردبێت، کە کەسێک خۆی لێیان نزیک دەکاتەوە.

لە ئاکامی زۆر لەو تاقیکردنەوانە فێری ئەوە بوو، کە بە وردی هێزی کاریگەری تریفە نوێکەی خۆی هەڵبسەنگێنێت، ئیتر پتر هەستی بە دڵنیایی و بێباکی دەکرد. زۆرتر دەچووە ناو خەڵک و نزیکتر بە لایانەوە ڕەت دەبوو، بازووەکانیشی والاتر دەکردەوەو، جارجار وەک ئەوەی بە ڕێکەوت ڕوویدات، خۆی لە ڕێبواران دەدا. جارێکییان، گوایە نەیدیوە، بە توندی خۆی سرەواندە پیاوێک، کە دەیویست بە پێشی بکەوێتەوە. گرێنوی وەستا داوی لێبوردنی لێ کرد، ئەو پیاوە، کە تا دوێنی ئەگەر لە ناکاو گرێنوی بدیبایە، وەک ئەوە بوو کە هاڕەی گەواڵە زەندەقی بردبێت، ئەمڕۆ زۆر بە ئاسایی، وەک ئەوەی شتێک ڕووی نەدابێت، لێبوردنەکەی لێ قەبووڵ کرد و بە زەردەخەنە وەڵامی دایەوەو کەمێکیش دەستی خستە سەر شانی گرێنوی.

گرێنوی کووچەکانی بەجێهێشت و چووە ناو مەیدانەکەی بەردەم کاتێدرای سانت پییەر. زەنگەکان دەزرنگانەوە. لە هەردوولای دەروازەکەیەوە خەڵک قەرەپەستانێی چوونەژوورەوەیان بوو. تازە مەراسیمی مارەبڕییەک کۆتایی هاتبوو، خەڵکی دەیانویست بووکەکە ببینن. گرێنوی چووە ئەوێ و خۆی تێکەڵی ئاپۆڕەکە کرد. کەوتە قەرەپەستانێ و بەرەو ژوورەوە خۆی کوتایە ناو خەڵکەکە، دەیویست خۆ بگەیەنێتە ئەو جێگەیەی کە ئاپۆڕەی خەڵکەکەی تێدا لە هەموو جێیەک چڕتر بوو، دەیویست زۆر لێیان نزیک بکەوێتەوە، دەیویست ڕاستەوخۆ بۆنەکەی خۆی لە لووتیان هەڵبسوێ. لە ناو ئەو حەشاماتە چڕ و پڕ و قەرەپەستانێیەدا بازووەکانی خۆی بە فراوانی لێککردەوەو قاچەکانی فش کردەوە، باخەڵی خۆی ئاوەڵا کرد، بۆ ئەوەی بێ هیچ بەربەستێک بۆنەکەی سەر جەستەی لەم ناوە پەخش ببێت... لە خۆشییان شاگەشکە بوو، کاتێک دیتی، کە

ئەوانەی تر هەستییان بە هیچ نەکرد، هیچ شتێک لەوە ئاسانتر نەبوو، کە ئەو پیاو و ژن و منداڵانە، کە خۆیان قرمساندبووە سەر جەستەی، ئاوا فرێوبدرێن و، بۆنی تێکەڵەی بۆگەنی گووپشیلەو پەنیر و سرکە، بە بۆنی خۆیان تێبگەن و وەک بۆنی خۆیان هەڵی بمژن و، گرێنوی وەک مرۆڤێک لە نێوان خۆیاندا قەبووڵ بکەن.

هەستی کرد ئەژنۆکانی بەر منداڵێک دەکەون، کچێکی چکۆلە، کە خزابووە ناو گەورەکان و چەقی بوو، درۆزنانە گوایە خەمی منداڵەکەیەتی، منداڵەکەی بەرز کردەوە، بۆ ئەوەی ماجەرایەکە ببینێت. دایکەکە نەک هەر ئەوەی پێ خۆش بوو، بەڵکو سوپاسیشی کرد، منداڵەکەش لە خۆشییان دەزریقایەوە.

بەو جۆرە گرێنوی چارەگە دەمژێرێک لە باوەشی ئاپۆڕەکە مایەوە، منداڵێکی بیانی لە باوەشی خۆی گوشیی بوو، گوایە لە خۆشەویستییەوەیە. کاتێک لەگەڵ دەنگی زرنگانەوەی زەنگەکان و هەڵلاو چەپڵەکوتانی خەڵکەکە، بەشداربووانی ئاهەنگی مارەییەکە بەلایاندا تێپەڕین و، پارەو شەکرۆکەو چوکلات بەسەریاندا بەرەوژێرەوە فڕکەی کرد، هەڵلاییێکی تر لە ناوەوەی گرێنوی گرماندی، هەڵلاییێکی ڕەش، هەڵلای غەرەزێکی بەد، بەو هەڵلایە موچڕک بە هەموو جەستەی داهات، خووێک وەک هەڵچوونی هەستی شەهوەت مەستی کرد، زۆری لە خۆی کرد، کە ئەو شەهوەتە وەک ژەهر و زراو بە هەموو لایێک و بەسەر خەڵکەکەدا نەپرژێنێت و لە خۆشییان بەسەریاندا نەنەڕێنێت و هاوار نەکات: کە ئەو لەوان ناترسێت، ئیتر نەک هەر کەمێک ڕقی لەوان دەبێتەوە، بەڵکو لە کانگای دڵیەوە رقی لێیانەو دەیانبوغزێنی، چونکە ئەوان بێ تام گێل بوون، چونکە ئەوان بە درۆ و بە فێڵەکانی فرێو دەخۆن، چونکە ئەوان هیچ نەبوون و ئەو خۆی هەموو شتێک بوو! ئەوجا بۆ پۆز دەرپەڕاندن و گاڵتە پێ کردن منداڵەکەی بە خۆیەوە گوشی و، سنگی پڕ هەوا کرد و لەگەڵ خەڵکەکانی تر بە کۆرس هاواری کرد: "خۆشی بۆ بووک! بژی بووک! هەر بژین ئەو بووک زاوا جوانە!"

کە کاروانی ئاهەنگگێڕانی مارەبڕینەکە دوور کەوتنەوەو خەڵکەکە دەستی بە بڵاوبوونەوە کرد، منداڵەکەی دایەوە دایکی و چووە ناو کلێسایەکە، تا هەڵچوونەکەی دابمرکێنێتەوەو پشووێک بدات. هەوای ناوەوەی کلێساکە پڕ بوو لە بۆنی بخوور، کە وەک دوو چڕەدووکەڵ لە دوو بخووردانی ئەملاو ئەولای قوربانگەی کلێساکە بەرزدەبووەوەو وەک میچێک بۆنە ناسکەکانی ئەو خەڵکەی دادەپۆشی، کە هێشتان لەوێ دانیشتبوون. گرێنوی لەسەر تەختەیەکی بەردەم سەکۆی ئەلتاری کلێساکە لەسەرچیچکان دانیشت.

له ناکاوێک هەموو جەستەی پڕ بوو لە خۆشییەکی گەورە. ئەمە خۆشییەکی مەستانە نەبوو وەک ئەو خۆشییانەی کە جاران لە ناو کۆشکی بن شاخەکە هەستی پێ دەکرد و لە تەنهایی خۆیدا پێیان مەست و دابین دەبوو، بەڵکو خۆشییێکی بە ئاگا و هۆشیارانە بوو، وەک خۆشی دەستکەوتنی دەسەڵات، هاتنەدی دەسەڵاتی تایبەتی خۆی. بە بەکارهێنانی کەمترین ماددەو، تەنها لە سایەی بلیمەتیی خۆیدا، توانی لاسایی بۆنی مرۆڤ بکاتەوە، ئەوندەش باش لاسایی بکاتەوە، کە تەنانەت منداڵێکی پێ هەڵبخەڵەتێنێت. زانی کە ئەو دەسەڵاتی زۆر لەوە پترە. تێگەیشت کە توانای ئەوەی هەیە کە ئەو بۆنە زۆر چاکتر بکات. ئیتر ئەو دەتوانێت بۆنێک بهێنێتە بەرهەم، کە نەک هەر بۆنی مرۆڤ بێت و بەس، بەڵکو بۆنێک بێت کە بەرزتر بێت لە مرۆڤ، لە مرۆڤ مرۆڤیی تر بێت، بۆنی پەری و فریشتان بێت، بۆنێکی باشی پڕ ژیان، بۆنێکی بە هێز، ئەوەندە باش کە نەتوانرێت بە وشە باسی لێوە بکرێت، عەترێکی وا بێت، کە هەر کەسێک جارێکی بۆن بکات، وەک ئەوە وابێت کە سیحری لێ کرابێت و، بێ دەستی خۆی ئەویان، واتە گرێنوی، هەڵگری ئەو عەترەی، لە ناخی دڵەوە خۆش بوێت.

بەڵێ، کاتێک لە کایەی بۆنەکەی ئەودا دەوەستان، ناچار بووان ئەویان خۆش بوێت، نەک هەر ئەوەندە وەکو یەکێکی وەک خۆیان قەبووڵی بکەن و بەس، بەڵکو ئەوەندە ئەویان خۆش بوێت، تا ڕادەی شێت و شەیدایی، تا ڕادەی خۆتەسلیمکردن، پێویستە بەو بۆنە بلەرزن و موچڕکەیان بە لەشدا بێت، هاوار بکەن، لە خۆشییان بگرین، کاتێکیش تەنها بۆنی ئەویان، واتە هی گرێنویان، بۆ دەچێت، بێ ئەوەی بزانن، بۆچی وا دەکەن، کڕنووش بەرن و بچەمێنەوە سەرچۆک، چون لە ژێر بۆنی بخووری خودایی چۆک دادەدەن ئاوا. بەو جۆرە، ئەو تا ئەوکاتە لە ناو ئەندێشەکانی خۆیدا چۆن بوو، ئاوا، بەڵام ئێستا لە ناو دونیایێکی ڕاست و بەرامبەر مرۆڤی ڕاستیی. زانی ئیتر ئەوە کەوتۆتە ژێر دەسەڵاتی خۆی. چونکە مرۆڤەکان دەتوانن بەرامبەر گەورەییەکان، بەرامبەر شتە ترسناکەکان، بەرامبەر جوانییەکان، چاوبقوچێنن، بەرامبەر ئاوازەکان، وشە ڕەق و تەوساوییەکان گوێی خۆیان بگرن، بەڵام نەیاندەتوانی خۆ لە بۆنی عەترەکەی ئەو ڕزگار بکەن. چونکە بۆن برای هەناسەدانە. بۆن لەگەڵ هەناسەدا دەچێتە ناوەوەی مرۆڤ، ئەوان نەیاندەتوانی خۆیان لە هینەکەی ئەو بپارێزین، ئەگەر بیانویستبایە بژین. بۆن دەچێتە ناخی ناخەوەیان، ڕاستەوڕاست دەچێتە ناو چەقی دڵییان، جا لەوێش، لە کانگای دڵیانەوە ئەو جوداییە، جودایی نێون مەیل بۆچوون، ڕق، قێزبوونەوەو زەوق، خوشەویستی و کینە دەردەکەوێت. ئەوەی دەسەڵاتی بۆنەکانی لەدەستدا بێت، دەسەڵاتی دڵی مرۆڤەکانی لەدەستدایە.

گرێنوی لەسەر تەختەکەی کاتێدرای سانت پییەر بە تەواوی هەستی بەئازادی دەکرد، دانیشتبوو و  پێدەکەنی. ئەوە هەستکردن بە خۆشییێکی هەڵچوونئامێز نەبوو بۆ ئەو، کاتێک نەخشەی ئەوەی کێشا، مرۆڤەکان بخاتە ژێر دەسەڵاتی خۆی. ئەو ڕەشکەوپێشکەیەکی شێتانە نەبوو کە بەبەرچاویدا ڕەت دەبوو، ئەوە خەندەیەکی شێتانە نەبوو کە کەوتبووە سەر دەموچاوی. وە نەبێت ئاگای لە خۆ نەمابێت، بەڵکو بیر و ئەندێشەیەکی سافی هەبوو، بە شێوەیەک پرسیاری لەخۆی کرد، ئەرێ بەڕاست من ئەوەم بۆچی گەرەکە؟ خۆشی بەخۆی گوت، ئەو ئەوەی گەرەکە، چونکە ئەو ڕۆژ لە دوای ڕۆژ خراپتر دەبێت. ئەوەی بە بەخۆی گوت و پێکەنی و زۆر خۆشحاڵ بوو. گرێنوی زۆر بێ گوناه دەکەوتە بەرچاوان، وەک هەر مرۆڤێکی تر، کاتێک هەست بە بەختەوەری دەکات.

ماوەیەک ئاوا بە دانیشتوویی مایەوە، زۆر بە قووڵی کەوتبووە ناو ئەندێشەکانی خۆی، هەوا بخووراویەکەی پڕ بە سنگی خۆی هەڵدەمژی و دەیدایەوە. دیسان زەردەخەنەیەکی سووک کەوتە سەر دەموچاوی:  ئەو بۆنە کە لەو خودایەوە دێت و پەرت دەبێت و بڵاودەبێتەوە بۆنێکی چەندە ناخۆشە! ئەو بۆنە چەند بە گاڵتە دروستکراوە،. ئەوە هەر بۆنی بخووری ڕاستەقینەش نەبوو، کە لە بخووردانەکانەوە بە چڕەدوکەڵ هەڵدەستا. ئەوە بخوورێکی قەڵپی خراپ بوو، لە داری سنجو و دارچین و شۆرە، بە قوڵڵابی دروستکرابوو. خودا بۆنی بۆگەنی لێ دەهات. خودا هەژارێکی نابووتی بۆگەن بوو. خودایان فریودابوو، ئەو خودایە، یان هەر خۆی فریودەر بوو، جیاوازییێکی لەگەڵ گرێنوی نەبوو ــ ئەوە نەبێت فریودەرێکی زۆر خراپتر بوو!

## ٣٣

گراف تایادە- ئێسپیناس بەو عەترە نوێیە شاگەشکە ببوو. دەیگوت، تەنانەت بۆ خودی ئەویش، وەک دۆزەرەوەی گازاوی مەرگ، جێگەی سەرسوڕمانە، کە شتێکی ئاوا لاوەکی و ناجێگیری وەک عەتر کاریگەریەکی ئەوەندە گەورە لە باری تەندروستی کەسێک بکات، بە پێی چاوگی عەترەکە، بە پێی ئەوەی کە ئایا ئەو عەترە لە ناوچەیەکی نزیک زەوی، یان لە بەرزایی و دوور لە زەوی سەرچاوەی گرتووە. گرێنوی کە بەر لە چەند سەعاتێک دەتگوت مردووە، زەرد زەرد وەک بێهۆشێک لەو ناوە کەوتبوو، ئێستا گەش و تازە بووەتەوە، وەک هەر مرۆڤێکی تەندروستی لە تەمەنی خۆی، بەڵێ پیاو دەتوانێت بڵێت، جۆرە گۆڕانێک بەسەر گرێنویدا هاتووە، لەگەڵ هەموو ئەو کەموکورتیانەی، کە لە هەرکەسێکی وەک ئەو، واتە لە کەسێکی کەم خوێندەوار و کەم ئەزموونا هەیە، شتهاییێکی نزیکە وەک کەسایەتیی تێدا بە دیارکەوتووە. هەرچۆنێک بێت ئەو، تایادە- ئێسپیناس، لە بەشی "پارێزی چالاک"، لە کتێبی داهاتوویدا لە بارەی بیردۆزی گازاوی مەرگ، باسی ئەو رووداوە دەکات. بەڵام جارێ ئەو خۆی، خۆی بەو بۆنە نوێیە عەتراوی دەکات.

گرێنوی هەردوو شووشەکەی دایە دەست، ئەو دوو شووشەی کە پڕ بوون لە گوڵاوە ئاساییەکە، گراف هەردوو بۆنی بە خۆیدا پرژاند. دیار بوو کە بە کاریگەری بۆنی هەر دوو عەترەکە زۆر ئاسوودە بوو. دانی پێدانا، کە دوای ئەوەی ئەو هەموو ساڵە بۆنی خەتەرناکی وەنەوشەکە، وەک قورقوشم کاری لێ کردووە، ئەمڕۆ وەکو ئەوە وایە، کە دوو باڵی گوڵاوی لێ ڕوابێت، ئەگەریش بە هەڵەدا نەچووبێت، ئەوا ژانی چۆکەکانی کە هەراسانیان کردووە، هەروەها زیکەزیکی ناو گوێچکەکانی، سووکتر بوونەتەوە، بە گشتی هەست بە چاکتربوونی تەندروستی خۆی دەکات، دەڵێی چەند ساڵێک گەنجتر بووەتەوە. لە گرێنوی نزیک کەوتەوە، باوەشی پێدا کردو بانگی کرد "گرێنوی، برای گازاویم". بەمە مەبەستی بانگکردنێکی کۆمەڵایەتیی نەبوو، بەڵکو ئەمە بانگکردنێکی تەواو رۆحیی بوو، کە لە ئەندێشەی فەلەکیی گازاوی مەرگدا سەری هەڵدابوو، ئەو گازاوەی کە هەموو مرۆڤەکان تێیدا دەبوو وەک یەک بن، وە تەنها لەو گازاوەداو بەس، نەخشەی

بۆ ئەمە دادەنا، ئەمەشی درکاند، کاتێک باوەشی لە گرێنوی دەکردوە، جا بە ڕاستی، زۆر دۆستانەو رووخۆش، کەمترین نەگونجانی پێوە دیار نەبوو، وەک ئەوەی خۆی لە خۆی بکاتەوە، گوتی، بەو زووانە پێشکەوتووترین ڕێکخراو دادەمەزرێنێت، کە ئامانجی بریتی بێت لە چارەسەری تەواوی کێشەکانی گازاوی مەرگ، هەوڵ بۆ ئەوە بدات کە بە زووترین کات ئەو گازاوی مەرگە بە گازاوی ژیان بگۆڕێت، یەکەمین ئەندامی ئەو ڕێکخراوەش گرێنوی دەبێت، لە ئێستاوە پەیمانی ئەمە دەدات. پاشان داوای کرد کە ڕەچێتەی عەترەکەی بۆ لەسەر کاغەزێک بنووسێت، کاغەزەکەی خستە گیرفانی و پەنجا لیرەی لویسیشی بە دیاری دایە گرێنوی.

لە کات و ساتی تەواوی خۆیدا، هەفتەیەک دوای یەکەمین سمیناری، گراڤ تایادە- ئێسپیناس لە گەورەترین هۆڵی زانکۆ شاگردەکەی خۆی خستەوە بەرچاوی تەماشاکەران. حەشاماتێکی یەگجار زۆر بە قەرەپەستانێ ئامادە ببوون. هەموو خەڵکی شاری مۆنتپلیێر هاتبوون، نەک هەر هەر خەڵکی زانستیی، بەڵکو خەڵکی ئاساییش، لەوانە ژنان زۆر هاتبوون، دەیانویست بە چاوی خۆیان مرۆڤە ئەفسانەییەکەی ناو ئەشکەوت ببینن. هەرچەندە دژەکانی گازاوی مەرگ بە گشتی و نوێنەرانی "بازنەی دۆستانی باخەکانی رووەکی زانکۆ" و ئەندامانی "ڕێکخراوی کۆمەککاری کەلتووری کشتوکاڵی" هەموو هێزی خۆیان لە دژی ئەو پێشاندانە بەکارهێنابوو، بەڵام سمینارەکە سەرکەوتنێکی بێ وێنەی بەدەستهێنا. بۆ ئەوەی بارودۆخی هەفتەیەک لەمەوبەری گرێنوی بێنێتەوە بیری خەڵک، تایادە- ئێسپیناس لە سەرەتا کۆمەڵێک وێنەی پێشانی ئامادەبووان دا، بۆ ئەوەی مرۆڤی ئەشکەوتەکەیان بە هەموو ناشیرینی و شڕ و شەپڕێوی ئەوسای بە تەواوی بێتەوە بەرچاو. ئەوجا گرێنوی نوێی هێنایە بەرچاویان، بە پانتۆڵ و کراسێکی ئاوریشمی جوان، پۆدرەو ئارایشتکراو، بە قژی چاککراو، بە قیت و قۆزی و بە لەنجەو بە هەنگاوی ناسک ناسک، بە سمتبادانێکی خانانە بەبەرچاویاندا دەهات و دەچوو، بێ هیچ یارمەتی و بێ هیچ راگرێک خۆی بە قووڵی چەماندەوەو کڕنووشی برد، خێرا خێرا بەرەو ئەملا و ئەولا بە زەردەخەنە دەخەنییەوەو ملی دەلەراندەوە، وای کرد، کە گوماندار و ڕەخنەگرانیش بێ دەنگ ببن. تەنانەت دۆستانی باخەکانی رووەکی زانکۆش بە بێ دەنگی خشینە ناو هۆڵەکە. ئەو گۆڕانەی بەسەر گرێنویدا هاتبوو، لە ڕادە بەدەر بوو، ئەوەی لێرە روویدا بوو، پەڕجووێکی ئاشکراو بە هێز بوو: لەو شوێنەی هەفتەیەک بەر لە ئێستا گیانەوەرێکی شڕ و شێواوی کێوی هەڵتوتڕکابوو، ئێستا هەر بەڕاستی مرۆڤێکی شارستانی ڕێکوپێک وەستا بوو. ئەو ڕووداوە بە قووڵی سەرنجی تەواوی ئامادەبووانی هۆڵەکەی بۆخۆ راکێشا بوو، کاتێک تایادە- ئێسپیناس بۆ پێشکەشکردنی سمینارەکەی هەستایەوە، هەست و

خوست له هۆڵەکە نەما، ئارامییەکی تەواو هۆڵەکەی داگرت. تایادە بە جارێک پەرەی بە بیردۆزە بەناوبانگەکەی خۆی دا، بیردۆزی گازاوی مەرگی زەوی، پاشان کەوتە قسە، باسی ئەوەی کرد کە بە چ هۆییێکی میکانیکی و پارێزکاری، جەستەی گرێنوی لە گازاوی مەرگ پاک کردۆتەوەو لە جیاتی ئەمە بە گازاوی ژیان باربووی کردووە، ئەوجا داخوازی لە هەموو ئامادەبووان کرد، لە دۆستان و لە دژانی، کە با بەم بەڵگە سەڵمێنەرە گەورەیە، ئیتر واز لە بەربەرەکانێی بیردۆزەکەی بهێنن و بێن هەموو پێکەوە لەگەڵ ئەو، تایادە- ئێسپیناس، هەوڵی لەناوبردنی ئەو گازاوە مەترسیدارە بدەن و خۆیان بۆ گازاوی چالاکی ژیان ئاوەڵا بکەنەوە. لەگەڵ ئەو چەند وشەی دوایی، باوەشی خۆی بە فراوانی کردەوەو چاوەکانی بەرەو ئاسمان بەرزکردوە، زۆر لەو پیاوە زانایانەی کە لەوێ ئامادەبوون لاساییان کردەوەو ژنانیش دەستیان کرد بە گریان.

گرێنوی لەسەر سەکۆکە وەستا بوو، بەڵام گوێی لەو قسانە نەگرتبوو. ئاش لە خەیاڵێ و ئاشەوان لە خەیاڵێ، ئەو بە خۆشییێکی زۆرەوە تەماشای کاریگەری گازاوێکی تری دەکرد، گازاوێکی زۆر راستەقینەتر: گازاوە تایبەتییەکەی خۆی. گەورەیی ژوورایەتی هۆڵەکە چەندی گەرەک بوو، ئەوەندە بە چڕی عەترەکەی لە خۆی دابوو، هێشتان بە تەواوی نەگەیشتبووە سەر سەکۆی هۆڵەکە، کە تیشکەکانی تریفەی بۆنەکەی بە توندی بە هۆڵەکەدا پەخش ببوون. گرێنوی دەیدیت، هەر بە ڕاستی بە چاویش دەیدیت! کە چۆن تیشکەکان دەگەنە ریزی پێشەوەی تەماشاچییان، پاشان بەرەو پشتەوە پەرت دەبن، تا دەگەنە ریزەکانی پشتەوەی دانیشتووان. جا کە تریفەی بۆنەکەی دەگەیشتە خەڵکەکە دڵی گرێنوی پڕ دەبوو لە خۆشی، دەگەشایەوە. خەڵکەکە بێ ئەوەی بۆخۆیان هەستی پێ بکەن، لە ژێر کاریگەری بۆنەکەی گرێنوی ڕەنگی دەموچاویان دەگۆڕا، شێواز و هەستییان دەگۆڕا. ئەو کەسانەی کە پێشتر بە سەرسامی تێی رامابوون، ئێستا بە چاوێکی نەرمتر تەماشایان دەکرد، ئەوەی تا ئێستا بەرەو پاشەوە پشتی خۆی دابووە سەر پشتۆکی کورسییەکەی و، نێوچەوانی لۆچی ڕەخنەیان تێدا زابوو، گۆشەکانی دەمی مانادارانە گرژ بوون، ئێستا کەمێک بەرەو پێشەوە هاتبوو و دەموچاوی خاوببووەوەو مندالانە هەڵگەڕابوو. تەنانەت لە دەموچاوی کەسە ترسنۆکەکان، زەندەقچووەکان، هی ئەوانەی کە لە هەمووان هەستیارتر بوون، کە پێشتر بە چاوی سام و ئێستاش کەمێک بە چاوی گومان و بێ بڕوایی تەماشایان دەکرد، کە بۆنەکەیان دەگەیشتی، هەندێک نیشانەی دۆستایەتی بگرە لایەنگرییان لێ بە دیار دەکەوت.

لە کۆتایی کۆڕەکە تەواوی خەڵکەکە هەستانەوە سەر پێیان و چەپڵەو غەڵبەغەڵبی حەماسەت بە جارێک دەنگی دایەوە. "بژی گازاوی ژیان! بژی تایادە- ئێسپیناس! بەرزی بۆ بیردۆزی گازاوی

مەرگ! بڕوخێ پزیشکی ئۆرتۆدۆکسی!" ئاوا خەڵکی خوێندەواری گرنگترین شاری زانکۆیی باشووری فەرەنسا، شاری مۆنتپلییێر هاواریان دەکرد، ئەمەش مەزنترین سات بوو لە ژیانی گراف تایادە-ئێسپیناسدا. هەرچێ گرێنویە، لە سەکۆکە هاتە خوارەوەو خۆی تێکەڵی ئاپۆڕەی خەڵکەکە کرد، ئەو دەیزانی کە ئەو چەپڵە لێدانە لە راستیدا دەبوایە بۆ ئەو بێت، تەنها بۆ ئەو، بۆ جۆن پاتیست گرێنوی، ئەگەرچی هیچ کەسێک لە چەپلەلێدەرانی هۆڵەکە هیچی لەو بارە نەدەزانی.

## ٣٤

گرێنوی چەند هەفتەیەکی تریش لە شاری مۆنتپلییێر مایەوە. لەوێ ناوبانگی دەرکردبوو، لە هۆڵەکان بانگهێشتن دەکرا، بۆ ئەوەی لەبارەی ژیانی ناو ئەشکەوت و چاکبوونەوەی بە دەستی گراف پرسیاری لێ بکەن. ئەویش ناچار بوو هەمیشە بەسەرهاتی رێگرەکان بگێڕێتەوە، ئەوانەی کە فڕاندبوویان، هەروەها چیرۆکی ئەو سەبەتەی کە بۆی شۆڕکرابووەوە، هەروەها هی پەیژەکەش. جار دوای جار چیرۆکەکەی جوانتر دەڕازاندەوەو وردەکاری تری دەخستە سەر. بەو شێوەیە ئەمە بۆ ئەو ببوو بە مەشقێک بۆ قسەکردن، بەڵام بێ گومان لە سنوورێکی زۆر بەر تەسک، چونکە ئەو لە هەموو ژیانی خۆیدا، ئەوەندە سەروکاری لەگەڵ قسەکردندا نەببوو، ئەوەی لای ئەو گرنگ بوو، دووبارەکردنەوەی رۆتینی درۆیێک بوو.

لە راستیدا، ئەوەی بۆ دەرکەوتبوو، کە ئەو دەتوانی هەرچی بخوازێت، بۆ خەڵکی بگێڕێتەوە. کە خەڵکەکە جارێک باوەڕیان پێ کرد، بە هەڵمژینی یەکەم هەناسە لە بۆنە دەستکردەکەی باوەڕیان پێ کرد، ئەوا ئیتر هەموو شتێکی پێ باوەڕ دەکەن. ئەو شتێکی تریشی دەستکەوتبوو، لە هەڵسوکەوتی بەرامبەر کۆمەڵگا هەستی بە جۆرێک لە دڵنیایی دەکرد، ئەو قەت هەستی بە دڵنیاییێکی ئاوا نەکردبوو. ئەو دڵنیاییە تەنانەت خۆی لە جوڵەی جەستەشی پێشاندەدا. وەک ئەوەی گەورەتر بوو بێت. کووڕی پشتی گوم ببوو. نزیکە تەواو بە قیت و قۆزی دەڕۆیشت بەڕێوە. کاتێکیش دەیاندواند، چیتر خۆی وێک نەدەنایەوە، بەڵکو بە قیتی بەرامبەر نیگای بەرامبەرەکەی دەوەستا. دیارە لەو کاتەدا پیاوێکی جیهانی لێ دەرنەچوو بوو، نەشبووبوو بە کەسێکی دیار یان پیاوێکی سەربەخۆی ناو کۆمەڵگا. بەلام چیتر سیمای گومان و فێڵ و فەرەجی پێوە نەمابوو، لە جیاتی ئەوە ببوو بە کەسێکی خاکی سروشتی، یان ئەوپەڕی وەک کەسێکی بە زگماک شەرمن دەکەوتە بەرچاو و سۆزی هەندێ لە ژنانی بۆخۆی رادەکێشا. لەوان سەردەمان خانمان پتر مەیلیان بۆ شەرمی سادەو سروشتی دەچوو.

رۆژێکی سەرەتای ئادار، بەیانی زوو بە دزی ئەوێی بەجێهێشت. هێشتان دەروازەکان بە تەواوی نەکرابوونەوە، بە نهێنی کەلوپەلەکانی خۆی پێچایەوە، چاکەتێکی قاوەیی سەرنجرانەکێشی لەبەر

کرد، کە ڕۆژی بەرێ لە کۆنەخانە کڕی بووی، کلێتەیەکی کۆنەی لەسەر کرد، کە نیوەی دەموچاوی داپۆشی بوو. کەس نەیناسییەوە، کەس نەیدیت، کەس ئاگای لێ نەبوو، چونکە ئەو ڕۆژە بە ئانقەست بۆنەکەی لە خۆی نەدا. کاتێک بەرە بەری نیوەڕۆ گراف تایادە- ئێسپیناس ناردی بەدوایدا بگەڕێن، پاسەوانەکان سوێندییان بەخواو پێغەمبەران خوارد، زۆرکەسییان دیوە ئەمڕۆ، کە شارییان بەجێهێشتووە، بەڵام ئەو مرۆڤە ناسراوە ئەشکەوتییەیان نەکەتۆتە بەرچاو، دەنا بێگومان دەیانناسییەوە. ئیتر دوای ئەوە گراف بڵاوی کردەوە، کە گوایە گرێنوی بە ڕەزامەندی ئەو شاری مۆنتپلیێری بەجێهێشتووە، بۆ کاروباری خێزانیی خۆی سەفەری کردووە بۆ پاریس. بەڵام لە دڵەوە گراف زۆر قەڵس و دەهری ببوو، چونکە ئەو نەخشەی ئەوەی کێشابوو، گرێنوی بە هەموو سنووری مەملەکەتدا بگێڕێت، بۆ ئەوەی لایەنگر بۆ بیردۆزی گازاوی مەرگ پەیدا بکات.

دوای ماوەیەک گراف هێور بووەوە، چونکە بەبێ ئەو گەڕانەش ناوبانگی بە وڵاتدا بڵاوبووەوە، بێ ئەوەی ئەو کارێک بۆ ئەمە بکات. چەندین مەقالەی دوورودرێژ لەسەر گازاوی مەرگ بڵاوکرایەوە، لە گۆڤاری زانستیی"Journal des sçavans" و تەنانەت لە گۆڤاری " Courrier del Europa"ش، چەندین نەخۆشی گازاوی مەرگ لە دوورە وڵاتانەوە هاتنە لای بۆ چارەسەری. لە هاوینی ١٧٦٤ ڕێکخراوێکی بە ناوی "ڕێکخراوی گازاوی ژیان" دروستکرد و هەر لە شاری مۆنتپلیێر ١٢٠ ئەندامی هەبوو، لقی ئەو ڕێکخراوە لە شارەکانی مارسێی و لیۆنیش دامەزران. پاشان گراف بڕیاری دا، پەل بەرەو پاریسیش بهاوێت، بەڵام بەر لەمە ویستی وەک پرۆپاگەندەیەکی پاڵپشت بۆ هەوڵەکانی شاکارێکی مەزن لە بارەی گازاوەکەی بە ئەنجام بگەیەنێت، کارێک کە گرەو لە تاقیکردنەوەی مرۆڤی ئەشکەوتەکەو هەموو تاقیکردنەوەکانی تری بباتەوە. ئەوە بوو لە سەرەتای مانگی کانوونی دووەم کۆمەڵێک لە شاگردە جەربەزەکانی خۆی کۆکردەوە بۆ گەشتێکی زانستیی بەرەو بەرزترین شاخ لە شاخەکانی هەرێمی پورێنیان، بەرەو شاخی "پیک دو کانیگۆ" کە دەکەوێتە سەر هەمان ئەو هێلی پانییەی، کە پاریسی کەوتۆتە سەر. ئەو پیاوە، کە گەیشتبووە ئاستانەی پیریی ویستی تا سەر لووتکەی ٢٨٠٠ مەتر بەرزی هەڵیبگرن، لەوێ سێ هەفتەی تەواو هەوای تازەو بێگەردی ژیان هەڵبمژێت. گراف ڕایگەیاندبوو، کە بێ دواکەوتن، تەواو لە کاتی خۆی و لە شەوی پیرۆزدا وەک لاوێکی خورتی بیستساڵە لە شاخەکە دێتە خوارەوە. شاگردەکانی کەمێک لە دواوەی ڤێرنێت، کە دوا ئاوایی بوو لە دامێنی شاخە سامناک و سەختەکان، کۆڵیان دا. بەڵام گراف باکی بە هیچ نەبوو، هیچ شتێک پەشیمانی نەدەکردەوە، بەو سەرما بەفراویە، جلەکانی فڕیداو بە دەنگێکی بەرز و بە هاوار هاوار، بە تەنها دەستیپێکرد بە شاخەکەدا هەڵبگەڕێت. دوا شتی کە لێیان

دیت کڵاوەکەی بوو، وەک ئەوەی حاڵی گردبێت دەستەکانی بەرەو ئاسمان بەرزکردبووەو گۆرانی دەگوت و بەم شێوە لە ناو زریان و بەفردا گوم بوو.شەوی پیرۆز هات، شاگردەکان بێ سوود زۆر چاوەڕێی گەڕانەوەی گراف تایادە- ئێسپیناسیان کرد. نە وەک پیرەمێردێک و نە وەک لاوێک نەگەڕایەوە. لە سەرەتای هاوینی ساڵی نوێشدا، هەندێک لە شاگردە جەربەزەکانی زۆر بەدوایدا گەڕان، هەرچەندە هێشتان لووتکەی شاخی "پیک دو کانیگۆ" بەفر داپۆشتبوو، بەڵام هیچی لێ نەدۆزرایەوە، نە پارچە جلێک، نە پارچەیەکی جەستەی، نە ئێسقانێکی.

بەڵام بێ گومان بیردۆزەکەی کۆتایی نەهات. بە پێچەوانە. ئەوەندەی پێ نەچوو، بوو بە حەکایەت، بوو بە ئەفسانە، لەسەر لووتکەی شاخەکە گازاوی ژیانی مارەکردووە، ئەو خۆی لە گازاوی ژیان و گازاوی ژیانیش خۆی لەم تواندۆتەوە، ئیتر ئێستا بە نادیاریی بە هەواوە دەژی، لە لاوێتییێکی جاویدانی بەسەر شاخەکانی پورێنیاندا دەسووڕێتەوە، هەر کەسێکیش بچێتە سەر شاخەکە بۆ لای ئەو، ئەگەر ساڵێک لەوێ بمێنتەوە، ئەو بەشی خۆی وەردەگرێت و بۆ ماوەی ساڵێک نە نەخۆش دەبێت و نە پیر. تا سەدەی نۆزدەمیش بیردۆزی گازاوی تایادە- ئێسپیناس تێکەڵی هەندێک خوێندنی پزیشکی قوتابخانە پزیشییەکان ببوو، لە زۆر چارەسەری و چاککردنەوەی نەخۆشان بەکاردەهێنرا. ئێستاشی لەگەڵدا بێت، لەم لاو لەو لای شاخەکانی پورێنیان، واتە لە پێرپیگنان و فیگۆراس، تایادەستنلۆگە لایەنگرانی نهێنیی ، ساڵی جارێک یەکتر دەبینن و پێکەوە بەسەر شاخی "پیک دو کانیگۆ" دا هەڵدەگەڕێن.

لەوێ لەسەر لووتکەی شاخەکە ئاگرێکی گەورە دەکەنەوە، گوایە ئەو ئاگرە بە بۆنەی هاتنی هاوین و بۆ رێزگرتن لە یۆحەنناى پیاو چاک دەکەنەوە. بەڵام لە راستیدا ئاگرەکە بۆ گراف تایادە- ئێسپیناس و بەرزراگرتنی بیردۆزی گازاوی مەرگ دادەگیرسێنن، بۆ ئەوەی بگەن بە ژیانی ئەبەدی.

# بەشی سێیەم

## ٣٥

گرێنوی حەوت ساڵی تەواوی پێویست بوو تا قۆناغی یەکەمی سەفەرەکەی بەناو فەرەنسادا تەواو کرد، کەچی قۆناغی دووەمی بە کەمتر لە حەوت رۆژ بڕی. چیتر لە جادە جەنجاڵ و شارە قەرەباڵغەکان دوور نەدەکەوتەوەو لاڕێ و رێگا دوورەکانی نەدەگرتە بەر. ئیتر ئەو (بۆن)ێکی هەبوو، پارەی هەبوو، باوەڕی بە خۆی هەبوو، پەلەشی بوو.

هەر ئێوارەی ئەو رۆژەی کە شاری مۆنتپلییێری بەجێهێشت، گەیشتە شارۆچکەی "لو گراو دوروا"، کە شارۆچکەیەکی سەر بەندەر بوو لە باشووری رۆژئاوای ئایگویز-مۆرتێس، لەوێ سواری پشتی کەشتییێکی بارهەڵگر بوو بەرەو شاری مارسێی. لە مارسێش بەندەرەکەی بەجێنەهێشت، بەڵکوو یەکسەر کەشتییێکی تری دۆزییەوە، کە بە درێژایی کەناری دەریادا بەرەو رۆژهەڵاتی برد. دوو رۆژ دواتر گەیشتە تولۆن، سێ رۆژ دواتر گەیشتە شاری کان. ئیتر ماوەی رێگاکەی بەپیادەیی بڕی. بە رێگاییێک کە بە ناو دەشتەکاندا بەرەو باکوور دەچوو، بەسەر گردۆڵکەکاندا هەڵگەڕا.

دوای دوو دەمژمێران گەیشتە هەورازی گردۆڵکەکان، لەوێوە بە درێژایی چەندین میل دۆڵێکی دوور و درێژ دەستی پێدەکرد، دۆڵێکی زەبەلاحی دەشتاوی، هەر چوار دەوری بە زنجیرە شاخی سەخت و گردو زورگان گیرا بوو، وردە وردە بەرەو بەرزایی دەچوون و دامێن و چاڵاییەکانییان بە کێڵگەی تازە چێندراو و باخچەو داری زەیتوون رووپۆش کرابوون. ئاو و هەواییێکی یەگجار سازگار و تایبەت ئەو دۆڵەی داپۆشیبوو. هەرچەندە دەریا زۆر نزیک بوو، تەنانەت لەسەر ترۆپکی گردۆڵکەکانیشەوە دەتوانرا ببینرێت، کەچی لەم دۆڵەدا هیچ نیشانەییێکی دەریایی، خوێاوی، زیخاوی، هیچ شتێکی ئاوەڵا، نەدەدیترا، بەڵکوو ئارامییێکی کپ و دابڕاو و شاراوە، بە تەواوی ئاوها، دەتگوت ئەو هەرێمە چەندین رۆژەرێ لە دەریاوە دوورە. هەرچەندە لە لای باکوورەوە بە رێزە شاخێکی بەرز دەورەگیرا

بوو، کە هێشتان بەفریان بەسەرەوە مابووەوەو بۆ ماوەیەکی درێژتریش ئەو بەفرە هەر دەمایەوە، کەچی لێرە هەستت بە هیچ شتێکی سارد و سڕ و دژ نەدەکرد، هیچ باییێکی ساردیش نەدەهات. زۆر زووتر بەر لە مۆنتپلییێر، بەهار گەیشتبووە ئێرە. هاڵاو و تەمێکی سووک و تەنک، وەک زەنگوڵەیەکی شووشە بەسەر کێڵگەکانەوە وەستا بوو. دارقەیسی و داربادامەکان گەشابوونەوە، هەواییێکی گەرم بۆنی نەرگزەجاڕی بەم ناوەدا پەرت و بڵاو دەکردەوە.

لە کۆتایی ئەو دیوی دۆڵەکەدا، نزیکەی دوو میل دوورتر، شارێک کەوتبووە، یان باشترە بڵێین، شارێک بە دامێنی شاخەکان وەنووسابوو. لە دوورەوە کە سەیرت دەکرد، لەوە نەدەچوو کە شارێکی بە زریق و باق و سەرنجراکێش بێت. جگە لە کەڵووێکی کوڵی کڵێسایێک نەبێت، چ کاتێدراڵێکی مەزنی تێدا نەدەدیترا کە لە خانووەکان بەرزتر خۆ بنوێنێت، چ قەڵاییێکی تێدا نەدەدیترا خۆی یەکانە بنوێنێت، چ کۆشکێکی شەنگ و رازاوە سەرنجی رانەدەکێشا. دیوارەکان سارد و سڕ و خەمین دیار بوون، لێرەو لەوێ چەقەی دووکەڵ لە دووکەڵکێشی ماڵەکانەوە بەسەر شاخەکەدا پەرت دەبوون و دادەچڕژانە ناو دەشتاییەکانی ژێرەوە، ئەو دیمەنە نەرم و نیانەیان پچڕپچڕتر دەکرد.  دەتگوت ئەو شوێنە زۆرجاران داگیر و وێران کراوە، ماندوو بووەو، ئیتر چیتر بە جیددی بەرامبەر هیچ هێرشێکی تر، حەوسەڵەی بەرگریکردنی نەماوە. بەڵام نەک لەبەر لاوازی، بەڵکوو بە هۆی وەڕسی، یان  لە بێ باکی و هەستکردن بە بەهێزیی. وا دەهاتە بەرچاو، کە ئەو جێگایە ئاتاجی زریق و باق و جوانیی نەبوو. دۆڵێکی پڕ بۆن و بەرامەی لە دامێنی خۆیدا هەڵگرتبوو، دیار بوو کە ئەوەندە بۆ ئەو بەس بوو.

ئەو شوێنە کە ئەوەندە نادیار و ئەوەندەش باوەڕبەخۆ بوو، ئەوە شاری گراس بوو، ئەو شارەی کە بێ ئەملاوئەولا چەندین دەیە بوو، ببوو بە مەڵبەندی بەرهەمهێنان و بازرگانی بۆن و کەرەسەی عەتریی و سابوون و زەیت. جۆزێف بالدین هەمیشە کە ناوی ئەم شارەی دەهێنا دەگەشایەوەو موچڕکی دەهاتێ. دەیگوت ئەو شارە (رۆم)ی بۆنەکانە، سەرزەمینی عەترسازانە، عەترستانە، ئەوەی ئەزموونی ئەوێی نەبێت و نیشانی ئەوێی وەرنەگرتبێت، ڕەوایی نیەو شیاوی ئەوە نیە کە نازناوی عەترساز لەخۆی بنێت.

گرێنوی بە چاوێکی زۆر واگا تەماشای شاری گراسی دەکرد. ئەو لە وڵاتی عەترستان و عەترسازان نەدەگەڕا، دڵیشی نەدەکەوتە خورپە بە دیتنی ئەو هێلانەیە، کە لەو بەرەوە بە دامێنی کێوەکان وەنووسا بوو. ئەو هاتبووە ئێرە، چونکە دەیزانی،  لە هەموو شوێنێک باشتر، لێرە دەتوانێت فێری تەکنیکاری بۆنهەڵهێنجان و بۆنگرتنەوە ببێت. ئەو دەیەویست بۆخۆی فێری ئەو

تەکنیکە ببێت، چونکە پێویستی بەمە هەبوو، تا بگاتە ئامانجەکانی. شووشە بۆنەکەی خۆی لە گیرفان دەرهێنا، زۆر بە کابانی هەندێکی لەخۆی داو کەوتە رێگا. دوای سەعات و نیوێک، بەرە بەری نیوەڕۆ گەیشتە شاری گراس.

لە قەراغی سەرەوەی شار، لە مێوانخانەیەک لە مەیدانی ئۆئایرس نانی خوارد. رووبارێک ئەو مەیدانەی بە درێژی کردبووە دوو لەت، دەباغچییەکان لەو رووبارەدا پێستەکانی خۆیان دەشووشت، تا پاشتر بۆ وشکبوونەوە لەبەر خۆر هەڵیانبخەن. بۆنێکی ئەوەندە ناخۆش و خنکیان لێ دەهات، کە چەشەی خواردنیان لە هەندێک لە مێوانەکان تێکدەدا. بەڵام هیچ کارێکی لە گرێنوی نەدەکرد، ئەو لەمێژ بوو لەو بۆنە ڕاهاتبوو، تەنانەت ئەو بەو بۆنە هەستی بە دڵنیایی دەکرد. ئەو بچووبایە هەر شارێک، یەکەم جار لەگەڕەکی دەباغچییان دەگەڕا. کاتێکیش دەهاتە ناو ئاووهەوای بۆگەنی دەباغخانەکان و لەوێوە بەرەو گەڕەکەکانی تری شوێنەکە دەچوو، ئیتر دەتگوت لەو شوێنە چیتر نامۆ نیە.

تەواوی دوای نیوەڕۆ بەناو شارەکەدا سووڕایەوە. هەتا بڵێی شارێکی چڵکن و پیسوپلۆخ بوو، بە تایبەت بە هۆی ئەو هەموو ئاوە زۆرەی، کە لە چەندین کانیاو و چاڵاو هەڵدەقوڵان و بەناو جۆگاو و زێرابی نارێک نارێک دەرژانە ناو شار و بەناو کووچەکاندا پەرت دەبوون و دار و بەردیان دەکردە قوڕ و زێلاق. لە هەندێک لە گەڕەکەکان کۆڵانەکان ئەوەندە تەنگەبەر بوون، هەر بە قەد باسکێک ماوە بۆ پەیژۆکەو رۆیشتنی رێبواران مابووەوە، کاتێک رێبواران بە خۆو بە جلوبەرگی قوڕاویان لەیەکتری تێدەپەڕین، ناچار دەبوون خۆ لەیەکتری بخشێنن. تەنانەت لە مەیدانەکان و جادە کەمێک بەرینەکان، گالسکەو پەیتووکە بە دژواری لە یەکتری رەت دەبوون.

کەچی لەگەڵ ئەو هەمووو پیسییە، لەگەڵ ئەو هەمو تەسکی و تەنگەبەرییە، شارەکە لە گەرمەی بازاڕو بازرگانیدا بوو. لە یەک پیاسەدا ئەو خانە سابوونکەرانەی کە کەوتنە بەرچاوی گرێنوی، ژمارەیان لە حەوت کەمتر نەبوون، دە دوازدە عەترساز و فرۆشگای دەستکێشدروو، بێ ژمار دەزگای بچووکی هەڵماندن و ساڵۆنی ئارایشت و فرۆشگای بەهارات و لە دواییشدا نزیکەی حەوت فرۆشگای تری زەبەلاحی بۆن و گوڵاوی ژمارد.

ئەوانە هەمووو بازرگان بوون، خاوەنی کۆگای گەورە گەورەی عەتر و مادده بۆنخۆشەکان بوون. کەچی لە شێوەی ماڵەکانیان زۆر بە دژواری هەست بەمە دەکرا. رووی ماڵەکانیان بە دیوی جادەوە، زۆر مرکی و خاکی خۆیان دەنواند. بەڵام پشتی ئەو دیوارانە هەمووی کۆگاو سەردابی زەبەلاح بوون، پڕ بوون لە تەنەکەو بەرمیلی زەیت و رۆن، پڕبوون لە سابوونی بۆنداری سافی لەسەر یەک کەڵەکەبوو، پڕبوون لە کوپە گوڵاو، کوپە شەراب، کوپە ئەلکهول، پڕبوون لە بەستەی

پێستی بۆندار. پڕ بوون لە گونیەو گەنجینەو سندووق، پڕ پڕ بوون لە بەهارات... گرێنوی ئەمانەی یەک یەک لە پشتی ئەو دیوارە ئەستوورانە بۆن کرد. ئەوانە سامانهایێکی وا بوون، کە هیچ ئەمیرێک نەبۆتە خاوەنی ئەو تەرزە سامانە. خۆ ئەگەر بهاتبایە تیژتر بۆنی هەڵبمژتابایەو، نیگای بۆنی بگەیەندابایە ئەو دیوی عەمبار و فرۆشگاکان، ئەوا ژوورە لوکسۆس و زەنگینەکانیشی دەدیت، کە کەوتبوونە بنەبانی ئەو خانووە مرکی و خاکییانە. هەموو خاوەنی باخچەی بچووک بچووک بوون، بەڵام باخچەی شەنگ و نەشمیل، دەوریان بە ژالەو دارخورمای گەش گەش ڕازابووەوە، لە ناویاندا نافوورەئاوی بە گوڵ و گوڵزار دەورگیراو هەڵدەقوڵان. ئەو باخچانە کە بە کەوانەیی روویان لە باشوور کردبوو، باڵێکی خانووەکانیان پێکدەهێنا: ژووری خەو لە نهۆمی سەرەوە، کە هەموو بە کاغەزدیواری ئاوریشمی داپۆشرابوون، یەک بە قووڵایی خۆیان تیشکی هەتاویان دەڕژایە ناو، لە نهۆمی زەمینی سالۆنێکی گەورەی دانیشتن و ژووری نانخواردن، کە بە قەنەفەو کورسی و مێزی نانخواردن، لە داری نایاب، رازابوونەوە، هەندێکییان رووبان کەوتبووە سەر پێشخانێک بەرەو هەوای ئازاد، کە هەر بەڕاستی، وەک بالدین باسی لێوە دەکرد، بەچەنگاڵ و کەوچکی زێڕین و لە چینییە قاپی فەخفووری نانیان دەخوارد. ئەو ئاغایانەی کە لە پشتەوەی ئەو خانووە ساکارانە دەژیان، بۆنی زێڕ و بۆنی دەسەڵاتیان لێ دەهات، بۆنی سامانێکی دەوڵەمەند، لە هەمووشی پتر بۆنی ئەو شتەیان لێ دەهات، کە تا ئێستا گرێنوی لە گەشتەکەیدا بە ناو ئەو هەرێمەدا عەودالّی بوو.

گرێنوی ماوەیەکی درێژ لە بەردەم کۆشکێکی نابەرچاو و وەشاردوو وەستا. ئەم خانووە کەوتبووە سەری جادەی دروات، کە جادەیەکی سەرەکی بوو، بە درێژایی شارەکە لەو سەر تا ئەو سەر، بەناو شارەکەدا بەرەو رۆژهەڵات دەچوو. خانووێکی نائاسایی نەبوو، ئەوە نەبێت کەمێک لەوانەی تر بەربەرینتر و رووەکەشی هەندێک لە خانووەکانی هاوسێی باربووتر بوو، بەڵام بە هیچ جۆرێک لەوانەی دی بە زریق و باقتر نەبوو. لەبەر دەم دەروازەکەی عارەبانەیەکی پڕ لە بوشکە وەستا بوو، بوشکەکانیان لە ماشێنێک باردەکرد. سەیارەیەکی تریش چاوەڕوانی دەکرد. پیاوێک کە هەندێک نامەو کاغەزی لەدەستدا بوو چووە ناو فرۆشگاکە، لەگەڵ پیاوێکی تر هاتە دەرەوە، هەردووکیان لەناو دەروازەکە بزر بوون. گرێنوی لەم بەری جادەکە، بەرامبەر دەروازەکە وەستا بوو، تەمەشای ماجەراکەی دەکرد، لای ئەو گرنگ نەبوو، کە ئەوان چی دەکەن، لەگەڵ ئەوەش تەماشای دەکردن. شتهایێک ئەوی توند راگرتبوو.چاوەکانی خۆی قوچاند و بە چڕی بیری لە بۆنەکان کردەوە، لەو بۆنانەی کە لەم خانووەوە دەهاتنە دەرەوەو بەو ناوەدا پەرت دەبوون. ئەمانە بۆنی کوپەو تەنەکەو بەرمیلەکان بوون، بۆنی سرکەو شەراب، هەروەهاش چەند سەت بۆنێکی خەست و

توندی ناو عەمبارەکە، ئەوجا بۆنی سەروەت و سامان، کە لە دیوارەکاندا دەهاتنە دەرەوە، وەک بۆنی ئارەقەی زێڕین، ئەوجا بۆنەکانی باخچەیەک، کە دەبێت کەوتبێتە ئەو بەری بنەبانی خانووەکە. شتێکی ئاسان نەبوو، هەست بە بۆنە ناسکەکانی باخچەکە بکەیت، چونکە بە تاڵەبۆنی تەنک تەنک لە دیواری دەرەوەی خانووەکە ئاودیو دەبوون بە جادەکەدا پەرت دەبوون. گرێنوی بۆنی گوڵە ماگنۆلیاو گوڵە هاس و گوڵە دەفنەو دارگوڵی رۆدۆدندرۆنی لێکتر جودا دەکردەوە... بەڵام بۆنێکی تری جوداش دەهات، بۆنێکی خۆشی دڵڕفێن، کوژەر، ئەو بۆنە کە لەو باخچەوە دەهات، بۆنێکی زۆر تایبەت بوو، بۆنێکی وابوو، کە گرێنوی چ جاران لە ژیانی خۆیدا بۆنی وای نەکردبوو، تەنها جارێک نەبێت و بەس. دەبووایە خۆی لەو بۆنە نزیک بکاتەوە.

گرێنوی بیری کردەوە، کە یەکسەر لە دەروازەکەوە بچێتە ناو ماڵەکە، بەڵام خەڵکێکی زۆر لەوێ خەریکی گواستنەوەو چاودێریکردنی بەرمیلەکان بوون، گومان لەوەدا نەبوو، کە دەیانبینی. بڕیاری دا بە جادەکەدا بگەڕێتەوە دواوە، بۆ ئەوەی کووچەیەک یان ڕێگاییێکی وا بدۆزێتەوە، کە بە تەنیشت ماڵەکاندا ڕەت ببێت. دوای کەمێک گەیشتە دەروازەی شار کە کەوتبووە سەری جادەی دروات. چووە ناو دەروازەکە، دەستی چەپی گرت و بە تەنیشت شوورەی شارەکەدا بە لێژاییەکەدا چووە خوارەوە. هێندە دوورنەکەوتبووەوە، کە دیسان بە ئاستەم بۆنی باخچەکەی بۆ هات، هێشتان بۆنەکە لەگەڵ هەوای کێڵگەکانی دەوروبەری تێکەڵ بوو. بۆنەکە هێدی هێدی بەهێزتر دەبوو، تا گەیشتە شوێنێک، زانی کە زۆر لە باخچەکە نزیک بووەتەوە. باخچەکە کەوتبووە سەر شوورەی شار. ئەو راستەوخۆ لە تەنیشت باخچەکەدا وەستا بوو. ئەگەر کەمێک بگەڕابایە دواوە، ئەوا دەیتوانی لقەکانی سەرەوەی دار پرتەقاڵەکە، لەسەرووی دیوارەکەوە ببینێت.

دیسان چاوەکانی خۆی نوقاند. بۆنەکانی باخچەکە بەسەری دادەبارینە خوارەوە، زۆر بەڕۆشنی چەپکە بۆنەکانی وەک رەنگی پەلکەزێڕینە لێکتر جودا دەکردەوە، بۆنە گرانبەهاکەش، ئەوەی ئەو بەدوایدا هاتبوو، لەناو ئەو چەپکە بۆنەدا بوو. گرێنوی لە تاوان گەرم و لە ترسان سارد هەڵگەڕا. خوێن بە تەوژم بۆ سەری فڕکەی کردو گەڕایەوە ناوەندی جەستەی، دیسان و دیسان خوێنی بەرز بووەوەو دابەزیە خوارەوە، نەیتوانی شتێک دژی ئەمە بکات. ئەو هورووژمە بۆنە زۆر لە ناکاو بوو. هەناسەوەرگرتنێکی، چاوتروکانێکی لا ببوو بە کاتێکی هەتاهەتایی، وەک ئەوەی کات دووکەڕەت بووبێتەوە، یان بە توندی رەت ببێت، چونکە ئیتر نەیدەزانی ئێستا ئێستایەو ئێرە ئێرەیە، یان ئێستا ئەوان سەردەمانە، ئێرەش ئەوێندەرە، واتە شەقامی ماری، مانگی ئەیلوولی ١٧٥٣: ئەو بۆنە کە لەباخچەکەوە بەرەو دەرەوە هەڵی دەکرد، ئەوە هەمان بۆنی کچە قژ سوورەکە بوو، ئەوەی

کاتی خۆی بە دەستی خۆی کوشتبووی. ئیستاش کە ئەو بۆنەی دیسان لەو سەرزەمینە دۆزیبووەوە، لە خۆشییان فرمێسکی بە چاوەکاندا دەهاتە خوارەوە، بەڵام چونکە نەدەکرا ئەمە راستی بێت، بۆیە لەترسان زارەترەک ببوو.

هەستی بە گێژبوون کرد، کەمێک سەری سووڕاو بەلاداهات، خۆی بە دیوارەکە گرتەوەو بە هێواشی بە دیوارەکە خزایە خوارەوە تا کەوتە سەر چیچکان. خۆی هەندێک کۆکردەوەو بیری خۆی رام کرد، دەستی پێکرد بە هەناسەی کورت کورت و کەم مەترسیتر بۆنەکە هەڵبمژێت. بۆی دەرکەوت، کە راستە ئەو بۆنەی پشتی دیوارەکە، یەگجار زۆر بە بۆنی کچە قژسوورەکە دەچێت، بەڵام کتومت وەکو ئەو نیە. بێ گومان ئەو بۆنەش بۆنی کیژێکی قژ سوورە، هیچ گومانی لەوەدا نەبوو. گرێنوی بە ئەندێشە بۆنییەکانی خۆی ئەو کیژەی دەدیت، وەک ئەوەی وێنەکەی لەبەرچاودا بێت: "کچەکە بە ئارامی دانەنیشتووە، بەڵکوو لەوێ بۆ ئەوێ دەخولێتەوەو باز دەدات، جەستەی گەرم دادێت و فێنک دەبێتەوە، هەبێ و نەبێت، دەبێت خەریکی جۆرە گەمەیەک بێت، گەمەیەکی وا کە پێویستی بە جووڵەی خێرا خێرا هەیەو پاشانیش وەستان بە ئارامی، دەبێت کەسێکی تریشی لەگەڵدا بێت، ئەو کەسە بۆنەکەی زۆر بە رۆشنی دیارە. کچەکە پێستی زۆر گەش و سپییە، چاوەکانی شینن، دەموچاو و گەردەن و سەر سینەی زیوانین..." گرێنوی ماوەیەک هەناسەی خۆی ڕاگرت، ئەوجا بە خێرایی و بە هێز بۆنەکانی هەڵمژی، هەوڵی ئەوەی دەدا، بیرەوەری بۆنی کچە قژسوورەکەی شەقامی ماری لەبیر خۆی بباتەوە... واتە، ئەو کچە کە هەر بەڕاستی، پڕ بە مانای وشە، هێشتان مەمکی نەقنجابوو، مەمکی دەستی بە گۆکردن نەکردبوو. بێ سنوور بۆنەکەی ناسک و بێ هێز بوو. لەوانەیە چەند رۆژێک بێت ئەو خاڵانە پێستەیان داگرتبێتەوە، یان لەوانەیە بەر لە چەند سەعاتێک... لە راستیشدا لەو چاوتروکانەوە، کڵاوەی مەمکۆڵەکانی دەستییان کردووە بە هەڵکشان. بە کورتی بیڵێین: ئەو کچە هێشتان منداڵە، بەڵام چ منداڵێک!

گرێنوی هەنیەی ئارەقەی کردبوو. ئەو دەیزانی کە منداڵان بۆنێکی ئەوتۆیان نیە، وەک خونچەی نەپشکووتوون. بەڵام ئەمەیان، ئەو گوڵە نزیکە هیشتان داخراوەی پشتی ئەو دیوارە، کە جگە لەم، لە گرێنوی، هێشتان کەسی تر تێبینی ئەوەی نەکردووە، کەوا خەریکە دمکە سەرەتاییە بۆندارەکانی خۆی پێشان دەدا، هەر لە ئێستاوە تاڵەمووی بۆنی خودایی خۆی پەخش دەکات و، ئەو کاتەش کە بەتەواوی بە هەموو جوانی خۆی پێ گەییشت، ئەوسا عەترێک دەپرژێنێت، کە تا ئێستا جیهان عەتری ئاوای بۆن نەکردووە. گرێنوی بیری کردەوە، هەر ئێستاکێ بۆنەکەی خۆشترە لە بۆنەکەی ئەوسای کچەکەی شەقامی ماری، ئەوەندە توند نیە، ئەوەندە چڕ نیە، ئەوندە قەبە

نیە، بەڵام پاراوتر، دەوڵەمەندتر، ئاوێتەتر، لە هەمان کات سروشتی تر. ساڵێک تا دوو ساڵی تر بۆنەکەی پێ دەگات، گەشە دەکات، ئیتر هیچ مرۆڤێک، نە پیاو و نە ژن، ناتوانێت دەستبەرداری ئەو بۆنە ببێت. خەڵک بەرامبەری بێ دەسەڵات دەبن، چەک دەبن، بەرامبەر سیحری ئەو کچە ملکەچ و دەستەوسان دەبن، بێ ئەوەی بزانن بۆچی وایان بەسەر دێت. جا چونکە ئەو خەڵکە گێلن و لووتیان تەنها بۆ چڵم و هەڵمشین بەکاردێنن، باوەڕیان وایە، کە دەتوانن هەموو شتێک هەر بە چاوەکانیان بناسنەوە، دەڵێن، بۆیە وایان لێ دێت، چونکە ئەو کچە جوان و شەنگ و نەشمیلە. دێن و بە هۆی کەمزانینی خۆیان، بە لەش و لار و بەژن و باڵای ڕێک و مەمکی قنجی دا هەڵدەڵێن. لە ڕوانگەی چاوەکانیان دەڵێن: ئەو کچە دەڵێی ئەلماسە، ددانی دەڵێی مرواریە، ئەندامی لەشی ئەوەندە لووسە، دەڵێی مینایە، ئیتر لەو بابەتە گەلۆرە بەراوردکاریانەو هی تریش. ئیتر وەک شاجوانی ژنان هەڵیدەبژێرن و، نیگارکێشە شەحتۆکانیش وێنەی دەکێشن و، تەماشای وێنەکانی دەکەن و دەڵێن، ئەوە شاجوانی فەرەنسایە. لاوەکان بە خۆو بە عودەکانیان لەبەر دەم پەنجەرەکەی دەوەستن و دوور و درێژ بۆی دەنووزێنەوە... پیاوە قەڵەو و دەوڵەمەندەکان سوژدە بۆ باوکی دەبەن و بە پاڕانەوە داخوازی دەستی کچەکەی لێ دەکەن... ژنان، گەنج و پیر، کە چاویان پێ دەکەوێ، هەناسەی سەرد هەڵدەمژن و لە خەودا خەون بەوە دەبینن، خۆزگەی ئەوە دەخوازن کە ئەگەر تەنها بۆ تاکە ڕۆژێکیش بێت، وەک ئەو دڵڕفێن و دڵبەر بکەونە بەرچاوان. هەمووشیان ئەوە نازانن، کە ئەوە سیمای نیە، ئەوانی وا شەیدا کردووە، ئەوە شەنگی و جوانیەکەی نیە، بەڵکوو ئەوە بۆنە خۆش و نایاب و بێ نموونەکەیەتی! تەنها ئەو، گرێنوی، ئەو ڕاستییە دەزانێت، بەڵێ ئەو هەر لە ئێستاوە ئەمەی دەزانی.

ئاخ! ئەو دەیویست ببێت بە خاوەنی ئەو بۆنە! بەڵام نەک بە شێوەیەکی بێ سوود و بە هەدەرچوو، بە شێوەکی ناشی و نەزانانە، وەک ئەوسا، وەک بۆنی کچەکەی سەر شەقامی ماری، ئەو بۆنەی کە تەنها هەڵی لووشیە ناوخۆی و بەمەش تێکوپێکی دا. نەخێر! ئەو دەیویست هەر بەڕاستی ببێتە خاوەنی بۆنی پشتی دیوارەکەو بیکاتە بۆنی خۆی، وەک پێستێک لەبەر کچەکەی دامالێت و لەبەر خۆی بکات. ئەوە چۆن دەکرێت، گرێنوی ئەوەی هێشتان نەدەزانی. بەڵام دوو ساڵ ماوەی لەبەردەمدا هەبوو، بۆ ئەوەی ئەمە فێرببێت. لە ڕاستیشدا ئەمە سەختتر نەبوو، لە داپچڕینی بۆنی گوڵێکی کەم ژمارەو نایاب.

هەستایەوە سەر پێ. زۆر بە ئاگایی، وەک ئەوەی شتێکی پیرۆز، یان کچێکی خەوتوو جێبهێڵێت، لەوێ دوورکەوتەوە، بە ئەسپایی، بە هێمنی، بە شێوەیەک کەس نەیبینێت، کەس گوێی

له خشپەی نەبێت، کەس سەرنجی نەکەوێتە سەر دۆستە پڕ بەهاکەی. بەو جۆرە بە درێژای دیوارەکە ڕای کرد، تا ئەو سەری کۆتایی شارەکە، تا ئەو شوێنەی کە ئیتر عەتری کچەکەی نەدەگەیشتێ، ئیتر لە دەروازەی فێنێئانت دیسان هاتە ژوورەوە. لە بەر سێبەری خانووەکان وەستا. بۆگەنی هاڵاوی کووچەکان دەبوون بە هۆی دڵنیایی بۆ ئەو، ئەو ئازارانەی کە تووشی ببوو، بەو بۆنانە دەڕەوینەوە. دوای چارەگە سەعاتێک بە تەواوی هێور بووەوە. لە سەرەتا بیری لەمە کردەوە، کە چیتر لە نزیکی باخچەکەوە، بە پشتی دیوارەکەدا نەچێت. پێویست بەمە نەبوو. ئەمە تووشی شڵەژان و هەڵچوونێکی زۆری دەکرد. گوڵەکە لەوێ دەگەشایەوە، گەورە دەبوو، بێ ئەوەی ئەو کارێکی بۆ بکات، گوڵەکە بە چ شێوەیەک گەشەدەکات و گەورە دەبێت، گرێنوی ئەوەی دەزانی. نابێت لە وەختێکی نارێک و نەگونجاودا خۆی لە بۆنەکەی بدات. پێویست بوو ئیتر دەست بەکاربێ، زانیارییەکانی پەرە پێ بدات، تواناو بەهرەی پیشەکەی تەواو بکات، تا بۆ کاتی بەرچنین چەکدار بێت. ئەو هێشتان دوو ساڵ کاتی لەبەردەمدا مابوو.

## ٣٦

له نزیک دەروازەی فێنێئانت، لەسەر شەقامی لووڤ، گرێنوی کارگەیەکی عەترسازیی دۆزیەوەو، پرسیاری لێ کردن کە ئایا دەتوانێت کاریان لە لا بکات.

دەرکەوت کە خاوەنەکەی، هۆنۆر ئارنولف، وەستای عەترسازیی، لە زستانی رابردوو کۆچی دوایی کردبوو، بێوەژنەکەی، ئافرەتێکی چالاکی قژ ڕەش، کە تەمەنی دەوروبەری سی ساڵێک دەبوو، بە یارمەتی شاگردێک کارگەکەی بەڕێوە دەبرد.

دوای ئەوەی مادام ئارنولف بە درێژی گازندەو گلەیی خۆی لە خراپیی ئەو سەردەم و کزیی بارودۆخی ئابووری کرد، گوتی: لە راستیدا لەگەڵ ئەوەی ئەو توانای ئەوەی نیە کە شاگردێکی تر بەخێوبکات، بەڵام لەلاییێکی تر بە هۆی ئەو هەموو کارانەی کە لەسەری کەڵەکە بووینە، زۆر پێویستی بە کەسێک هەیە کۆمەکی بکات. هەرچەندە ئەو ناتوانێت شاگردێکی تر لەماڵەکەی خۆیدا بخەوێنێت، بەڵام لە باخی زەیتوونەکەیدا، لە پشتی دێری فرانسیزکا، کۆختێکی بچووکی هەیە، کە دە خوولەک لێرەوە دوور دەبێت و نابێت، لاوێکی قانیع و بێ تەماع لە کاتی پێویستیدا دەتوانێت شەوی تێدا بەسەرببات، هەرچەندە ئەو وەک وەستاژنێکی ئابرووмەند خۆی بە بەرپرسیار دەزانێت  لە تەندروستی و ئاسوودەیی شاگردەکانی، بەڵام لە لاییێکی تر توانای ئەوەی نیە هەموو رۆژێک دوو ژەمە خواردنی گەرم دابین بکات. بە کورتیەکەی: مادام ئارنولف ژنێکی تەندروست و تێگەیشتوو بوو، ئاوەزێکی چاکی لە بازرگانییدا هەبوو، بێگومان گرێنوی بۆنی ئەمەی کردبوو. جا چونکە ئەویش مەبەستی پارەوەرگرتن نەبوو، هەموو مەرجەکانی لێ قەبووڵ کردو بەوە رازی بوو، کە هەفتەی بە دوو فرەنک کاری لا بکات. بەم جۆرە بە خێرایی گەیشتنە رێککەوتن. شاگردی یەکەم بانگ کرا، پیاوێکی قەبەی چوارشانە، ناوی درۆت بوو. هەر کە گرێنوی چاوی پێ کەوت زانی، ئەو پیاوە راهاتووە لەوەی کە لەگەڵ خانم لەسەر یەک جێدا بخەوێت، خانمیش لە هەندێ مەسەلەدا بێ ڕاوێژی ئەو بڕیاران نادات. درۆت هاتە بەردەم گرێنوی وەستا، گرێنوی لە چاو ئەو فەلامەرزە پێ پانە زۆر بوودەڵەو ورد و عەنتیکە دەهاتە بەرچاو. هەورەبۆنێک لە بۆنی سپێرمی ئادەمیزاد ئەو ناوەی گرتەوە، رووی لە گرێنوی کردو بە زەقی چاوەکانی لە چاوی گرێنوی بڕی،

وەک ئەوەی بەو شێوەیە بیەوێت، هەندێ مەتەل و مەبەستی نادیار و بێ دەنگ هەڵبدات، یان بە گاییێکی هاوجووتی خۆی ئاشنا بێت، تا لە کۆتاییدا هێدی هێدی زەردەخەنەیەکی تەڵخ لە دەموچاوی ڕەویەوەو، بە راوەشاندنی سەری رەزامەندی خۆی پێشاندا.

ئیتر هەموو شتەکان رێسای خۆیان وەرگرت. تۆقەکردنێک لەگەڵ گرێنوی، نانێکی سارد بۆ ژەمی ئێوارەی، لێفەشرێک و کلیلێکیش بۆ کۆختەکە. کۆختەکە ژوورێکی بێ پەنجەرە بوو، بۆنێکی خۆشی کاو کۆنە قشپلی مەڕانی لێ دەهات، ئەوەندەی کرا، جێگەکەی خۆی تێدا دامەزراند. بۆ رۆژی دوایی دەستی کرد بە کارکردن لەلای مادام ئارنولف.

کاتەکەی کاتی نێرگزەجاڕ بوو. مادام ئارنولف رایدەسپارد کە لە مێرگە باخچە بچووکەکانی خۆیەوە گوڵەکانی بۆ بهێنن، ئەو باخچانە کەوتبوونە دۆڵە گەورەکەی خوارشار، یاخود گوڵەکانی لە جوتیارەکان دەکڕی، بۆ کەمێک گوڵ بێنەبەرەو سەودایێکی سەختی لەگەڵ ئەم جوتیارانە دەکرد. سبەینان زوو سەبەتە سەبەتە گوڵەکان دەهێنرانە ناو کارگەکەو ڕوودەکرانە سەریەکتری، هەزاران گوڵ، گوڵی قەبە قەبە، بەڵام بۆن ناسک. درۆت لە قازانێکی گەورەدا بەزی مانگاو بەرازانی دەتواندەوە، تا دەبوون بە رۆنێکی کرێمی، کاتێک گرێنوی ئەو بەزە تواوەی بێ وچان بە خاکەناسێکی دەسک درێژ تێکوەردەدا، سەتڵ سەتڵ درۆت گوڵە تازەکانی رووەکردە ناو رۆنەکە. وەک چاوێک کە لە ترسی مەرگ زەندەقی چوو بێت، تاوێکی کەم دەکەوتنە سەر ڕووی تواوەکەو پاشان سیس هەڵدەگەڕان، بە خاکەناز تێکی وەردەدان و چەورییە گەرمەکەش وەک گێژەن بۆ ناوەخۆی هەڵی دەڵووشین. نزیکە لە هەمان چرکەساتدا بوو کە گوڵەکان سیس دەبوون و دەمردن. دیار بوو ئەو مەرگە لە ناکاوە وا بەسەریاندا زاڵ دەبوو، ئیتر هیچ دەرووێکیان لەبەردەمدا نەدەمایەوە، جگە لەوەی کە بە دوا ئاهو ناڵەی عەتراوییان بۆنەکانی خۆیان بە ناچاری بڕژێننە ناو ئەو شلەیەی کە دەیخنکاندن. بە خۆشیێکی بێ ئەندازە، گرێنوی ئەمەی دەدیت، دەیدیت کە هەر چەند گوڵەکان بەو تێکوەردانە پتر رۆدەچنە ژێرەوە، ئەوەندە بۆنی چەورییەکە بەهێزتر دەبێت. لە راستیشدا چیتر گوڵەمردووەکان نەبوون کە لە ناو چەورییەکەدا بۆنیان دەهات، نا، بەڵکوو چەورییەکە بۆنی گوڵەکانی کردبووە موڵکی خۆی و، خۆی بوو کە بۆنی گوڵی لێ دەهات.

چەورییە تواوەکە لەبەرڕا هەر پەیت دەبوو، پێویست بوو کە بە خێرایی و بە بێژنگی گەورە بیپاڵێون، تا لە لاشەی ژاکاو و هەڵمژراوی گوڵەکان پاکی بکەنەوەو بۆ گوڵی تازە ئامادەی بکەن. ئەوجا دیسان دەستییان دەکردەوە بە رووکردنی گوڵی تازەو تێکوەردان و پالاوتن، تەواوی رۆژەکە، بێ وچان، خەریکی ئەو کارە دەبوون، چونکە ئەو کارە داڵدەی هیچ جۆرە پشووێکی نەدەدا،

بەو جۆرە تەواوی گوڵەکان rووەدەکرانە ناو مەنجەڵی چەورایییەکە. بۆ ئەوەی هیچ بە خۆڕایی نەڕوات، پاشماوەی گوڵەکان دەخرانە ناو ئاوێکی کوڵاو و تێکوەردەدران، ئەوجا لە ژێر کوشەرێکی پێچدار تا دوا تنۆکی بۆنیان دەگوشران، ئەوەش هەر باش بوو، دەبوو بە ڕۆنێکی بۆن خۆش. بەڵام بەشە مەزنەکەی بۆنەکە، کە ڕۆحی دەریاییێک گوڵ بوو، لە ناو مەنجەڵەکە دەمایەوە، داپۆشراو و پارێزراو، لە ناو چەوریێکی نادیاری بۆری سپی، کە ئیتر هێدی هێدی دەمەیی.

بۆ ڕۆژی پاشتر، ئەو چەورییە مەیی و بەستووە دووبارە لە ناو مەنجەڵەکەدا گەرم دەکرایەوە، تا چەورییەکە دەتووایەوە، بە گوڵی تازە باربوو دەکرا. بەو جۆرە بە درێژایی چەندین ڕۆژان لە بەیانییەوە تا درەنگ کاری تێدا دەکرا. ئەمە کارێکی زۆر سەخت و دژوار بوو. گرێنوی کاتێک وەردەکەوتە ناو کۆختەکەی، بازووەکانی ڕەق ببوون، دەستەکانی ئاوسابوون، پشتی ژانی دەکرد. درۆت، کە سێ بە قەد ئەو بەهێز بوو، تەنانەت تاکە جارێکیش لە جیاتی گرێنوی مەنجەڵەکەی تێکوەرنەدەدا، ئەو تەنها گوڵەکانی ڕۆدەکردە ناو مەنجەڵەکە، کە وەک پەڕەمووچە سووک بوون، ئاگای لە ئاگرەکە دەبوو، جار بە جاریش گەرمییەکە تاوی بۆ دەهێناو دەچوو قومێکی دەخواردەوە. لەگەڵ ئەوەش گرێنوی دەنگی لێوە نەدەهات، بێ هیچ گلەیی و گازندەیەک گوڵەکانی لە ناو چەورییەکە تێکوەردەدا، لە بەیانییەوە تا ئێوارە، لە کاتی تێکوەرداندا بە دەگمەن هەستی بە ماندووبوون دەکرد، چونکە ئەو زۆر بە مەراقەوە دەیڕوانییە ئەو پرۆسەیە، کە لەبەر چاوی و لە پێش لووتی ڕووی دەدا: ژاکانی خێرای گوڵەکان و دەردانی بۆنەکانیان.

دوای ماوەیەک درۆت بڕیاری دەدا، کە ئیتر ڕۆنەکە گەیشتۆتە پلەی تێری و ناتوانێت چیتر بۆن هەڵبمژێت. ئاگرەکەیان دەکوژاندەوە، بۆ دوا جار ئەو شلە تیرەیان دەپاڵاوت و ڕوویان دەکردە ناو مەنجەڵی فوخاری ، لە ناو مەنجەڵەکەدا زوو دەمەیی و دەبوو بە کرێمێکی بۆندار.

ئیتر ئەوە کاتی هاتنی مادام ئارنولف بوو. مادام دەهات بۆ ئەوەی ئەو بەرهەمە بەهادارە ئەزمایش بکات و لە ڕووی چۆنایەتی و چەندایەتی لە دەفتەرەکانی خۆیدا یاداشتی بکات. دوای ئەوەی بۆخۆی بەدەستی خۆی سەری مەنجەڵەکەی دادەخست، مۆری لێ دەدا، هەڵیان دەگرت و دەیانبردە ناو قوڵایی ساردی ژێرزەمینی کارگەکە، خانم کراسە ڕەشەکەی لەبەر دەکرد و، پەچەی بێوەژنییەکەی دەپۆشی، ئەوجا سووڕێکی بەناو بازرگان و عەترسازەکانی شاردا لێ دەدا. بە قسەی کاریگەر و دڵتەزێن باسی باری تەنهایی خۆی بۆ خاوەنەکانیان دەکرد، دەیپرسی کە بەرهەمەکەی لێ دەکڕن یان نا، چەندی پێ دەدەن، نرخەکانی هەموو لەگەڵ یەکتری بەراورد دەکرد، ئاهێکی هەڵدەکێشا، ئەوجا لە کۆتاییدا دەیفرۆشت یان نەیدەفرۆشت. کرێمە عەتراویەکە بە فێنکی لە ژێر زەمیندا هەڵگیرابوو، ماوەیەکی درێژ

وەک خۆی دەمایەوەو تێکنەدەچوو. ئەگەر ئێستاش نرخەکان داشکابن و بە ئارەزووی ئەو نەبووبان، کێ نالێت لە زستان، یان لە سەرەتای بەهاردا هەڵنەدەستانەوەو بەرز نەدەبوونەوە. بیری لەوەش دەکردەوە، کە لە جیاتی ئەوەی بەرهەمەکەی بەو بەهاراتفرۆشە دەوڵەمەندانە بفرۆشێت، وا باشتر نیە کە لەگەڵ بەرهەمهێنە بچووکەکانی تر بە هاوبەشی بارێک کرێم بە کەشتی بنێرن بۆ گێنوا، یان بە کاروانێک بینێرن بۆ پێشانگای بازرگانی پایزە لە بوکێر، راستە کارێکی مەترسیدارە، بەڵام ئەگەر سەرکەوتوو بێت، ئەوا قازانجێکی یەگجار زۆرتری دێتەدەست. مادام ئارنولف زۆر بە پەرۆشییەوە ئەو رێگایانەی لەگەڵ یەکتری بەراورد دەکرد، هەندێک جار هەردووکی تێکەڵ دەکردن، واتە بەشێکی گەنجینەکانی دەفرۆشت و، بەشێکیشی هەڵدەگرت بۆ رێگایێکی تر و بەرپرسی مەترسییەکانی دەگرتە ئەستۆی خۆی. بەڵام ئەگەر لە روانگەی زانیارییەکانی هەستی بەوە کردبایە، کە بازاڕ پڕ بووە لە کرێمی بۆندار و بازاڕی کرێم شکاوەو وا زوو نرخەکەی هەڵناستێتەوە، ئەوا لەگەڵ لەرەلەری پەچەکەی بە خێرایی دەگەڕایەوە ماڵەوەو درۆتی رادەسپارد، کە هەموو کرێمەکان دابشۆرن دۆشاوی سافی گوڵاوی لێ ساز بکەن.

دیسان مەنجەڵی کرێمەکە لە ژێرزەمین دەهێنرایە دەرەوە، بە ئاگاییەوە لە مەنجەڵە سەرداخراوەکە گەرم دەکرا، گیانی بێ گەردی شەرابی تێ دەکرا، بە کەرەسەیەکی تێکوەردان، کە لە ناو مەنجەڵەکەدا دامەزرێنرابوو، زۆر چاک تێکوەردەدرا، ئەوە ئەرکی گرێنوی بوو. مەنجەڵەکەیان دەبردەوە ژێرزەمین، تێکەڵەکە لەوێ زوو سارد دەبووەوەو شلەی کحوولەکە لە کرێمە بەستووەکە جیادەبووەوە، رۆدەکرایە شووشەیەک. ئیتر وەک بڵێی ئەمە بریتی بوو لە عەترێک، بەڵام چ عەترێک، عەترێکی زۆر خەست، هەرچی کرێمەکەش بوو، زۆربەی زۆری بۆنەکەی خۆی لەدەستدابوو. بە جارێک بۆنی گوڵەکان بۆ ناوەندێکی تر گواسترابووەوە. بەڵام بەمە هێشتان کارەکە تەواو نەببوو. دۆشاوەکە بە کاغەزی پاڵاوتن، بە وردی دەپاڵێورا، ئەگەر گرێ و گۆڵ و خڵتی چەوری تێدا بمابایە، بەمە جیادەکرانەوە، پاشان درۆت ئەم کحوولە عەتراویەی رۆدەکردە ناو مەنجەڵی هەڵماندن، بە ئاگرێکی کز ئەو خەستاوەی دەدڵۆپاند. ئەوەی دوای هەڵماندنی کحوولەکە لە مەنجەڵەکە دەمایەوە، بریتی بوو لە شلەیەکی رەنگ تەڵخ، گرێنوی دەیزانی ئەمە چیە، پێشتر بەمە ئاشنابوو، بەڵام نە لەلای باڵدین و نە لە لای رونێل، بە چۆنایەتێکی ئاواو بە پاراوییێکی ئاوا بۆنی ئەم شتەی نەکردبوو: رۆنی سافی گوڵ، بۆنی رووتی گوڵ، ئەستێرکە چڕاوێکی هەزاران جار چڕتر لەوانەی ئەو دیبوونی. بۆنی ئەو عەترە چڕە بۆنێکی سووک نەبوو. نزیکە بۆنێکی توندی ئازوردە بوو، بۆنێکی تیژ و زوورێنەر. ئەگەر تنۆکێکی ئەو دۆشاوە لە لیتێرێک

کحوول بتوێنرابایەوە، تاکو چالاک بووبایەوە، بەس بوو، بۆ ئەوەی بۆنی تەواوی مێرگی گوڵستانێکی پێ زیندووکرابایەوە.

بەرهەمەکە بڕێکی یەگجار کەم بوو. تەنها بەشی ئەوەی دەکرد سێ شووشەی بچووکی پێ پڕ بکرێت. لە سەدان هەزاری گوڵەکان لەو سێ شووشە بۆنە بچووکە پتر، نەدەمایەوە. بەڵام نرخی ئەم سێ شووشە، هەر لێرە لە شاری گراس، سامانێکی زۆر بوو. ئەدی ئەگەر ڕەوانەی پاریس بکرابان چەندیان پتر دەکرد، یان بەرەو لیۆن، گرێنۆبل، گێنوا یان بەرەو مارسێی رەوان کرابان چەندییان دەکرد! مادام ئارنولف لە سەیری ئەو شووشە بچووکانە دیمەنێکی لێکتر تواوەی جوانی دەدیت، ئەو شووشەکانی بە چاو تام دەکرد، کە شووشەکانی هەڵگرت و سەرەکانی بە دەمەوانە شووشەی لووسکراو داخست، هەناسەی خۆی راگرت، بۆ ئەوەی هیچ لە ناواخنە پڕ بەهایەکەیان بە بای هەناسە نەهەڵمێن، یان لە کاتی داخستنیان بچووکترین ئەتۆمی ناویان دەرنەپەڕێتە دەرەوە، ئەوجا بە شەمێی شل دەوری دەمەوانەی شووشەکانی داپۆشت و پاشان دەمەوانەی شووشەکانی لە کیسەهەوای ماسی هەڵکێشا بە بەنێک لە ملی شووشەکان توند گرێی دان و خستنیە ناو سندووقێکی پڕ لۆکە، ئەوجا بردنیە ناو سەردابی پشتەوەی کۆشک و دەرگای سەردابەکەی خشت قوفڵ دا.

## ٣٧

لە مانگی نیساندا گوڵەترنج و گوڵە نارنجیان دەخوساند، لە مانگی گوڵاندا، دەریاییێک لە سۆرگوڵ، بۆنەکانیان وەک تەمێکی شیرینی کرێمیی نادیار، بۆ ماوەی مانگێک تەواوی شارەکەی دادەپۆشی. گرێنوی وەک ئەسپێک دەخەبتی. وەک بەندێکی ژێردەست، هەمیشە خاکییانە ئامادە بوو، هەموو ئەو کار و فرمانانەی کە درۆت پێی ڕا دەسپاردن، جێبەجێی دەکردن. هەرچەندە لە کاتی خەریکبوونی بە کاری تێکوەردان و لووسماڵ کردنی کرێمەکان، شوشتنی بوشکەکان، خاوێنکردنەوەی کارگەکە، یان هێنانی داری سووتان، گێژ و وڕ دەهاتە بەرچاو، بەڵام لە ڕاستیدا هیچ گۆشەیەکی گرنگی کارەکە نەبوو، هیچ هەنگاوێکی گۆڕانی بۆنەکان نەبوو، کە لە سەرنجی ئەودا رزگاریان ببێت. زۆر چاکتر لەوەی کە درۆت دەیەویست، گرێنوی بە لووتی خۆی چاودێری گواستنەوەی عەتری پەڕە گولەکانی دەکرد بۆ ناو رۆنەکەو، پاشان بۆ ناو کحوولەکە، تا رۆدەکرانە ناو شووشە گرانبەهاکان.  زۆر زووتر لەوەی درۆت سەرنجی بۆ بچێت، گرێنوی بە بۆنەکەی دەیزانی، چ کاتێک رۆنەکە زۆر داغ دەبێت، چ کاتێک گوڵەکان چکییان دەکرد، چ کاتێک رۆنەکە لە بۆنمژین تێربۆ دەبوو، بۆنی دەکرد و دەیزانی، کە چ گۆڕانێک لە ناو مەنجەڵی تێکەڵەکە روویدەدا، بە تەواوی لە چ چرکەساتێکدا کاری هەڵماندن و دڵۆپاندن پێویست بوو کۆتایی پێ بێت. جاربەجارێک خۆی وا پێشاندەدا، کە ئەویش ئەقلی بە کارەکە دەشکێت، بەڵام تەواو بێ وابەستەیی تەنها بە زانینی خۆی و، بێ ئەوەش کە ئاکارێکی وا بنوێنێت کە بۆنی سەربەخۆیی و ملکەچنەبوونی لێ بەدەربکەوێت. ئەو دەیگوت: "وا دێتە بەرچاوم، لەوانەیە رۆنەکە زۆر داغ بووبێت"، "وا بزانم، دەڵێی کاتی پاڵاوتنی هاتووە."، "وا هەست دەکەم، کە کحوولەکە لە ناو مەنجەڵی هەڵماندنەکە ئارەقی کردووە."... درۆتیش کە لە ڕاستیدا ئەوەندە زرنگ و زانا نەبوو، بەڵام هێندەش گێل و شەحتۆ نەبوو، وردە وردە لەوە گەیشت، کە ئەگەر ئەو بە پێی بڕیارەکانی گرێنوی کارەکان ڕاپەڕێنێت، ئەوا کارەکان زۆر بە مەن و رێکوپێک مەیسەر دەبن، ئەو بڕیارانەی کە گرێنوی بە شێوازی "وابزانم" یان "وا هەست دەکەم" دەری دەبڕین.  بەڵام چونکە هەرگیز گرێنوی ئەوانەی هەستی پێ دەکردن و دەیزانین، واتە نیازەکانی خۆی بە دەنگێکی بەرز دەرنەدەبڕی، یان

بەشێوەیەک کە وا پێشانبدات، کە ئەو باشتری لێ دەزانێت، هەروەها لەبەر ئەوەی، کە ئەو هەرگیز، پایەی دەسەڵات و فەرمانەکانی درۆتی بە پەلاریش بێت، نەدەخستە بەرگومان، بە تایبەت لەبەر چاوی مادام ئارنولفدا، بۆیە هیچ هۆیەک نەبوو، وا لە درۆت بکات، کە گوێڕایەلی پێشنیارەکانی گرێنوی نەکات، یان هێدی هێدی بڕیارەکان، بۆ ئەو بەجێنەهێڵێت.

ڕۆژ دوای ڕۆژ پتر، گرێنوی نەک هەر کاری تێکوەردانی مەنجەڵەکەی دەکرد، بەڵکوو سەرەڕای ئەو کارەی، باری هەڵدەگرت، ئاگری پێ دەکرد، دەیکوڵاند، دەیپارزنی، هەرچی درۆتە بە بازێک خۆی دەگەیاندە مەیخانەی(کوڤاترێ داوفین)، بۆ ئەوەی پێکێک شەراب بخواتەوە، یان دەچووە سەرەوە بۆ لای مادام، بۆ ئەوەی بزانێت، بارودۆخەکەی لە بارە. هەرچەندە کارەکەی گرێنوی دوو هێندەی پێشووی زیادی کردبوو، بەڵام چێژی لەوە وەردەگرت، کە بە تەنها بمێنێتەوەو، خۆی لەو هونەرە نوێیە بە تەواوی شارەزا بکات و جار بەجارێکیش تاقیکردنەوەیەکی بچووک بە ئەنجام بگەیەنێت. بە دزی دڵی خۆی زۆر بەوە خۆش دەکرد، کە دەیدیت ئەو کرێمەی کە ئەو خۆی بە تەنها سازی دەکات، زۆر بێگەردترە، ئەو دۆشاوە عەترەی کە ئەو ئامادەی دەکات زۆر پاراوترە، لەوەی کە پێکەوە لەگەڵ درۆت بەرهەمی دەهێنن.

کۆتایی مانگی گەلاوێژ کاتێ گوڵی یاسەمین دەستیپێدەکرد، لە مانگی ئابیش گوڵەشەوبۆ. ئەم دوو گوڵە ئەوەندە نایاب و عەترەکانیشیان ئەوەندە ناسک بوون، کە دەبوایە نەک هەر بەر لە ڕۆژهەڵاتن گوڵەکانیان بچنرێن، بەڵکوو پێویستییان بە کارێکی یەگجار نەرم و نیان و لەسەرخۆ بوو. بە گەرمی بۆنەکەیان کەم دەبووەوە، لە ناکاو بخرابانە ناو ڕۆنی گەرم، بە تەواوی خراپ دەبوون و تێکدەچوون. ئەوانە کە نموونەییترین گوڵی ناو گوڵان بوون، بە ئاسانی دەستییان لە گیانی خۆیان بەرنەدەدا، بە ڕاستی دەبووایە پیاو مەراییان لەبەردا بکات. لە ژوورێکی تایبەتی بۆندار، لەسەر تەختەی ساردی چەورکراو هەڵدەخستران، یان دەخرانە ناو پەڕۆیێکی چەور، بەو جۆرە دەبووایە وازیان لێ بێنن، تا بە هێواشی گیانییان دەدا. سێ ڕۆژ یان چوار ڕۆژی دەخایاند، تا سیس دەبوون و بۆنەکانی خۆیان بە هەناسە دەبەخشییە چەوری و ڕۆنی دەوروبەرییان. ئەوجا زۆر بە ئاگاییەوە، ئەو چینەگوڵە لادەبران و گوڵی تازەیان دەخستە جێگەیان. ئەو کارە دە جاران بگرە بیست جاران دووبارە دەکرایەوە، تا چەورییەکەیان تێراو عەتراورێژ دەکرد، ئەوجا پەڕۆکەکە دەگوشراو و ڕۆنە عەتراویەکەی لێ دەچکێندرا، ئەو حەلە مانگی ئەیلوول داهاتبوو. بڕی بەرهەمەکە زۆر کەمتربوو، لەوەی کە بە تێکوشین و کوڵاندن دەهاتەبەرهەم. بەڵام چۆنایەتیی ئەو کرێمی یاسەمینە، کە بە هەڵمژینی سارد دەهاتە دەست،

یان هی ئەو گوڵەشەوبۆیە کە بە چەوری وشک سازدەکرا، لە تەواوی بەرهەمەکانی تری هونەری عەترسازی پاراوتر و رەسەنتر بوو. بە تایبەت گوڵە یاسەمین، وا دیار بوو، کە بۆنە شیرینە ئێرۆتیکییەکەی خۆی وا دەپرژاندە ناو ئەو تەختە چەورانە، بە شێوەیەک تەختەکان دەتگوت ئاوێنەن، نە بکەی نەبخۆی نە برۆنییێ، بۆنەکەیان کتومت وەکو خۆی تیشک دەدایەوە. چونکە بێگومان کەپووی گرێنوی هێشتان بۆنی گوڵەکان و بۆنە دۆشراوکانیانی لێکتر جوودا دەکردەوە: بۆنەکە چەند پاراو دەبوو با ببایە، هێشتان بۆنی خودی چەورییەکە وەک تارایێکی تەنک کەوتبووە سەر رووی وێنەی ئەسلی بۆنەکەو، بۆنەکەی کەم دەکردەوە، نەرمی و ناسکی زێدەجوانی بۆنەکەی لاواز دەکرد، لەوانەشە هەر ئاواو بەوەندە پاراوییەی مرۆڤی ئاسایی بیتوانیبایە بەرگەی ئەو جوانییەی بگرێت... هەرچۆنی بوو بەو رێگای ساردمژییە، بەو رێگا ورد و کاریگەرە دەتوانرا ئەو بۆنە ناسکانە دەستگیر بکرێن. رێگایێکی باشتر لەمە نەبوو. ئەگەریش ئەو رێگایە بە تەواوی لووتی گرێنوی تێر نەدەکرد، بەڵام دەیزانی ئەوە بۆ چەواشەکردنی دنیایێکی پڕ لە کەللە پووت و کوڵەلووت هەزاران جار بەسە.

وەک بەکارهێنانی رێگای تێکوشین و کوڵاندن، ئەوەندەی پێ نەچوو، لەو هونەرەش، هونەری بۆندارکردن بە رێگای سارد، گرێنوی توانی بەسەر درۆتی وەستای باڵادەست بێت و بە رێگایێکی نهێنی، بە ملکەچی و گوێڕایەلی توانی ئەم باڵادەستییەشی لە درۆت بگەیەنێت. بەخۆشییەوە درۆت رێگای پێ دەدا کە بچێتە قەسابخانەو چەوری و بەزی گونجاو بکڕێت و، خاوێننیان بکات، خۆشییان بکات و بیانپاڵێوێت و رێژەی تێکەڵکردنیان دیاری بکات، درۆت خۆی لەم کارانە دەترساو ئەوانەی لا ئەرکێکی ناخۆش و دژوار بوو، چونکە چەورییێکی ناپاراو، پیس، تێکچوو، یان زۆر بۆنی بەراز، بەران، یان مانگای لێ بهاتبا، لەوانەبوو هەموو کرێمە گرانبەهاکە خراپ بکات. دانانی نێوانی تەختەچەورەکان لە ژووری بۆندار، کات و ساتی گۆڕینی چینە گوڵەکان، دیاری کردنی پلەی تێربۆ بوونی کرێمەکان، هەمووی بۆ گرێنوی بەجێ هێشتبوو، چۆن باڵدین کاتی خۆی هەموو هەنگاوەکانی بەرهەمهێنانی بۆ گرێنوی واز لێ هێنا، درۆتیش ئاوا هەمووی خستە سەرشانی گرێنوی، زۆربەی کارەکانی وەک ئەو رێسایانە پیادەدەکرد، کە فێری ببوو، بەڵام لە راستیدا گرێنوی بە زانستی لووتی خۆی کاری دەکرد، بێگومان درۆت بەمەی نەدەزانی.

درۆت دەیگوت: "ئەو کوڕە دەستڕەنگینە، هەستێکی باشی هەیە بۆ شتەکان." هەندێ جاریش بیری لەوە دەکردەوە کە: "بە کورتی، ئەو کوڕە زۆر لە من بەهرەدارترە، سەد جار لە من پتر عەترسازترە." لە هەمان کاتدا درۆت وەک گێلێک تەمەشای دەکرد، چونکە ئەو باوەڕی وا بوو، کە

کەس کەمترین شت لە بەهرەکانی گرێنوی فێرنابێت، لە کاتێکدا ئەو، درۆت، بەو قیچە بەهرەی خۆی، کەسانی تر فێری وەستایی دەکات. گرێنوی ئەو باوەڕەی ئەوی بەهێزتر دەکرد، بەوەی کە ژیرانە خۆی گێل دەکرد و، کەمترین هەوڵ و ڕەنجی خۆی پێشاننەدەدا، وەک ئەوەی هیچ شتێک لە بارەی بلیمەتییە تایبەتییەکەی خۆی نەزانێت، بەڵکوو تەنها بەپێی ئامۆژگاریەکانی درۆتی خاوەن ئەزموون رەفتار دەکات، بەبێ ئەوەی خۆی لە هاوکێشەکان شتێک بێت. بەم شێوەیە ئەوان بە تەواوی لەگەڵ یەکتردا گونجابوون.

پاشان بوو بە پایز و زستان هات. کارەکانی کارگەکە هێمنتر بوونەوە. عەتری گوڵەکان لە مەنجەڵ و شووشەکان لە سەردابەکە کەوتبوون، ئەگەر مادام ئارەزووی ئەوەی دەرنەبڕیبایە، ئەم، یان ئەو کرێم دابشۆرێت و بکرێت بە عەتر، یان فەردەیەک وشکەبەهارات، بهەڵمێنرێت، کارێکی ئەوتۆ نەبوو کە بیکەن. زەیتوون هێشتان دەستدەکەوت، هەر هەفتەی چەند سەبەتەیەکی پڕ. دەیانگوشین و رۆنی یەکەمییان لێ دەردەهێنان، سەرپاتەکەیان دەدایە ئاشی زەیتوون. هەندێ جاریش گرێنوی کحوولی لە شەراب دەگرت، بە ڕێگای هەڵماندن و پاڵاوتن.

درۆت کەم دەکەوتە بەرچاو. ئەو ئەرکی خۆی لەسەر جێخەوی مادام جێبەجێ دەکرد، ئەگەریش دەربکەوتبایە بۆنی درنی ئارەق و تۆوی لێ دەهات، هەر بۆ ئەوەش دەردەکەوت کە بچێتە مەیخانەی کوڤاترێ داوفین، ئیتر لەوێ گوم دەبوو. مادامیش کەم دەهاتە خوارەوە. خۆی بە کاروباری سامانەکەی خەریک دەکرد و، خەریکی رێکخستنی سندووقی جلوبەرگەکانی دەبوو، بۆ کاتەکانی دوای ساڵی رەشپۆشی. زۆربەی رۆژان گرێنوی کەسی نەدەدیت جگە لە ژنە خزمەتکارێک، کە شۆربای نیوەڕۆ و نانی ئێوارەو زەیتوونی بۆ دەهێنا. بە دەگمەن دەچووە دەرەوە. لە ژیانی گشتی و زبارەو هاوکاری یەکتر، واتە لە گواستنەوەو لە کۆبوونەوەی شاگردەکان، هەر هێندە بەشدار دەبوو، دەنا ئامادەبوون و ئامادەنەبوونی سەرنجی کەسی رانەدەکێشا. هیچ دۆستایەتی و پەیوەندییێکی نزیکی لەگەڵ کەسدا نەبوو، بەڵام زۆریش لە خەمی ئەوە دابوو، کە ئەمەی بە فیز و روحزلی، یان بە دوورەپەرێزی بۆ لێکەدەنەوە. کەم و زۆر رێگەی ئەوەی دەهێشتەوە کە شاگردەکانی تر ئەگەر بخوازن، بیدۆزنەوەو پێوەندی پێوە بکەن. ئەو وەستای هونەری دروستکردنی بێزاریی و خۆگێلپێشاندان بوو. بەڵام بێگومان نەی دەگەیاندە ئەوەی، کە خەڵک پێی ڕابوێرن و گاڵتەی پێ بکەن، یان وا بکات وەک قوربانی دەستی دەفتەرچەیەکی بۆگەنی پیشەیەک بەکاری بهێنن. توانی بووی وا بکات، کە بە تەواوی کەس بایەخی پێ نەدات. خەڵک بە حاڵی خۆی وازیان لێ هێنابوو. ئەویش جگە لەمە شتێکی تری نەدەویست.

## ٣٨

زۆربەی کاتی خۆی لە کارگەی عەترسازییەکە دەبردە سەر. لە بەرامبەر درۆتدا وای پێشاندەدا، کە گوایە، لە هەوڵی ئەوە دایە، ڕەچێتەیەکی نوێ بۆ ئاوی کۆلۆنیا بدۆزێتەوە. بەڵام لە ڕاستیدا تاقیکردنەوەی لەسەر هەندێ بۆنی تری زۆر جیاواز دەکرد. ئەو عەترە تایبەتییەی کە کاتی خۆی لە شاری مۆنتیپلییێر بۆ خۆی سازی کردبوو، هەرچەندە زۆر دەستیشی پێوە گرتبوو، بەڵام وردە وردە نەماو کۆتایی هات. عەترێکی تری بۆ خۆی سازکردبوو. بەڵام ئەمجارەیان بەوەندە وازی نەهێنابوو، کە بە پەڵەکروزێ لەو ماددانەی کە بۆنە بنچینەییەکانی مرۆڤی لێ دێت، بە خراپی بەڵام بە ڕاستی لاسایی بۆنی مرۆڤ بکاتەوە، بەڵکوو ئەمجارە توانای خۆی خستبووە کار، بۆ ئەوەی بۆنێکی تایبەت بە کەسایەتی خۆی، یان کۆمەڵێک بۆنی کەسایەتی جیا جیا بێنێتە بەرهەم.

لە سەرەتا بۆنێکی سەرنجبڕی بۆ خۆی دروست کرد، بەرگە بۆنێکی بۆری مشکاوی بۆ کاری ڕۆژانە، ئیتر کە ئەو بۆنەی لە خۆی بدابایە، کەس سەرنجی ئەوی نەدەدا، ڕاستە ئەوەشیان هێشتان  بۆنێکی مرۆڤیی وەک بۆنی پەنیری ترشاوی تێدا بوو، بەڵام وەکوو ئەوە وا بوو، کە کەوتبێتە سەر پێستی وشکی مرۆڤێکی پیر و، بە ناو چینێک جلوبەرگی ئەستوور لە گوش و خوریدا بە هاوسانی بێتە دەرەوەو بڵاوببێتەوە. بە بۆنێکی ئاوا دەیتوانی بێ گرفت بێتە ناو خەڵک. توندی بۆنەکە بەشی ئەوەی دەکرد، کە بوونی مرۆڤێک لە ڕووی بۆنەوە بسەلمێنێت، تا ئەو ڕادەیەش پەنهان بوو، کە کەس بێزار نەکات. کاتێک گرێنوی ئەم بۆنەی لە خۆی بدابایە، ئیتر لە ڕاستیدا لە ڕووی بۆنەوە بوونی نەبوو، بەڵام لە ڕووی بوونەوە بە سادەترین شێوە ئامادەبوونی خۆی پوارش دەکرد. بارێکی دوو لایەنەی دەبوو، دەیتوانی بەو بۆنە هەم لە ماڵەکەی ئارنولف و گەر پێویستیش بوو، لە کووچەو ڕێ و بانەکانی شار زۆر باش هەڵبکات.

بێ گومان هەندێک جار ئەو بۆنە سادە خاکییە بۆی دەبوو بە کۆسپ. بۆ نموونە کاتێک درۆت ڕایدەسپارد کارێکی بۆ بکات، یان ئەگەر خۆی ویستبای لە فرۆشگاییێک هەندێک میسک، عەنبەر یان شتێکی تر بکڕیت، جار وا بوو، بە هۆی بۆنەکە سەرنجی مرۆڤی بە تەواوی ڕانەدەکێشا، دوکاندارەکان

هەر نەیاندەدیت و فەرامۆشیان دەکرد، یان دەیان دیت، بەڵام بە هەڵە رەفتاریان لەگەڵدا دەکرد، یان لەکاتی سەوداکردن، جارێکی تر لە بیر دەچووەو فەرامۆش دەکرا. بۆ ئەم جۆرە بارودۆخانە ئەو عەترێکی تری کەمێک پوختتر و کەمێک بۆن ئارەقاوی سازکردبوو، کە بە هۆی چەند گۆشەو هێلێکی بۆنیی، بوونی گرێنوی تۆختر بەدەردەخست و وای دەخستە بەرچاوی خەڵک، کە کارێکی تەنگەتاوی هەیەو پەلەیەتی. هەروەهاش توانی بە بۆندارکردنی پەڕۆکێکی چەور بە هەویرێک، کە لە تێکەڵکردنی هێلکەمراوی تازەو ئاردەگەنمێکی نیوەبرژاو تریفەبۆنی درۆت ساز بکات، بەو بۆنەش دەیتوانی، ئەگەر پێویست بووایە، تا ڕادەیەک سەرنجی خەڵک بۆخۆی رابکێشێت.

بۆنێکی تر لە گەنجینەی بۆنەکانی کە دروستی کردبوون، بریتی بوو لە بۆنی ورووژاندنی هەستی بەزەیی پیاهاتنەوە، کە بۆ ژنانی تەمەن نێوەنجی بە کاری دەهێنا. ئەمە بۆنی شیری رۆن و دارێکی خوساوی خاوێنی لێ دەهات. ئەگەریش گرێنوی ریشی خۆی نەتاشیبایەوەو فێڵێکی تاریکیشی لە بن سەردا بایە، بە بەکارهێنانی ئەم عەترە خۆی دادەپۆشت و، وەک منداڵێکی هەژاری رەنگ زەرد، کە چاکەتۆکەیەکی سپی لە بەردا بێت و پێویستی بە یارمەتی بێت، دەهاتە بەرچاوان. ژنە دوکاندارەکان ئەگەر بۆنیان کردبایە، گوێز و هەرمێی وشککراوەیان دەخستە گیرفانی، چونکە زۆر برسی و زەلیل دەکەوتە بەرچاوی ئەوان. خۆ لەلای ژنە قەسابەکەش، کە ژنێکی پیر و دڵ پڕ لە سۆز بوو، دەیتوانی بە ئارەزووی خۆی لە ناو پاشماوەی هێسک و گۆشتی بۆگەن بگەڕابایەو چەندی بویستبایە بە خۆڕایی بۆخۆی بیبردبان، چونکە بۆنە بێ گوناهییەکەی دڵی دایکانەی دادەخورپاند. راستەوخۆ بە هۆی تێئاخنینی ئەو پاشماوانەش لە ئەلکحوول پێکنەرێکی سەرەکی بۆنێکی تری هەڵدەهێنجی، ئەو بۆنەشی لە خۆی دەدا، هەر کاتێک بیویستبووایە تاک و تەنها بووایەو کەس خۆی لە قەرە نەدابایە. ئەو بۆنە چواردەوری گرێنوی بە ئاووهەواییێکی هێمنی قێزەون و هالاوێکی بۆگەن دادەپۆشی. وەک ئەو بۆگەنییەی کە لە کاتی لە خەوهەڵساندا لە دەمە نەشۆراو و بایەخپێنەدراوەکان دێتە دەرەوە. ئەو بۆنە کاریگەری تەواوی هەبوو، تەنانەت درۆت کە کەمیش هەستییار بوو، بێ دەستی خۆی پشتی خۆی تێ دەکرد و بە پەڵە پروزێ خۆی دەگەیاندە هەوای ئازاد، بێ ئەوەی خۆشی بە رۆشنی بزانێت چی بەرەو دەرەوە پاڵی پێوە دەنێت. ئەگەر ئەو کوڕە یەک دوو دانە تنۆکی ئەو بۆنە قێزەونەی لە نێوچەوانی خۆی هەڵبسووبایە، بەس بوو، بۆ ئەوەی هەموو مرۆڤ و گیاندارێکی لێ دوور بکەونەوە.

لە پەنای ئەو بۆنە جۆراوجۆرانە، کە بە پێی پێویستییەکانی دەرەوە وەک جلوبەرگ دەیگۆڕین، بۆ ئەوەی بە هۆیانەوە بتوانێت لە جیهانی مرۆڤەکاندا بێ کێشەو گیروگرفت رابوێریت و بوونی

ڕاستەقینەی بە نەناسراوی بمێنێتەوە، بۆ ئەمە گرێنوی سوپاسی ئەشقە ڕاستەقینەکەی خۆی دەکرد: ڕاوی سەختی بۆنەکان. جا چونکە ئامانجێکی گەورەی لەبەردەمی خۆیدا دەدیت و هێشتان پتر لە ساڵێک کاتی لەبەردەمدا مابوو، نەک هەر بە حەز و مەراقێکی ئاگرین دەچووە پێشەوە، بەڵکوو بە چنینی نەخشەیەکی ورد  خۆی چەکدار دەکرد و هونەرەکانی خۆی پڕ و دەوڵەمەند دەکرد و هێدی هێدی ڕێگای کارەکانی پوخت و تەخت دەکرد. لەو جێگەیەوە دەستی پێ کرد، کە لە لای باڵدینی دەستی لێ هەڵگرتبوو، واتە لە دادۆشین و گرتنەوەی بۆنەکانی شتی بێ گیان: بەرد، مێتال، شووشە، دار، خوێ، ئاو، هەوا...

ئەوەی جاران بە بەکارهێنانی ڕێگای ئاڵۆزی  هەڵماندن بە سەختی تێیاندا فەشەلی هێنا بوو، ئێستا بە هۆی هێزی توندی هەڵمژینی چەورییەکان سەرکەوتنی تێدا بەدەستدەهێنان. دڵی کەوتە سەر دەسکەدەرگاییێکی سفر، کە بۆنێکی ساردی کەڕاوی لێ دەهات، چەند ڕۆژێک لە دۆنی مانگای گرت. پاشان چەورییەکەی لێ داکەلاند، بۆ ئەوەی ئەزمایشی بکات، لە ڕاستیدا ئەگەریش بڕی بۆنەکەی زۆر کەم بوو، بەڵام بە ڕۆشنی بۆنی دەسکی دەرگاکەی لێ دەهات. کاتێکیش کە چەورییەکەی بە ئەلکحوول داشۆری، هێشتان بۆنەکەی هەر مابوو، بۆنێکی بێ پایان خۆش، دوور، کە بە هالاوی گیانی شەراب داپۆشرابوو. بەڵام لەو جیهانەدا تەنها لووتی پاراوی گرێنوی هەستی بەم بۆنە دەکرد، ئەوەی گرنگە بۆنەکە بوونی هەبوو، ئەوەش مانای ئەوە بوو: کە بەلای کەم لە ڕووی مەبەست و ئامانجەوە بۆنەکە لە ئارادا بوو. ئەگەر بهاتبا گرێنوی هەزاران دەسکە دەرگای هەبووایەو هەزار ڕۆژ لە دۆن و چەوری گرتبان، ئەوا دەیتوانی تنۆکێکی وردیلەی بێ گەردی چڕاوی بۆنی دەسکەسفر بەرهەم بهێنێت، کە بۆنەکەی ئەوەندە توند بووایە، بە بۆنکردنی هەموو کەسێک دەیتوانی خەیاڵی دەسکەسفرێکی ڕاستەقینە لەبەر لووتی خۆی ببینێت.

هەمان سەرکەوتنی بەدەستهێنا لە بەکارهێنانی بەردە کلسێکی پۆرگدار، کە لە ڕەزە زەیتوونەکەدا لەبەردەم کۆختەکەی خۆی دۆزیبوویەوە. لە چەوری هەڵیخست، بڕێکی کەم کرێمێکی بەردی لێ بەدەستهێنا، ئەوەندە بۆنی ئەو کرێمەی پێ خۆش بوو، کە باسی ناکرێ. ئەمەی بە تێکەڵی بە بۆنی هەموو ئەو شتانە تاقیکردەوە، کە لە دەوروبەری کۆختەکەی بە دەستی کەوتن. لە ئاکامدا هەنگاو بە هەنگاو توانی تەواوی باخچە زەیتوونەکەی پشت کڵێسای فرانسیزکا وەک مۆدێلێکی وردی مینیاتوری لە شووشۆکەی بچووک بچووک بەرهەم بهێنێت و دەمەوانەیان بخاتە سەر و لەگەڵ خۆیدا بیانگێڕێت و هەر کاتێک بیویستبایە دەیتوانی بە هۆی بۆنەکان تەماشای باخچەکە بکات.

ئەوە هونەری پارچە بۆنەکان بوو کە گرێنوی وەستایانە هێنابوویە ئارا، ئەمانە جۆرە گەمەیەکی خنجیلەی زۆر جوان بوون، کەهیچ کەسێکی تر جگە لە گرێنوی نە نرخی دەزانین و نە دەیتوانی ئاشنایان ببێت. بەڵام ئەو خۆی بە تەواوکاری ئەو کارە بێ مانایە لە خۆشییان شاگەشکە ببوو، بە شێوەیەک نە لە رابردووی و نە دواتریش هیچ چرکە ساتێکی بەختەوەری راستەقینەی ئاوای لە ژیانی خۆیدا نەدیبوو، چونکە ئەو بە مەراق و تێکۆشانێکی گەمەئامێز، دیمەن و ژیانی ئارام و وێنەی تاکە تاکەی شتەکانی لەو بۆنانە دەئافراند. ئیتر ئەوەندەی نەبرد دەستی بە بەکارهێنانی شتی گیاندار و زیندوو کرد.

مێشە زستانەو کرم و جورج و بێچووە پشیلەی ڕاو دەکرد و هەمووی لە چەوری گەرم دەخنکاندن. شەوان دەخزایە ناو پشتیر و ئاغەڵان و بۆ چەندین دەمژمێر پەڕۆی چەور یان لەفافی لە رۆن هەڵکێشراوی لە جەستەی چێڵ و بزن و کودەڵە بەرازان دەئاڵاند. یان بە دزی دەچووە ناو کۆزێک بۆ ئەوەی بە نهێنی خوری لەبەر بەرخێک داببڕێت و خوریە بۆندارەکەی لە ناو گیانی شەرابدا دابشۆرێت. لە سەرەتادا جارێ بەرەنجامەکانی زۆر بە دڵ نەبوو. چونکە گیاندارەکان وەکو شتە بێ گیانەکان، وەک دەسکە دەرگاو بەردەکان، خۆیان نەدەخستە بەردەستی و سەرپێچییان دەکرد لەوەی کە بۆنییان لێ وەربگیرێت. بەرازەکان خۆیان لە کۆڵەگەی ئاغەڵەکان هەڵدەسووی و لەفافەکانیان لەبەر خۆیان دادەپچڕی. کاتێک گرێنوی بە چەقۆوە خۆی لە مەڕەکان نزیک دەکردەوە، مەڕەکان دەیانباڕاند. مانگاکان دەغەزرین و پەڕۆ چەورەکانییان لە گوانی خۆیان دەکردەوە. هەندێک قالۆنچە، کە ڕاوی دەکردن، کاتێک دەیویست کاریان لەسەر بکات، دەرهاویشتەیەکی قێزەون و بۆگەنییان دەردەدا، جورجەکان لە ترسان خۆیان پیس دەکرد و پیساتییەکەیان تێکەڵ دەبوو بە کرێمە بۆندارە زۆر هەستیيارەکەی. ئەو گیاندارانەی کە ئەو دەیویست لە چەورییان هەڵبهێنێت، وەک گوڵەکان بە ئاسانی، بێ کێشە بۆنەکانی خۆیان نەدەدایە دەست، یاخود بە ناڵین و هەناسەبڕکێ بۆنی خۆیان دەدایە دەست، بەرگرییان دەکرد لە دژی مردن، یان نەیان دەویست دەست لە ئەندامەکانییان بدرێت، سەرپێچییان دەکرد و دەجەنگان، بەمەش ئارەقەیەکی زۆری ترس و مەرگییان دەردەداو چەورییە گەرمەکەیان دەترشاند و تێکیان دەدا. بە شێوەیەکی ماقووڵ ناتوانێت پیاو ئاوا کار بکات. پێویستە گیاندرەکان هێور بکرێن، بە شێوەیەکی کتوپڕ هێور بکرێن، بە شێوەیەک کە بەوە ڕانەگەن بترسن یان سەرپێچی بکەن. بۆیە ناچار بوو کە بیانکوژێت.

یەکەمین جار تاقیکردنەوەی لەسەر گوجیلە سەگێک کرد. گوجیلەکەی لەبەر دەم قەسابخانەیەک بە هۆی پارچە گۆشتێکەوە فریوداو لە دایکی بە دووری خستەوە، تا گەیاندییە ناو کارگەکەی، لە کاتێکدا گوجیلەکە بە خۆشحاڵییەوە چلێسی پارچە گۆشتەکە ببوو، پڕی دایە گۆشتەکەی دەستی چەپی، ئەویش کوتکە دارەکەی دەستی راستی خێواندە پشتی سەری و گوجیلەکە دەسبەجێ گیانی لەدەستدا. بەشێوەیەک دەمێک بوو گرێنوی گوجیلەکەی لەسەر شیشبەندێک خستبووە نێوان چەند چینێک چەوری، بەڵام هێشتان خۆشحاڵی بە لمووز و چاوەکانیەوە مابوون. بەوجۆرە سەگبۆی لەو گوجیلەسەگە وەردەگرت، بێ ئەوەی ئەو بۆنە بە ئارەقی ترس ئالّوودە بوویێت. بێگومان دەبووایە ئاگای لەوە بووایە! کە کەڵاک و گوڵەچنراوەکان زوو سیس دەبوون و دەژاکان. بۆیەشە گرێنوی پاسەوانی لە نێچیرەکەی خۆی گرت، نزیکەی دوازدە سەعات پاسەوانی گرت، تا ئەو کاتەی یەکەمین هاڵاوە بۆنێکی هێشتان خۆش، بەڵام خەرابببوو لە جەستەی سەگەکە هەڵی کرد. ئیتر دەمودەست کۆتایی بە کاری بۆنگریی هێناو کەلاکی سەگەکەی دوور خستەوەو چەورییە کەمێک بۆناویی بووەکەی رووکردە ناو مەنجەلێک و یەکسەر بە ئەلکحوول دەستی بە شۆردنی کرد. ئەوجا ئەلکحوولەکەی هەڵماند تا بڕێکی بە قەد سەری پەنجە مایەوە، ئەو قیچەشی رۆکردە ناو کەموولەیەکی شووشەی بچووک. ئەو عەترە بە رۆشنی بۆنێکی شێداری، تازەی، کەمێک توونی مووسەگی لێ دەهات، بە شێوەیێکی سەرسوڕهێنەر بۆنی گوجیلەکەی لێ دەهات. کاتێک گرێنوی شووشە عەترەکەی لە لووتی پیرە دێڵەسەگەکەی قەسابخانە نزیک کردەوە، بە خۆشحاڵییەوە دەستی بە حەپین کرد و ئیتر دایکی گوجیلەکە نەیدەویست لمووزی خۆی لە شووشەکە دوور بخاتەوە. بەڵام گرێنوی سەری شووشەکەی توند داخست و خستییە باخەڵی خۆی، بۆ یادگاری ئەو رۆژە خۆشە، کە بۆ یەکەمین جار لە ژیانیدا لەوە سەرکەوت کە بۆنی جەستەی زیندەوەرێک بگرێت، تا ماوەیەکی زۆر شووشەکەی لای خۆی پاراست.

ئیتر هێدی هێدی، بەڵام زۆر لەسەرخۆو بە ئاگاییەوە، خۆی لە مرۆڤ نزیک کردەوە. لە سەرەتادا بە تۆڕێکی خانە فراوان خۆی نزیک دەکردەوە، چونکە لەسەرەتادا ئەوەندە مەبەستی نەبوو نێچیر بگرێت، بەڵکوو پتر مەبەستی ئەوە بوو، کە ئامانج و رێوشوێنی ڕاوەکەی تاقیبکاتەوە.

ئێواران بۆنە سەرنجبڕەکەی خۆی لە خۆی دەداو دەچووە ناو مێوانخانەی کیاتر دۆتفا، خۆی دەخزاندە نێوان مێوانەکان، پارچە پەڕۆی بچووک و وردیلەی چەور و لە رۆن هەڵکێشراوی دەخستە ژێر کورسی و مێزەکان و ناو ئەو کون و قوژبنانەی کە بەرچاو نەبوون. چەند رۆژێک دواتر کۆیدەکردنەوەو تاقیکردنەوەی لەسەر دەکردن. بەڕاستی لە پاڵ هەموو بۆن و بەرامەکانی چێشتخانەکەو چەقە دووکەڵی جگەرەو بۆنەکانی شەراب، کەمێک بۆنی ئادەمیشییان لێ دەهات.

بەلام بۆنێکی ئاستەم و زۆر نادیار و شاراوە، پتر بۆنی هاڵاوی ئاپۆڕەیەکی دەهێنایەوە بیر، لەوەی بە بۆنی کەسێکی تایبەت بچێت. توانی لە ناو کڵێساش تریفەبۆنێکی نزیک لەو بۆنە لە ئاپۆڕەی خەڵکەکە وەربگرێت، بەڵام پاراوتر و ئارەقاوی تر. بۆ ئەمە پەرۆیەکانی تاقیکردنەوەی لە ٢٤ی مانگی تشرینی دووەم لە بنەوەی تەختەکانی کڵێسا هەڵواسی و لە ٢٦ی هەمان مانگ کۆیکردنەوە، دوای ئەوەی پتر لە حەوت ژەمە نوێژ خەڵک لەسەر تەختەکان دانیشتبوون: تێکەڵەبۆنێکی قێزەون لە بۆنی ئارەقی سمت و، خوێنی ژنان و بن ئەژنۆی شێدار و دەستی شەتەکخواردوو لەگەڵ هەناسەی هەزاران سروودگۆ و گەرووی پڕ چرپە چرپی سڵاوکردوو لە حەزرەتی مەریەم و هەڵم و دووکەڵی بخوور و مایرە، هەموو ئەم بۆنانە نیشتبوونە سەر پارچە پەڕۆکان: قێزەون لە تێکەڵوپێکەڵی، لە نەدیاری و ناڕۆشنی، لە قەرەباڵغی، مرۆڤ هێڵنجی پێ دەهات، بەڵام بێ ئەملاو ئەولا، بە ئاشکرا بۆنی ئادەمیزاد بوون.

یەکەمین بۆنی تایبەتی مرۆڤێک کە گرێنوی هێنایە بەرهەم، بۆنی نەخۆشێکی نەخۆشخانەی شاریتێ بوو. بۆنی کرێکارێکی چەرمدرووی نەخۆش کە تازە بە نەخۆشی سیل مردبوو. توانی چەرچەفی تەختی ئەو نەخۆشە کە بۆ سووتان داندراوبوو، بۆ خۆی بەرێت. دوو مانگ بوو ئەو نەخۆشە لەسەر تەختەکەی کەوتبوو، تا ڕادەیەک چەوری لەشی سوابووە چەرچەفەکەی، کە تەواو هاڵاوی جەستەی هەڵمژی بوو، گرێنوی توانی یەکسەر بۆنەکەی لێ دابشۆرێت. مرۆڤ لە بەرەنجامەکەی سەرسام دەبوو: کابرای چەرمدروو لە ژێر لووتی گرێنوی لە ناو گیانی شەرابەوە و لە شێوازی بۆنەکان جارێکی تر زیندوو ببووەوە. ئەگەریش ئەو کەسە بەو ڕێگا زیندووکردنەوە تایبەتییەو بەو هەموو چڵک و لەکەی نەخۆشییەکەی زۆر ناشیرین بوو، بەڵام ئەوەی گرنگ بوو ئەمە بوو، کە بە ئاشکرا لە ژوورەکەدا بەهۆی ئەو بۆنە تایبەتییە بە کەسێک ئاشنا دەبوویت: پیاوێکی کورتەباڵای تەمەن سی ساڵان، قژزەرد، کەپووگەورە، پەڵکورت، پێپان، کێرزل، رووترش، دەم بۆنسارد، مرۆڤێکی ناشیرن. لە ڕووی بۆنەوە ئەو کابرا چەرمدرووە نرخی گوجیلە سەگەکەی نەبوو، شایستەی هەڵگرتن نیە. لەگەڵ ئەوەش تەواوی ئەو شەوە گرێنوی وازی لێ هێنا تا لە ناو کۆختەکەی بە ئازادی هەڵبفڕێت و بێ و بچێت و جار بەجاریش بۆنی بکات، بەمەش لە ناخی دڵییەوە هەستی بە خۆشی دەسەڵاتداری دەکرد، بەوەی کە توانیویەتی تریفەبۆنی مرۆڤێکی تر بهێنێتە بەرهەم. ڕۆژی دواتر بۆنەکەی ڕشت.

لەو ڕۆژانەی زستان گرێنوی ئەزمایشێکی تریشی کرد. ژنە دەرۆزەکەرێکی کەڕولاڵ هەبوو، کە بە شارەکەدا دەگەڕا. گرێنوی فرانکێکی دایێ بەرامبەر بەوەی رازی بێت کە ڕۆژێکی تەواو پەڕۆی

چەورکراو بە تێکەڵەی جیا جیا لە ڕۆن و چەوری بخاتە سەر پێستی بە رووتی. ئەوەی دۆزیەوە کە تێکەڵە چەورییێکی شێڵدراو لە چەوری باش پالێوراوی بەراز و مانگا بە ڕێژەی دوو بۆ پێنج و تێکردنی بڕێکی کەم لە ڕۆنی تازەی رووەک گونجاوترین چەورییە بۆ گرتنی بۆنی ئادەمیزاد.

ئیتر گرێنوی ئەمەی بەس بوو. وازی لەمە هێنا کە تەواوی جەستەی هیچ مرۆڤیکی زیندوو بەرزەفت بکات و کاری عەترسازی لەسەر بکات. هەوڵێکی ئاوا مەترسییەکی گەورەی تێدا بوو، جگە لەمەش هیچ زانیارییێکی نوێی پێ بەدەست نەدەکەوت. ئێستا تێگەیشت کە ئیتر ئەو بەتەواوی بەسەر تەکنیکەکەدا زاڵ بووەو دەتوانێت بۆن لە ئادەمیزاد هەڵبهێنجێت، ئیتر پێویستی بەمە نەبوو دیسان ئەمە بۆ خۆی بسەلمێنێت.

خودی بۆنی ئادەمیزادیش بۆ ئەو شتێکی وا گرنگ نەبوو. چونکە ئەو دەیتوانی بۆنی ئادەمیزاد بەشی پێویست بە تەواوی لاسایی بکاتەوە. ئەوەی ئەو مەراقی بوو، بۆنی هەندێ مرۆڤی تایبەت بوو: مرۆڤە زۆر دەگمەن و نایابەکان، دانسقەکان، ئەوانەی ئاوری خۆشەویستیی لە دڵی خەڵک دادەگیرسێنن. ئەوانە بوون قوربانییەکانی ئەم.

## ٣٩

له مانگی کانوونی دووەم مادام ئارنۆڵف شووی به دۆمینیکۆ درۆتی شاگردی یەکەمی خۆی کرد. بەمە پلەی درۆت بەرز بووەوە بۆ وەستای عەترسازیی و دەستکێشدروویی. وەستا خواردنێکی باشی وەردەگرت و شاگردیش خواردنێکی سادە. مادام دۆشەکێکی نوێی بۆ تەختەکەی کڕی، کە لەمەوبەدوا بە فەرمی دەبوو بە جێخەوی خۆی و درۆت، جلە ڕەنگاوڕەنگەکانی لە سندوقەکە دەرهێنا، ئیتر ئەوەی دی هەموو وەکو پێشوو مایەوە. مادام هەر ناوە خۆشەکەی فامیلی خۆی هێشتەوە، واتە ئارنۆڵف، دارایی کارگەو کلیلی ژێرزەمینەکەشی هەر لە دەستی خۆی هێشتەوە. درۆت هەموو ڕۆژێ ئەرکە سێکسیەکانی خۆی جێبەجێ دەکردو، پاشانیش خۆی بە شەراب فێنک دەکردەوە، گرێنویش هەرچەندە ئێستا ببوو بە شاگردی یەکەم و تاکە شاگرد، بەڵام پاشماوەی کارەکانی تریشی بە هەمان کەمە مووچەکەی پێشووی ڕادەپەڕاند و لە کۆختە هەژارەکەی خۆی شەوی بەسەر دەبرد.

ساڵی نوێ بە لافاوی کاسیا، مێلاقە، بەیبوون و وەنەوشەو نەرگزەجاڕ دەستی پێ کرد. لە یەکشەممەیەکی مانگی مارت، نزیکەی ساڵێک دوای گەیشتنی بە شاری گراس، گرێنوی خۆی ئامادە کرد بۆ ئەوەی بچێت بزانێت کیژۆڵەکە گەیشتۆتە کوێ، ئەوەی ناو باخچەی پشت دیوار، لە کۆتایی شارەکە. ئەو جارە گرێنوی  خۆی بۆ هەڵمژینی بۆنەکەی ئامادە کردبوو، وەک بڵێی بە تەواوی دەیزانی چی چاوەڕوانی دەکات...، لەگەڵ ئەوەش هەر لە نیوەی ڕێگە، لە نزیک دەروازەی ناف، کاتێک هەستی خۆی ڕاگرت و بۆنی کرد خوێنی دەمارەکانی فیچقەیان کرد: کچەکە هێشتان هەر لە وێ ماوە، ئەو ڕووەکە جوانە بێ وێنەیە، زستانی بە سەلامەتی بڕیوە، تەڕتر بووە، گەشاوەتەوە، ڕسکاوە، درێژتر بووە، جوانترین هێشووە گوڵی دەرکردووە!  هەروەک ئەو پێشبینی کردبوو، بۆنەکەی بەهێزتر ببوو، بێ ئەوەی لە پاراوی کەم بووبێتەوە. ئەو بۆنە کە ساڵێک لەمەوپێش زۆر تەنک و ناسک خۆی دەپرژاند و دەتکاند، ئەوا ئەمڕۆ خوناوەی کردووەو خەست بۆتەوەو بووە بە ڕووبارێک لە کرێمێکی سووکی بۆندار، کە بە هەزاران ڕەنگ دەدرەوشێتەوە،

سەرەڕای ئەوەش هەر ڕەنگێکی گرد بووەتەوەو چیتر پسۆک و لەرزۆک نیە. ئەو رووبارەش ئاوی خۆی لە کانیاوێک وەردەگرێت کە هەمیشە ئاوی خوڕتر دەبێت و پتر دەزێ، گرێنوی ئاوای هێنا بەرچاوی خۆی. ساڵێکی تر، تەنها ساڵێکی تر، دوازدە مانگی تر، ئەوسا ئەو کانیاوە دەتەقێ، هەڵدەقوڵی، ئەوسا دەتوانێت بێت و هەڵیبهێنجێت، پڕژاوی بۆنە سروشتتیەکەی ڕاوبکات.

تا ئەو شوێنەی نیازی بوو بە درێژایی دیواری شارەکە رۆیشت، باخچەکە کەوتبووە پشتی دیوارەکە. هەرچەندە کچەکە لە ناو باخچەکەدا نەبوو، بەڵکوو لە ژوورێکی پشت پەنجەرە داخراوەکاندا بوو، بەڵام بۆنەکەی وەک نمەبایەک بەم ناوەدا هەڵی دەکرد. گرێنوی زۆر بە ئارامی وەستا. ئەمجارە بە هەڵمژینی ئەو بۆنە وەک جاری پێشوو مەست نەبوو، گێژ و کاس نەبوو، وەک جاری پێشووش ڕەفتاری نەکرد. بەڵکوو لێواولێو پڕ بوو لە هەستی بەختەوەری ئەشق و خۆشەویستیی، لە دوورەوە هەستی لە پەرستراوەکەی خۆی ڕاگرتبوو، چاودێری دەکرد، دەیزانی دوای ساڵێکی تر بۆ خۆی هەڵی دەگرێت. بە ڕاستیش گرێنوی، ئەو گەنە تاک و تەنهایە، ئەو جانەوەرە، ئەو گرێنوی-یە نائادەمییە، کە هەرگیز هەستی بە خۆشەویستیی نەکردبوو، لە خۆشەویستی نەگەیشتبوو، لەم ڕۆژەی مانگی مارت لە پاڵ دیوارەکەی شاری گراس وەستابوو، خەریکی ئەشق و خۆشەویستیی بوو، لە ناخەوە بەو خۆشەویستییەی خۆی هەستی بە بەختەوەری دەکرد.

بێ گومان گرێنوی مرۆڤێکی خۆش نەدەویست، تەنانەت ئەو کیژەی پشت دیواری ماڵەکەشی خۆش نەدەویست، ئەو بۆنی کیژەکەی خۆش دەویست، بۆنەکەی لە کەللەی دابوو، ئەشقی بۆنەکەی ببوو. تەنها بۆنەکەی خۆشدەویست و هیچی تر، گەرەکی بوو لە دوارۆژدا تەنها ببێتە خاوەنی بۆنەکەی و بەس. سوێندی بە ژیانی خۆی خوارد کە دەبێت دوای ساڵێکی تر بۆنەکەی بهێنێتە ماڵەوە. دوای ئەو سوێندە، یان دوای ئەو بەڵێنە، کە بۆ ئەم بۆنەی دوارۆژی وەفادار بمێنتەوە، بە خۆشحاڵییەوە شوێنەکەی جێهێشت و بە ناو دەروازەی کۆوەر گەڕایەوە شار.

بۆ شەوەکەی کاتێک لە ناو کۆختەکەی پاڵ کەوتبوو، جارێکی تر بۆنەکەی هێنایەوە خەیاڵی خۆی. بەڵام لەم هەوڵە سەرکەوتوو نەبوو، نەیتوانی بۆنەکەی وەک دەیخواست بهێنتە بەر خەیاڵی خۆی، لە ژێریا نقووم دەبوو، لە نزیکەوە بۆنەکەی نەوازش دەکرد و بە بۆنەکەش خۆی نەوازش دەکرد، ئەوەندە خەوناوی لە بۆنەکە نزیک کەوتبووەوە، وەک ئەوەی بەڕاستی هەر ئێستاکێ خاوەنی بۆنەکە بێت، بۆنی تایبەت بە خۆی، مەستانە ماوەیەکی درێژی پڕ لە چێژی ئەشق و خۆشەویشتی بۆ بۆنەکەو خۆشەویستی بۆنەکە بۆخۆی بەسەر برد. ئەو دەیویست ئەو هەستی ئاشقبوون بە خۆیە لەگەڵ خۆی ئاودیوی خەو بکات. بەڵام هەر کە چاوەکانی خۆی قوچاند و بە

قەد ماوەی هەناسەدانێک بۆرژا. بۆنەکە ئەمی بە تەنها بەجێ هێشت و، لە هیکرِا ئاوا بوو، لە جیاتی ئەم، بۆنێکی سارد و تیژی ئاغەڵی بزنان ژوورەکەی تەنییەوە.

گرێنوی سامگرتوو راپەڕی، "ئەمە چییە؟" ئاوا بیری کردەوە، "ئەگەر ئەو بۆنە، کە من دەمەوێت ببم بە خاوەنی... ئەمە چیە، ئەگەر ئەو بۆنە کۆتایی هات؟ ئەمە وەک بۆنەکانی تر نیە، لە ئەندێشەدا جاویدان و سەقامگرتوو نابێت، ئەمە بە ڕاستی خەرج دەبێت و نامینێت. ئەمە بۆنێکی پەرتەواز و ناجێگیرە. ئەدی ئەگەر ئەو بۆنە هەمووی بەکار هات و کۆتایی هات، ئەوساش ئەو سەرچاوەیەی کە من بۆنەکەم لێ وەرگرتووە، چیتر لە دنیا بوونی نابێت. ئەوسا وەکو پێشوو من ڕووت و قووت دەمێنمەوەو ناچار دەبم بە بۆنە قوڵلابییەکان خۆم بپارێزم. نەخێر حاڵم پەرێشانتر دەبێت لە پێشوو! چونکە من لەو ماوە دەبم بە خاوەنی ئەو بۆنە، بۆنە جوانە تایبەتییەکەی خۆم، ئەوسا من ناتوانم ئەو بۆنە جارێکی تر لە یاد بکەم، چونکە من هەرگیز ناتوانم بۆنێک لە یاد بکەم. ئەوسا دەبێت بە درێژایی ژیانم بە بیری ئەو بۆنە خۆم خۆم بخۆمەوە، وەک ئێستا، وەک ئەندێشەکەی خولەکێک بەر لە ئێستام، من دەبم بە خاوەنی و خەرجی دەکەم، گومی دەکەم ... ئەگەر وایە من ئەو بۆنەم بۆچی گەرەکە؟"

ئەمە بۆ گرێنوی ئەندێشەیەکی گەلێک ناخۆش بوو. زەندقی بەم خەیاڵە چوو بوو، خەیاڵی ئەوەی ئەو بۆنە کە هێشتا دەستی نەکەوتووە، کاتێکیش بە دەستی دەکەوێت، بخوازێت و نەخوازێت لە دەستی دەچێت. ئەو بۆنە دەبێت بەشی چەندی بکات؟ بەشی رۆژێکی؟ چەند هەفتەیەکی؟ لەوانەیە ئەگەر زۆر بە رەزیلی بەکاری بهێنێت، هەر بەشی مانگێکی دەکات؟ ئیتر دەهاتە بەرچاوی کە چۆن دوا تنۆکی بۆنەکە بە خۆیدا دەکات، پاشان گیانی شەراب لە شووشەکەی وەردەکات، تا کەمترین بڕی بۆنەکە بە فیڕۆ نەچێت. ئەوسا دەهاتە بەرچاوی، بۆنی دەکرد، کە چۆن بۆنە خۆشەویستەکەی بۆ هەمیشە، بێ دەسەڵات، کۆتایی دێت و نامینێت. ئەوە وەک مەرگێکی هێواش دەبێت، ئەمە خنکانێکی ئاوەژوو دەبێت، ئەمە وردە وردە هەڵماندنی پڕ ئازاری خودی خۆی دەبێت بۆ جیهانێکی سامناک.

تەزووی بە لەشدا دەهات. خەیاڵی ئەوەی بۆ هات واز لە نەخشەکەی بهێنێت، بچێتە ناخی دەریای شەو. گەرەکی بوو بەسەر شاخە بەفراوییەکاندا هەڵبگەڕێت، بێ پشوو، هەزاران میل ببڕیت و خۆی بگەیەنێتەوە شاخەکانی ئۆڤێرنیە، خۆ بخزێنێتە ناو کونی ئەشکەوتەکەی جارانی و بچێتەوە خەوی مەرگاوی. بەڵام ئەمەی نەکرد. هەستاوە دانیشت، کۆڵی نەدا بۆ ئەو خەیاڵە، هەرچەندە خەیاڵێکی بەهێز بوو. کۆڵی بۆ ئەمە نەدا، چونکە ئەمە ئەندێشەیەکی کۆنی خۆی بوو،

خۆبکێشێتەوەو خۆ بخزێنێتە ناو ئەشکەوتێک، دەمێک بوو بەو خەیاڵە ئاشنا ببوو. ئەوەی پێی ئاشنا نەبوو ئەوە بوو، ببێت بە خاوەنی بۆنێکی ئادەمیی ئاوا مەزن، وەک بۆنی کچەکەی پشت دیوارەکە. ئەگەریش بیزانیبایە، خاوەنێتیی ئەم بۆنەی، بە کۆتایی هاتن و نەمانی پڕ ئازاری بۆنەکە دەستدەکەوێت. وای بۆ دەچوو، کە دەستکەوتن و پاشانیش لەدەستچوونی بۆنەکە پتر شایانی هەیە، لەوەی وا بەسەرپێیی واز لە هەردووکییان بهێنیت. چونکە ئەو دەمێک بوو وازی لە ژیانی خۆی هێنا بوو، بەڵام هەرگیز رێکنەکەوتبوو ببێت بە خاوەنی و ئەوجا گومی بکات.

ورده ورده دوودڵییەکەی ڕەوییەوەو بەمەش تەزی جەستەی کۆتایی هات. هەستی بەوە کرد، کە چۆن بۆ پیادەکردنی ئەو نەخشەیەی کە بۆ خۆی کێشابوو، دووبارە خوێنی گەرم ژیانی دەخاتەوە بەر و ورەی پێ دەبەخشیتەوە. بەڵام ورەیەکی بەهێزتر لەوەی پێشوو، چونکە ئەمجارە چیتر ورەکەی تەنها حەزێکی ڕووت نەبوو، بەڵکوو ئەمجارە بڕیارێکی ئەزمایشکراویشی هاتبووە سەر. گرێنوی گەنە کەوتە بەردەم هەڵبژاردن، خۆی لە ناوخۆیدا وشکهەڵێنێت، یان خۆی بەربداتەوە. هی دووەمی هەڵبژارد و چاکیشی دەزانی، کە ئەمە دوا جاری دەبێت. بە خۆشییەوە گەڕایەوە ناو بارەگاکەی خۆی، بۆ ناو پووشەکە، بۆ ژێر پێخەفەکە، خۆی وەکو پاڵەوانێک دەهاتە بەرچاو.

بەڵام گرێنوی ئەو گرێنوی-یە نەدەبوو، ئەگەر هەر هەستێکی سادەی پاڵەوانبازی ئەمی ئاسوودە کردبایە. بەڵکوو لەگەڵ ئەوەش ئەو خاوەنی ویستێکی چیڕی خۆسەلماندن بوو، ئەو بوونەوەرێک بوو خاوەنی غەریزەیەکی خۆسەپێن بوو، خاوەنی بیرێکی ورد و ساف بوو. باشە-ئەوە ئەو بڕیاری دا، ببێتە خاوەنی ئەو بۆنەی کچی پشت دیوارەکە. کاتێکیش دوای چەند هەفتەیەکی کەم بۆنەکەی لەدەست دەچێت و ئەویش بەو لەدەستچوونە گیان لەدەست دەدات، ئەوە شتێکی باشە. بەڵام لەوەش باشتر ئەوە دەبێت، کە ئەو بەمە نەمرێت و بمێنێت و بۆنەکەشی هەر هەبێت، یان بەلای کەم تا دەکرێت مەرگەکەی دوا کەوێت. پێویستە هەوڵی ئەوە بدات بۆنەکە بمێنێت. پێویستە رێگە لە نەمانی بگیرێت، بێ ئەوەی بۆنەکە خەسلەتەکانی خۆی گوم بکات — ئەمە گیروگرفتێکی عەترسازییە. هەندێک بۆن هەن، کە دەیان ساڵ بە چەسپاوی دەمێننەوە. کانتۆرێک کە مسکیان تێ هەڵسووا بێت، تیلمە چەرمێک کە رۆنی دارچینی هەڵمژتبێت، سەرکە عەنبەرێک، سندوقۆکەیەک کە لە داری سیدار دروستکرابێت، وەک بڵێی خاوەنی بۆنێکی هەتاهەتایین. ئەوانەی تر رۆنی لیمۆ، شیری کوفکەگوڵ و بۆنی چەندەها گوڵ، ئەگەر مرۆڤ بێ بەربەست بەرەلای هەوایان بکات، ئەوا دوای چەند دەمژمێرێک دەهەڵمێن و نامێنن، بەڵام هونەری عەترسازییە کە بەرامبەر ئەو خەسلەتە نەگونجاوەیان دەوەستێت و رێگە لەم هەموو ناجێگیری و

پەرتەوازییەیان دەگرێت و بەرزەفتییان دەکات، واتە زنجیریان دەکات و لەنگەریان دەکات، ئازادییان جڵەو دەکات، هونەرەکەش لەوەدایە، کە زنجیرکردنەکەیان بە شێوەیەک دەبێت، کە بۆنە بەستراوەکەیان ئازادی دەرخستنی خۆیان لەدەست نادەن، بەڵام ئەوەندەش توند دەبەسترێنەوە کە نەتوانن ڕابکەن. جارێک گرێنوی لە گرتنەوەی بۆنی کوفکەگوڵ توانیبووی بە شێوازێکی زۆر تەواو بەسەر ئەم هۆنەرە زاڵ ببێت، توانیبووی بۆنە ناجێگیر و کورتخایەنەکەی بە هۆی بڕێکی زۆر کەم لە میسکی پشیلە، ڤانێلا، لابدانوم، داری سەروو بەند بکات، ئەوجا بەڕاستی توانیبووی بەکاری بهێنێت. جا ئەگەر وابێت بۆچی نەتوانرێت کارێکی ئاوا لەسەر بۆنی کچەکەش بکرێت؟ دەبێ بۆچی ئەو نایابترین و بەنرخترین بۆنەی ناو بۆنان وا بە خەسارەت بەکاربهێنێت و بەفیڕۆی بدات؟ ئەمە کارێکی نەگونجاوە! کارێکی یەگجار نەشیاوە! ئایا کەس ئەلماس بە لووس نەکراوی بەکاردەهێنێت؟ کەس کەرت و پارچەی زێڕ بە گەردەنی خۆی وەدەکات؟ کێ وا دەکات؟ گرێنوی راوکەری نەزانی بۆنەکان، وەک درۆت و مشەخۆرەکانی تر، وەک هەڵمێنەر و گوڵپڵیشێنە نەزانەکان؟ یاخود ئەوەتە ئەو گەورەترین عەترسازی سەر ئەو زەمینە نیە؟

بۆچی زووتر نەهاتبووە سەر ئەو بیرە، لە داخان لە سەری خۆی دەدا: بێگومان ناکرێت ئەو تاکە بۆنە بێ وێنەیە هەر ئاوا بە کاڵی بەکار بهێنرێت. پێویستە بۆنەکە بگرێت و خۆشی بکات، کارێکی زێڕینگەرانە لەسەر مەزنترین رووە جوانەکانی بکات، لە هەمان کاتدا لە ناو بۆنەکانی تردا بەند و بەرزەفتی بکات، تا بەو شێوەیە بۆنەکەی تیشک بداتەوە. دەبێت ئەو عەترێک بە بەکارهێنانی هەموو ڕێساو هونەرەکانی عەترسازیی دروست بکات و بۆنی کچی پشت دیوارەکەش دەبێت نۆتەکانی دڵ بن.

بە دڵنیایی ماددەیەکی کۆمەککار، وەک نۆتەی بنچینەیی، نۆتەی ناوبژ، نۆتەی سەر دەبێت بەکار بهێنرێت، مسک، زیبد، رۆنی گوڵەباخ یان لیمۆ وەک سەرەنۆتە، وەک نوکەبۆن، نەگونجاون. بۆ عەترێکی ئاوا، بۆ عەتری ئادەمیزاد، پێکهاتەی تر پێویستن.

## ٤٠

له مانگی مایسی هەمان ساڵ، له ناو مێرگێکی گوڵەباخان، له نێوان شاری گراس و ئاوایی ئۆپیۆدا، که به لای ڕۆژهەڵاتەوه هەڵکەوتبوو، لاشەی کچێکی پازده ساڵان به ڕووت و قووتی دۆزرایەوه. به کوتەکێکی دار له پشتەوەی سەری درا بوو. ئەو جوتیارەی که ئەو لاشه سامناکەی دۆزییەوه له حەژمەتان وا پەشۆکابوو، خەریک بوو گومان بخاته سەر خۆی، کاتێک به شڵەژاوی و به دەنگێکی لەرزۆک ئەم هەواڵەی به پۆلیس ڕاگەیاند. له جیاتی ئەوەی به پۆلیس بڵێت ئەو هەرگیز شتی وا سامناکی نەدیوه، گوتی، ئەو هەرگیز له ژیانیدا شتێکی لەمه جوانتری نەدیوه.

جا به ڕاستیش کچێکی زێده جوان بوو. جوانێکی خوێن شیرین، ڕەشەسمەر، لەو جوانانەی که دەڵێی له هەنگوێنێکی تیر و تاریک دروستکراون. لووس و شیرین، هەتا خوا حەزی دەکرد دڵڕفێن، لەوانەی که تەنها کاتێک تیلەیەکی نیگایان، یان تاڵەموویێکی قژیان، وەک قامچی دەوەشێنن و ئارامی دەخەنه دەوروبەری خۆیان، بەڵام چ ئارامییێک، وەک ئەوەی له چەقی گەردەلوولێک گیرسابێتەوه، خاوەنی هێزێکی ڕاکێشانی وا، وەک ئەوەی بۆخۆیان پێی بزانن، بێ بەرگری، حەزەکانی گیانی پیاوان و ژنان بۆخۆیان ڕادەپچڕێنن. کچێکی گەنج بوو، تازەخوێن، هێشتان کاریگەریی جۆری شەنگی و شۆخیی خۆی به تەواوی، به تێری پێشانەنەدابوو. هێشتان ئەندامه ڕسکاوەکانی لووس و تورت بوون، مەمکەکانی دەتگوت هێلکەی سپیکراون، مووی پڕ و ڕەش بڵاوەی سەر تەبەشی پانی ببوو، هێشتان هێلەکانی لەشی پڕ بوون له ناسکی و نهێنیی. پرچی بەسەریەوه نەما بوو، بکوژەکەی بڕی بووی و لەگەڵ خۆی بردبووی، وەک چۆن جلوبەرگەکەشی لەگەڵ خۆی بردبوو.

گومانی ئەو تاوانه خرایه سەر قەرەجەکان. قەرەجەکان هەموو شتیان لێ دەوەشایەوه. وەک دەزانرا قەرەجەکان فەرشییان له کۆنه جلوبەرگان دەچنی و به مووی مرۆڤ بالیفیان دروستدەکرد، له پێست و ددانی لەسێدارەدراوەکان بووکەشووشەی بچووکیان دروستدەکرد. بۆ هەموو تاوانه

نائاساییەکان خەڵک بیری بۆ قەرەجەکان دەچوو. بەڵام لەو کاتەی ئەو تەرمە دۆزرایەوە هیچ قەرەجێک لەو ناوە نەمابوو، لە مانگی کانوونی یەکەمەوە قەرەجەکان ئەو ناوەیان بەجێهێشتبوو.

جا چونکێ هیچ قەرەجێک لەو ناوە نەبوو، گومان کەوتە سەر ئەو ئیتالیانەی کە لە کار دەگەڕان و بۆ کارکردن دەهاتنە ئەوێ. بەڵام لەم دەمەدا هیچ ئیتالییێکیش لەم ناوە نەبوو، هێشتا بۆ هاتنییان زوو بوو، ئەوان لە مانگی حوزەیرانەوە دەهاتنە ئەو وڵاتە، بۆ چنینی گوڵەیاسەمین، کەواتە نەدەکرا ئەوانیش دەستییان لەو کارە هەبێت. تا لە دواییدا گومان کەوتە سەر بارۆکەدروستکەرەکان، لە نێو ئەواندا بە دوای بکوژی کچەکەدا گەڕان، بەڵام هەمووی بێ ئەنجام بوو. ئەوجارە گوترا دەبێت جوولەکەکان ئەم تاوانەیان کردبێت، پاشتر گوایە قەشە هەوەسبازەکانی دێری بێنێدیک، کە تەمەنی هەمووان لە حەفتا ساڵان پتر بوو، ئەوجا ئەندامانی بزووتنەوەی ماورەرەکان، ئەوجا نەخۆشەکانی خەستەخانەی شاریتێ، ئەوانەی کە نەخۆشی دەروونییان هەبوو، ئەوجا رەژووسووتێنەکان، ئەوجا سواڵکەر و ئەوجا پاشانیش بەگلەرە بێ ئەدەبەکان، بە تایبەت گراف کابریس گومانی خرایە سەر، چونکە ئەو سێ جاران ژنی هێنا بوو، لەگەڵ ئەوەش وەک دەگوترا، لە ژێرزەمینەکانی ئاهەنگی سێکسابازی سازدەکردو لەو ئاهەنگانەدا خوێنی کچانی فڕدەکرد، بۆ ئەوەی توانای پەڕینی پتر بێت. دیارە کەس نەیدەتوانی ئەم شتانە بسەلمێنیت. کەس تاوانی کوشتنەکەی بە چاوی خۆی نەدیتبوو، جلوبەرگ و قژی کچەکەش نەدۆزرایەوە. دوای چەند هەفتەیەک ئەفسەری لێکۆلەرەوە کۆتایی بە لێکۆڵینەوە هێنا.

ناوەندی مانگی حوزەیران زۆر لە ئیتالییەکان بە خۆو بە خێزانەوە دەرکەوتن، بۆ ئەوەی کاری گوڵچنین بکەن. هەرچەندە وەک جاران جوتیارەکان کاریان دەدا بە ئیتالییەکان، بەڵام بەهۆی تاوانەکە لە کچ و ژنەکانی خۆیان قەدەغە کرد، هەڵسوکەوتیان لەگەڵدا بکەن. خۆپاراستن هەر باشە. لەگەڵ ئەوەی بەڕاستی ئەو گەڕۆکانە لە روودانی تاوانی کوشتنەکە بەرپرسیار نەبوون، بەڵام لە ڕووی ئامانجەوە، دەکرا ئەوان دەستییان لەو کوشتنەدا هەبوو بێت، بۆیەشە باشتر بوو کە لێیان سایەد بن. دوای دەستپێکی یاسەمینچنین ئەوەندی نەبرد دوو تاوانی تری کوشتن ڕوویاندا. دیسان قوربانییەکان دوو کچی جوانی وەک نیگار بوون، دیسان دوو کچی گران و شەنگی قژڕەش بوون، دیسان رووت و قووت لە ناو مێرگی گوڵاندا دۆزرانەوەو برینێکی پان بە پشتی سەریانەوە بوو. دیسان بکوژ هیچ شوونێکی دیار نەبوو. ئەو هەواڵە وەک ئاگر بڵاوبووەوە، خەریک بوو کینەو دوژمنکاری دژی خەڵکە گەڕۆکەکان دەتەقییەوە، کاتێک زانرا کە هەر دوو کوژراو، دوو کچی ئیتالی بوون و کچی کرێکارێکی خەڵکی گێنوا بوون.

ئیتر ترس وڵاتی داگیر کرد. خەڵک نەیاندەزانی تووڕەیی زۆری خۆیان دژی کێ دەرببڕن. هەندێک هەبوون هێشتان گومانیان دەخستە سەر ملی شێتەکان یان سەر گرافی گومانلێکراو، بەڵام کەسیش بە تەواوی نەیدەتوانی بە هەق باوەڕ بەمە بکات، چونکە ئەمانە شەو و ڕۆژ لە ژێر چاودێریدا بوون، گرافیش دەمێک بوو بەرەو پاریس سەفەری کردبوو. ئیتر خەڵک خۆیان کۆکردەوەو لەیەکتری نزیککەوتنەوە، پێشتر هەموو لە ئاقارە چۆلەکان باریان لێ خستبوو. شارەکان دەستەی پاسەوانی شەویان لە هەموو گەڕەکێک دامەزراند. پۆلیس چاودێری لەسەر دەروازەکانی شار توندتر کرد. بەڵام ئەمانە هیچییان سوودیان نەبوو. چەند ڕۆژێک دوای دوو کچە کوژراوەکان، دیسان لاشەی کچێکی کوژراویان دۆزییەوە. ئەویش بە هەمان شێوازی پێشوو کوژرابوو، هەمان هەڵسوکەوتی لەگەڵدا کرابوو. ئەمەیان کچێکی سەردینیی جلشۆر بوو، لە کۆشکی قەشەکان کاری دەکرد، لە نزیک حەوزە گەورەکەی دەم نافوورەی فۆکس کوژرابوو، واتە راستەوخۆ لەبەردەم دەروازەی شارەکە. سەرەڕای ئەوەی کە بەردەم بەڕێوەبەرایەتییەکانی شار پڕ ببوون لە ئاپۆڕەی راپەڕیو و تێکچڕژاوی هاووڵاتییان، هێشتان پاسەوانی سەر دەروازەکانی شار و پاسەوانی شەوان چڕ تر و بەهێزتر کران. دوای کەوتنی تاریکی، هاتنەدەرەوە بۆ هەموو مێیینەکان قەدەغە کرا. ئیتر لەم هاوینە هەفتە نەبوو، لاشەی کچێکی کوژراو نەدۆزرێتەوە. هەموو کچەکانیش تازە لەسەرەتای ئەوەدابوون، ببن بە ژن، هەر هەمووشییان لە جوانترینی کچان و زۆربەی جارانیش لە رەشەسمەرە دڵبەرەکان بوون. هەرچەندە ئەوەندەی نەبرد، کە ئیتر بکوژەکە دەستی لە کچە خۆییەکانی دانیشتوانی ئەوێش نەدەپاراست، کە بە زۆری نەرمینەو پێست سپی و گۆشتنتر بوون. تەنانەت کچە قژخەنەییەکان، قژزەرەدەکان، ئەگەر زۆر لەڕ نەبان، دەکەوتنە رێزی قوربانییە نوێکان. ئەو لە هەموو لایێک دەیدۆزینەوە، نەک هەر لە دەوروبەری شار، بەڵکوو لە ناوەڕاستی شاری گراسیش، تەنانەت لە ناو ماڵەکانیش. کچی دارتاشێک لە ناو ژووری ماڵەکەی لە نهۆمی پێنجەم بە کوژراوی دۆزرایەوەو، کەسیش لە ماڵەکە هەستی بە هیچ خشپەیەک نەکردبوو، هیچ سەگێکیش دەستی نەگەیاندرابووێ، لەگەڵ ئەوەش سەگەکان لە شوێنی خۆیان نقەیان لێوە نەهاتبوو، هەرچەندە ئەم سەگانە هەمیشە بە ڕووی هەموو بیانییێک دەوەستانەوەو دەحەپین. دەتگوت بکوژەکە وەک جنۆکە نەبیراو و بێ جەستە بووە.

خەڵک توورەیی خۆیان دژی کاربەدەستان دەردەبڕی و جنێویان پێ دەدان. بچووکترین دەنگۆ خەڵکی دەهەژاند و دژی دەوڵەت کۆیدەکردنەوە. دێوەرەییێکی گەڕۆک، کە پۆدرەی ئیشق و کرێم و هەتوانی دەفرۆشتن، گرتییان و خەریکبوو پارچەپارچەی بکەن، گوایە بەرهەمەکانی لە هەنجنراوی

قژی کچان دروست دەکات، ئاگریان لە نەخۆشخانەی شاریتێ بەردا. ئەلیکسەندەر میزنارد، کە بازرگانێکی کوتاڵفرۆش بوو، نۆکەری ماڵەکەی خۆی دایە بەر گوللە، کاتێک بەشەو دەگەڕایەوە ماڵەوە، چونکە وای دەزانی، بکوژی کچەکان ئەم خۆیەتی. ئەمانەی بۆیان هەڵدەسووڕا، کچە ئازەبەکانی خۆیان دەنارده لای خزمە دوورەدەستەکان، یان بۆ مێوانخانەکان لە شارەکانی نیتسا و ئایکس و مارسێل. ئەفسەری لێکۆڵەرەوە بە فەرمانی ئەنجوومەنی شار لە پۆستەکەی لادرا. جێگرەکەی فەرمانی دا کە لاشەی مووبڕاوی کچەجوانەکان لەلایەن دەستەیەکی پزیشکان لە باری کچێتیی بپشکنرێن. دەرکەوت کە هیچیان لە کچێتی نەکەوتوون و هیچ یەکێکییان تخوون نەکراون.

لە جیاتی ئەوەی ئەو زانیارییە ترسی خەڵکەکە برەوێنێتەوە، بە پێچەوانە هێندەی تر ترس و سامی خەڵکەکەی زیاد کرد، چونکە هەموو کەس لە دڵی خۆیدا وای بۆ چوو بوو، کە ئەو کچانە دەستییان بۆ بردراوەو بەمەش وا تێگەیشتبوون، کە بەلای کەم، هەرنەبێ بە پاڵنەرێکی ئەم تاوانانەی بکوژ ئاشنان. بەڵام ئێستا دوای ئەم پشکنینە هیچینا نەدەزانی و بە تەواوی سەرسام ببوون و نەیاندەزانی چی بکەن. ئەوانەشی کە باوەڕیان بە خودا هەبوو، دەچوون بە نوێژکردن و خۆیان رزگار دەکرد، بیریان دەکردەوە، کە هەر نەبێت خودا ماڵی خۆی لە دەستی ئەم تاوانکارە ئەهریمەنییە دەپارێزێت.

ئەنجوومەنی شار، دەستەیەکی سی کەسی لە دەوڵەمەنترین و دیارترین پیاوە گەورەکان و خانەدانەکانی شاری گراس، کە زۆربەیان رۆشنبیر و دژانی کڵێسا بوون، لەو کەسانە بوون کە تا ئەو کاتە خوازیاری ئەوە بوون، کە قەشە وەک پیاوێکی باش رێگەیان بدات، کە دێر و کڵێساو پەرستگاکان بکەن بە کۆگا یان کارگە. ئەو پیاوە زل و خۆبەگەورەزانانەی ئەنجوومەنی شار بە ناچاری خۆیان دەستەودامێنی قەشەی پیاوچاک کرد، کە بۆیان لە خوا بپاڕێتەوە، بەڵکوو ئەو جانەوەرە کچکوژە نەفرەتییەیان بۆ ئاشکرا بکات، کە بە دەسەڵاتی دنیایی ناتوانن دەستگیری بکەن، وەک چۆن پیاوە نوورانییە پێشینەکەی لە ساڵی ١٧٠٨ لە دەردو بەڵای کلۆمسکە رزگاری کردن، کە ئەو ساڵە هەڕەشەیان لە وڵاتەکەیان دەکرد. جا بە ڕاستی لە کۆتایی مانگی ئەیلوول دژی ئەو کچکوژەی شاری گراس، کە تا ئەو کاتە بە لای کەم بیستوچوار کچی لە کچە هەرە شەنگەکانی شارەکە، لە هەموو چینەکانی دانیشتووان کوشتبوو، لە لایەن خودی قەشە خۆی لە هەموو دێر و کڵێساو پەرستگاکانی شارەکە و هەروەهاش لە کڵێسای نۆتردام بە نووسین و بە زارەکی ئاهەنگی نەفرەتکردنی لە دژدا گێڕدرا.

نەفرەتلێکردنەکە سەرکەوتووانە کاریگەری خۆی کرد. کچ کوشتن کۆتایی هات. مانگی تشرینی یەکەم و دووەم بێ دۆزینەوەی هیچ تەرمێک رەت بوون. لە سەرەتای مانگی کانوونی یەکەم، لە شاری گرێنۆبلەوە هەواڵی ئەوە هات، کە بکوژێک پەیدا بووە، کچان دەکوژێت، دەیانخنکێنێت، جلوبەرگییان لەبەردا دادەپچڕێنێت، قژیان لە بنوبۆتکەوە دەردەهێنێت. جا لەگەڵ ئەوەی ئەو تاوانە چەپەڵە بە هیچ شێوەیەک وەک هی بکوژەکەی شاری گراس رێکوپێک بە ئەنجام نەگەیەنرابوو، بەڵام هەموو دنیا لەوە دڵنیابوو کە ئەمەش تاوانی هەمان بکوژەکەی شاری گراسە. خەڵکی گراس زانییان کە چیتر  ئەو دڕندەیە لە شارەکەیان نەماوە، بەڵکو حەوت رۆژەڕێ لە دووری ئەوان لە شاری گرێنۆبل رق و کینەکانی خۆی هەڵدەڕێژێ، بەمە هەستییان بە ئازادییێک کرد و سێ جاران خاچییان کێشا. کاروانێکی مەشخەڵهەڵگرتنیان بۆ ڕێزگرتن لە قەشەی شار رێکخست و لە بیست و چواری مانگی کانوونی یەکەم نوێژێکی گەورەی سوپاسگۆییان دابەست. لە یەکی کانوونی دووەمی ساڵی ١٧٦٦ـەوە ئیتر پاسەوانی چڕ و توندی شار سووک کراو قەدەغەکردنی چوونەدەرەوەی شەوانەی ژنان هەڵگیرا. مرۆڤ باوەڕی نەدەکرد، چۆن ئەوەندە زوو ژیانی گشتیی تایبەتی خەڵک گەڕاوە باری ئاسایی جاران. دەتگوت ترس و سامەکەی پێشوو فووی لێ کراو کوژاوەتەوە، ئیتر کەس باسی ئەو تاوانکارییەی نەدەکرد، کە پێشتر باڵی بەسەر شارەکەو دەوروبەریدا کێشا بوو. تەنانەت لە ناو ئەو خێزانانەشدا باسی لێوە نەدەکرا، کە بەر ئەو تاوانە کەوتبوون. دەتگوت نەفرەت و نزای قەشە تەنها کاری لە بکوژ نەکردبوو، بەڵکوو هەموو بیرەوەری و یادێکیشی لەو شارەدا سڕی بووەوە. ئەوەش بۆ خەڵکی ئەوێ باش بوو.

تەنها ئەوەی کیژێکی وای هەبوو، کە تازە پێڕا دەگەیشت، هێشتان چاودێری لێ دەکرد و حەزی نەدەکرد بێ چاودێر بسووڕێتەوە، کاتێک دنیا تاریک دەبوو، ترس دایدەگرت و بەیانیش کە بە زیندوویی و بە تەندروستیی دەیدیت، خۆشحاڵ دەبوو. بێگومان بێ ئەوەی بیەوێت دان بە هۆی ئەمەدا بنێت.

## ٤١

بەڵام لە شاری گراسدا پیاوێک هەبوو، باوەڕی بە گەڕانەوەی ئەو ئاشتی و ئاسایشە نەبوو. ئەو پیاوە ئەنتۆن ریچ بوو. دووەمین پیاوی گەورەی دەوڵەت بوو، لە خانووێکی دەوڵەتدا دەژیا کە کەوتبووە سەرەتای جادەی درۆیت.

ریچ کابراییێکی بێوەمێرد بوو، کچێکی هەبوو ناوی لاورا بوو. هەرچەندە هێشتان تەمەنی چواردە ساڵی تەواو نەکردبوو. ریچ هێشتان لەسەر شنگ و تاقەتی خۆی مابوو، بیری لێ کردبووەوە کە جارێ ژن نەهێنێتەوە. ئەو دەیویست جارێ کچەکەی بە شوو بدات. بە راستیش چاوی لەوە نەبوو کە بیداتە باشترین پیاو، بەڵکو پیاوێکی کە لێی بووەشێتەوەو بتوانێت سەرپەرشتی بکات.  بەڵام تا ئەو کاتە سەرلەنوێ ژنهێنانەوەی خۆی دوا خستبوو. بارۆنێک لە شاری بۆیۆن هەبوو، خاوەنی کوڕێک بوو، مولکێکی زۆریشی لە شاری ڤێنسێ هەبوو ، کە پارەیەکی چاکی دەکرد، زوو لەگەڵ ریچ پەیمانیان دابوو هەرکە کوڕ و کچەکانیان گەورە بوون لێکییان مارە بکەن.  ئەگەر بێت و لاورا بچێتە ڕێی خۆی، ئەوجا پاشان ئەویش هەستی خۆی ڕووەو ماڵە خانەدان و دیارەکانی درێی، ماوبێرت یان ئەوانەی فۆنتمیشێل ڕادەگرێت، نەک لەبەر ئەوەی ئەو فیزی زۆرەو خۆی بە زل دەزانێت، یان دەیەوێت لە کەڵی شەیتان بێتە خوار و دەبێت بووکێکی خانەدانی هەبێت، بەڵکوو ئەو دەیەوێت خانەوادەیەک دابمەزرێنێت و نەوەو وەچەی بخاتە سەر سکەی ژیان، وەچەو نەوەیەک کە لە ناو کۆمەڵگا دیار بن و کاریگەرییان لە ژیانی سیاسیدا هەبێت. بۆ ئەوەی بگات بەو ئامانجەش بەلای کەم پێویستی بە دوو کوڕ هەیە، یەکێکیان کاروبارەکانی بۆ بگرێتە ئەستۆ، لە کاتێکدا ئەوەی تریان هەنگاو بە هەنگاو رێچکەی ژیانی یاسایی خۆی بەرەو پێشەوە دەبڕێت و دەگاتە پەرلەمان و بگرە دەگاتە پایەی گرافیش. گەیشتن بەو ئامانجانە بۆ پیاوێکی وەک ئەو هەر ئەو کاتە جێگەی ئومێد و سەرکەوتنە، ئەگەر بێت و خۆی و خێزانەکەی لەگەڵ ئاغاو بەگلەر و گرافەکانی ناوچەکەی تێکەڵ ببن.

ئەوەی پاڵی پێوە دەنا کە خۆی بە شایستەی گەیشتن بەو ئامانجە بەرزانە بزانێت، سامانە زۆر و زەوەندەکەی بوو. ئەنتۆن ریچ دەوڵەمەندترین کەسی ناوچەکەو دەوروبەری بوو. نەک هەر لە گراس خاوەنی زەوی و زار بوو، کە نارنج و زەیتوون و گوش و گەنمیان تێدا دەچیندرا، بەڵکوو لە شارەکانی ڤێنس و دەوروبەری ئەنتیبیش زەوی و زاری هەبوو، کە هەمووی بە کرێ دابوون. خانوو بەرەی هەبوو لە شاری ئایکس و لە لادێکان، بەشی لە چەندین کەشتی هەبوو، کە هەموو لە ڕێئاوەکانی هیندستان کاریان دەکرد، بازاڕگەیەکی لە شاری گێنوا هەبوو، هەروەها خاوەنی گەورەترین عەمباری بازرگانی کەرەسە عەترییەکان و بەهارات و ڕۆن و چەرم بوو لە فەرەنسا.

بەڵام لای ریچ کچەکەی لە هەموو سامانەکانی بە نرخ تر بوو، لاورا تاقانە بوو، تازە تەمەنی دەبووە شازدا ساڵان، قژی سووری خەنەیی، چاوەکانی سەوز، خوێن شیرن، دڵبەر، بە جۆرێک چ ژن چ پیاو کە دەیان دیت، بە جارێک لە جوانیدا حەیران دەبوون و ئیتر نەیاندەتوانی چاوی لێ هەڵبگرن، وەک ئەوەی بەستەنییەک بە زمان بلێسنەوە، ئاوا دەموچاویان بە چاو دەلێسایەوەو گێلانە بێ دەستی خۆیان ئەو کارە تاموچێژدارەیان لە چارە بەدەردەکەوت. تەنانەت ریچ خۆشی کە چاوی بە کچەکەی دەکەوت، گرفتاری ئەو جوانییە دەبوو، بۆ کاتێکی نادیار، چارەگە سەعاتێک، یان بۆ نیو سەعات، هەموو دنیا و کارەکانی خۆی لەبیر دەچووەوە، بە جۆرێک کە لە خەویشدا جارێک لە جاران ئاوای بەسەر نەدەهات، بە تەواوی لە تەماشاکردنی ئەو کچە جوانە دەتوایەوەو، پاشان کە واگا دەهاتەوە، نەیدەزانی دەیویست چی بڵێت و چی بکات. بەم دواییە بە دڵێکی زۆر نارەحەت سەرنجی دەدا خۆی، کاتێک ئێواران کچەکەی دەخەواند، یان بەیانییان، کاتێک دەچوو کچەکەی واگا بهێنێت، دەیدیت کچەکەی هێشتان لە خەو دایە، دەتگوت خۆی خستۆتە ناو باوەشی خودا، وێنەی سمت و سنگی لە ژێر جلەکانی خەویدا دەرپەڕیبوون، نیگاری مەمکەکانی، مەچەکە لووس و ئانشکەکانی، کە دەمووچاوی خۆی خستبووە سەریان، هەناسەدانە گەرم و ئارامەکەی...، کاتێ ئەمەی دەدیت گەدەی وێک دەهاتەوە، گەرووی تەنگ دەبوو، ئەوندە تفی قووت دەدایەوەو، ئیتر هەر خودا بۆخۆی دەزانێت! نەفرەتی لە خۆی دەکرد، کە ئەو باوکی ئەو ژنەیەو پیاوێکی تری بێگانە نیە، جا هەر پیاوێک باو ئەو ژنەی وەک ئێستا لەبەردەمدا بکەوتبایە، ئەوجا دەیتوانی بێ سڵەمینەوەو پڕ بە ئارەزووی خۆی، خۆی بخستبایە تەنیشت و سەر و ناو باوەشی. ئارەقە واگای دەهێنا، ئەندامەکانی جەستەی دەلەرزین، کاتێک ئەو حەزە سامناک و دڕەندەیەی لە ناو خۆیدا دەخنکاندو خۆی بۆ دەچەماندەوەو بە ماچێکی پاکی باوکانە واگای دەهێنا.

له ساڵی پێشوو، کاتی کوشتنی کچەکان، هێشتان گرفتاری ئەو حەز و ئارەزووە نەگونجاوە نەهاتبوو. کاریگەری سیحری جوانی کچەکەی، سیحرێکی منداڵانە بوو، بەلای کەم ئەو بۆ خۆی وای لێکدەدایەوە، بۆیە چ جاران بە جیددی لەوە نەترسا بوو، کە لەوانەیە لاوراش ببێتە قوربانی دەستی بکوژەکە، بە تایبەت لەبەرئەوەی، هەموو کەس بەوەی دەزانی کە نە منداڵ و نە ژن، بەڵکوو تەنها کچانی وێراگەیشتوو بوون، کە دەبوون بە قوربانی دەستی ئەو بکوژە. راستە ئەویش پاسەوانیی کۆشکەکەی بەهێزتر کردبوو، پەنجەرەی نهۆمەکانی سەرەوەی سەرلەنوێ هەموو شیشبەند کردبوو، فەرمانی بە کارەکەر و نۆکەرەکان دابوو، کە پاسەوانی ژوورەکەی لاورا بکەن، بەڵام ئەو قەت لەگەڵ ئەوەدا نەبوو، کە کچەکەی خۆی ڕەوانەی دوورەدەستان بکات، وەک هاوقەرانەکانی کە نەک هەر کچەکانیان، بەڵکوو هەموو خێزانەکانی خۆیان ناردبووە پەناوپەسیوان. ئەو ئەمەی بە کەمایەتی دەزانی و دەیگوت، ئەمە بێ حورمەتییە، پێویستە ئەندامێکی ئەنجوومەنی شار و نوێنەری پلە دووی دەوڵەت، لە خۆڕاگری و بێباکی، لە ئازایی و ملکەچنەکردن ببێتە نموونەو پێشەنگ بۆ هاووڵاتییان. سەرەڕای ئەوەش ئەو پیاوێکی وا بوو، کە لێ نەدەگەڕا خەڵکی تر بڕیاری بۆ بدەن، بە تایبەت خەڵکێکی تەنگەتاو کراوی سەرلێشێواو، خۆ بەرەڵاییێکی تاوانکاری نەناسراو، ئەوە هەر هیچ. بۆیەشە ئەو یەکێک بوو لەو کەسە دەگمەنانەی شارەکە، کە لە جەرگەی ڕۆژە پڕ ترس و سامناکەکان، ترس تەنگەتاوی نەکردبوو و خۆی لە گوورە نەبردبوو. بەڵام ئیتر ئەو بارە بەشێوەیەکی سەرنجراکێش گۆڕا. لە کاتێکدا خەڵکی شار هەموو خەریکی ئاهەنگگێڕان و فەرامۆشکردنی ڕۆژانی پڕ ترس و ناخۆشی بوون، وەک ئەوەی بکوژەکەیان گرتبێت و لەسێدارەیان دابێت، ترس و سام وەک ژەهرێکی کوشندە گەڕایەوە دەروونی ئەنتۆن ریچ. کاتێکی زۆر نەیدەویست خۆی بخاتە ژێر باری ئەو ترسەو، خۆی لە سەفەرکردن دەدزییەوە، حەزی نەدەکرد کە ماڵەکەی بەجێبهێڵێت، هەوڵی دەدا سەردان و دانیشتنەکانی کورت بکاتەوە، بۆ ئەوەی زوو زوو بگەڕێتەوە ماڵەوە. داوای لێبوردنی دەکرد، لەوەی کە هەست بە هیلاکی و نارەحەتی دەکات، دانی بەوەدا دەنا، کە ئەویش وەک هەر باوکێکی هاوتەمەنی خۆی کەمێک لە خەمی کچەکەیدایە، ئەمەش خەمێکی ئاساییە... چما ناوبانگی جوانی کچەکەی بڵاونەبووەوە؟ چما ڕۆژانی یەکشەممە کاتێک کچە دەچوو بۆ کڵێسا، خەڵک چاوی بۆ نەدەسووڕاند؟ چما هەندێک لە ئاغایانی ئەنجوومەن، بۆ خۆیان یان بۆ کوڕەکانیان خۆیان لێ خۆش نەکردبوو...؟

## ٤٢

بەڵام پاشان لە رۆژێکی مانگی مارتدا، کاتێک جەنابی ریچ لە دیوەخانەکەی دانیشتبوو، لاورا چووە دەرەوە بۆ ناو باخچەکە، کراسێکی شینباوی لەبەردا بوو، قژە سوورەکەی بەسەردا شۆڕ ببووەوە، لەبەر تیشکی رۆژ دەبریسکایەوە، ریچ هەرگیز کچەکەی خۆی وا جوان نەدی بوو، چوو بۆ باخچەکەو لە پشتی پەرچینێک لەبەرچاوان ون بوو. تەنها ماوەی دوو لێدانی دڵ ریچ چاوەڕوانی کرد، تا کچە دیسان دەرکەوتەوە، وەختا بوو لە ترسان زارەترەک بێت، چونکە بە درێژایی ماوەی دوو لێدانی دڵ، وای هاتە خەیاڵ، کە ئیتر بۆ هەمیشە کچەکەی لەدەست چوو.

لە هەمان شەودا بوو، بە خەونێکی زۆر ناخۆش لە خەودا راچەنی و واگا هات. نەیدەتوانی ناواخنی خەونەکەی بهێنێتەوە یادی خۆی، بەڵام خەونەکە پەیوەندی بە لاوراوە هەبوو، بە پەڵەپروزێ خۆی گەیاندە ژوورەکەی، دڵنیابوو لەوەی کە کچەکەی گیانی لەدەستداوە، بە کوژراوی لەسەر جێگاکەی کەوتووە، هەتک کراوە، مووەکانی بڕاوە، بەڵام کە چووە ژوورەوە دیتی کچەکەی ساغ و سەلیمە.

گەڕاوە سەر جێ خەوەکەی، هەموو جەستەی نقوومی ئارەق ببوو، لە تەنگەتاویدا وڕ ببوو، نەخێر نەک لەبەر تەنگەتاوی، بەڵکوو لە ترسان، ئیتر کاتی ئەوە هاتبوو دان بەوەدا بنێت، کە ترس بەسەریدا زاڵ بووە، ئەوجا کە دانی بەوەدا نا، هەستی بە ئارامییێک کرد، مێشکی ساف بووەوە. ئەگەر ئەو فێڵی لە خۆی نەکردبایەو لەگەڵ خۆی راست بووایە، هەر لە سەرەتاوە ئەو باوەڕی بە نەفرەتی قەشایەتیی نەبوو، هەروەها باوەڕیشی بەوە نەبوو، کە ئێستا بکوژەکە لە شاری گرێنۆبل دەسووڕێتەوە، ئەسڵەن هەر باوەڕی بەوەش نەبوو، کە شارەکەی ئەوانی بە جێهێشتووە. نەخێر، هێشتان ئەو لێرە دەژی، لە نێوان گراسییەکان، هاکە دیسان دەستی وەشاندەوە. لە مانگی ئاب و ئەیلوول ریچ بە چاوی خۆی هەندێک لە کچە کوژراوەکانی دیتبوو. دیدەنی کچەکان کاریگەرییێکی ترسناکییان لێ کردبوو، لە هەمانکاتدا، وەک بە ناچاری دانی پێدا دەنا، بەم دیمەنانە سەری سوڕ مابوو، چونکە هەموو کچە کوژراوەکان یەک لەیەکتری جوانتر بوون و هەر یەکێکییان جوانی تایبەتی خۆیان هەبوو. هەرگیز بیری لەوە نەکردبووەوە، کە لە شاری گراسدا ئەو هەموو جوانییە هەیە. بکوژەکە چاوی ئەمی واڵا کردبووەوە، دەبێت ئەو بکوژە زەوقێکی زۆر تایبەتیی

هەبێت، ئەندازەگیرییەکی تایبەتی خۆی هەبێت. نەک هەر بەتەنها کوشتنەکان هەموو بە شێوازێکی ڕێکخراو پیادەکرابوون، بەڵکوو هەڵبژاردنی قوربانییەکانیش ئەوەی ئاشکرا دەکرد، کە مەبەستێکی ئابووری نەخشەبۆکێشراو لە پشتی ئەم تاوانانەیە. راستە ریچ نەیدەزانی، کە بکوژەکە چ ئارەزووێکی لە قوربانییەکانی دابینکردووە، چونکە نەیتوانیوە باشترین شتی قوربانییەکان: جوانییەکانییان، لەززەتی لاوێتییانی لێ بفڕێنێت... یاخود، کردوویەتی؟ هەرچۆنی بێت، ئەگەریش نا مەنتیقی بێت، ئەو وای بۆ دەچوو کە بکوژەکە خاوەنی بیرێکی تێکدەرانە نیە، بەڵکوو کەسێکە بە دوای شت کۆکردنەوە سەودایە. ریچ وا بیری دەکردەوە: ئەگەر مرۆڤ وەک تاکە تاکەی کەسەکان تەماشای کوژراوەکان نەکات، بەڵکوو وەک بەشەکانی ئامانجێکی بەرز بیانهێنێتە بەرچاوی خۆی و بە شێوازێکی ئایدیایی سیفاتەکانی هەر یەکێکیان وەک پارچەی یەکایەتییێکی گشتیی لێکتر بتاوێنێتەوە، ئەوسا دەبێت وێنەی بەرەنجامی ئەو مۆزاییکە، وێنەیەکی رەهای خودی جوانیی بێت، ئەوسا سیحری ئەو جوانییە چیتر سیحرێکی ئادەمیی نیە، بەڵکوو سیحرێکە لە جۆری یەزدانیی. (وەک دەبینین، ریچ مرۆڤێک بوو، بە رۆشنی بیری دەکردەوە، باکی بەوەش نەبوو کە بەرەنجامی بیرکردنەوەکانی خۆ لە قەرەی خودا بدات، ئەگەریش ئەو بە رێگای بۆنەکان بیری نەدەکردەوە، بەڵکوو بە بینینی ئەگەرەکان بەرەنجامگیریی دەکرد، لەگەڵ ئەوەش زۆر لە راستی نزیک کەوتبووەوە.)

ریچ ئاوا بیری کردەوە: کەوابوو دەبێت مەسەلەکە ئاوا بێت، ئەو بکوژە کۆکەرەوەیەکی وا بێت، کە خووی دابێتە کۆکردنەوەی جوانییەکان و کار لە پێناوی هێنانە ئارای نیگارێکی رەها بکات، دەبێت تەنها کەوتبێتە ناو ئەندێشەی مێشکی نەخۆشی خۆی، دواتر دەبێت ئەو پیاوە کەسێک بێت خاوەنی بەرزترین زەوق بێت و بە وردی و بە تەواوی کارەکەی راپەڕێنێت، جا بەراستیش هەر ئاوا دەردەکەوت، کەواتە ناتوانرێت وا دابنرێت، کە ئەو پیاوە دەست لە بەنرخترینی ئەو بەردانە هەڵدەگرێت که بۆ تەواوکردنی نیگارەکەی لەسەر سەرزەوی هەن و پێویستن: واتە جوانیی لاورا. چونکە بێ جوانیی لاورا ئەو نیگارەی کە تا ئێستا ئافراندوویەتی، نرخێکی نیە. دەبێت لاورا بەردی کۆتایی تەواوکردنی خانووەکەی بێت.

کاتێک ریچ گەیشتە ئەو بەرەنجامگیرییە سامناکە، بە جلی خەو لەسەر تەختەکەی دانیشتبوو، سەری لەوە سوڕما، کە بە گەیشتن بەو ئاکامە هەستی بە ئارامبوونەوەی خۆی کردو لەرز و موچڕکەکەی کۆتاییان هات. ترسە نامۆکەی، کە چەندین هەفتە بوو بەرۆکی گرتبوو، نەماو، لە ناو یەقینبوونی مەترسییێکی ناسراو و دیاردا ڕەویەوە: بیر و ئامانجی بکوژەکە بە تەواوی ئاشکرا بوو،

کە هەر لە سەرەتاوە ئاراستەکەی بەرەو لاورا هاتبوو. هەموو کارە بکوژییەکانی تری ئامادەکاری و خۆشکردنی ڕێگە بووە، بۆ گەیشتن بەو دوا تاجی کوشتنە. ڕاستە هێشتان دیار نەبوو، کە ئەو بکوژە کەوتبووە دوای چ ئامانجێکی ماددی، یان ئایا چ قازانجێکی ماددی لەم کوشتنانەدا هەبوو، بەڵام ڕیچ دەرکی بە گرنگترین لایەنەکانی کاری بکوژەکە برد،  واتە کارێکی نەخشەبۆکێشراو و ئامانجێکی نموونەیی. جا هەرچەند قووڵتر بیری لێ دەکردەوە، باشتر بەرەنجامگیریەکانی خۆی پەسند دەکردو، پایەی خۆی لای بکوژەکە باڵاتر دەدیت، پایەیەک وەک ئەوەی لە ئاوێنەیەکی سافەوە تیشک بداتەوە خۆی، چونکە هەر نەبێت  ئەمە ئەم خۆی بوو، ڕیچ، کە توانی بە هۆی ئەقڵی تیژ و شیکردنەوەیەکی وردبینانە، پەردەی نهێنی لەسەر دوژمنەکەی خۆی لا بدات.

ئەگەر بێت و ڕیچ بۆ خۆی بکوژێک بووایەو کەڵکەڵەی ئەشقی هەمان بیری بکەوتبایە سەر، ئەوا ئەویش نەیدەتوانی شتێکی تری جیاواز بکات، لەمەی ئەم کە تا ئێستا کردوویەتی، ئەویش وەک ئەم بکوژە هەموو هەوڵێکی لە پێناوی ئەوەدا خەرج دەکرد، کە کارە شێتانەکەی خۆی بە کوشتنی لاورای جوان و بێ وێنە کۆتایی پێ بهێنێت.

ئەو بیرەی دوایی خۆی، بە تایبەت لەلا زۆر پەسند بوو. بەوەی دەیتوانی بە خەیاڵ خۆی بخاتە جێگەی بکوژی دوارۆژی کچەکەی، خۆی زۆر باڵادەستتر دەدیت لە بکوژەکە. چونکە ئەو لەمە دڵنیا بوو، کە بکوژەکە بە هەموو زیرەکیی و بلیمەتیی خۆیەوە توانای ئەمەی نەبوو، خۆی بخاتە جێگەی ڕیچ، هەر نا لەبەر ئەوەی بکوژەکە نەیدەتوانی سۆسەی ئەوە بکات، کە ڕیچ دەمێکە خۆی خستۆتە جێگەی ئەو. لە بنچینەدا ئەمە هیچ جیاوازییێکی نەبوو لەگەڵ سەوداکارییەکانی تری ژیان، جگە لە چەند گۆڕانکارییێکی پێویست. ئەگەر کەسێک لە پێشبڕکێیەکدا مەبەستەکانی بەرامبەرەکەی بزانێت، ئەوا بەسەریا زاڵ دەبێت و ڕێگەی نادات لێی بباتەوە. ئەگەریش ئەو کەسە ناوی ئەنتۆن ڕیچ نەبێت و لە هەموو ئاوێکیشی نەدابێت و خووی ململانێشی نەبێت. خۆ لە خۆڕا نەبوو، کە ببوو بە خاوەنی گەورەترین بازرگانی عەتری فەرەنساو سامانیکی زۆر و زەوەند و پایەی دووەمی نوێنەرایەتی دەوڵەت، بەڵکوو ئەمەی هەموو بە خەبات و ململانێ بەرکەوتبوو، چونکە ئەو هەمیشە لە کاتی خۆیدا پەی بە مەترسییەکان بردبوو، زیرەکانە نەخشەی بەرامبەرە دژەکانی خۆی ئاشکرا کردبوون و کۆسپ و بەرهەڵستی خستبووە ڕێگەیان. هەر بەو شێوەیەش دەگاتە ئامانجەکانی داهاتووشی، واتە دەسەڵات و خانەدانی و وەچەنانەوە. بە هەمان شێوەش نەخشەی بکوژەکە تێکوپێک دەدات، نەخشەی دژەکەی بۆ دەستبەسەرداگرتنی لاورا، ئەگەر هەر تەنها لەبەر ئەوەش بێت، کە لاورا بۆ ڕیچ خۆشی، دوابەردی خانووی نەخشەکانیەتی. ڕاستە ئەو زۆریشی خۆش دەوێت،

بەڵام ئەم پێویستیشی بەم کچە هەیە، بۆ بەدیهێنانی بەرزترین ئامانجەکانی، بۆیەشە ڕێگا نادا هیچ کەسێک ئەمەی لێ بستێنێت، ئامادەیە بە ددان و بە چنگەکانی پارێزگاری لێ بکات.

پتر هەستی بە ئاسوودەیی کرد. دوای ئەوەی توانی بیرکردنەوەی شەوانی خۆی لە ململانێی دژی دێوەکە، دابەزێنێتە ئاستی ململانێیەکی بازرگانیی، هەستی کرد، کە چۆن ئازایەتییێکی تازە، ئازایەتییێکی زاڵ زایە ناو دەمارەکانی. ئەو ترسەی مایبوو نەما، گومان و باوەڕبەخۆنەبوون، خەم و پەرۆشیی، کە وەک لەرزشی کاتی پیریی ئازاریان دەدا، گومبوون، تەمی سۆسەکردنە تاریکەکانی ڕەوینەوە، کە چەندین هەفتە بوو بە لەپەکوتێ بە ناویاندا سەرگەردان ببوو. هەستی بە دڵنیایی کرد و باوەڕی بە خۆی پەیداکرد، کە دەتوانێت خۆی لە قەرەی هەموو بەربەرەکانێیک بدات.

## ٤٣

به لەشێکی سووک و تا رادەیەک ئاسوودە قەڵەمبازێکی داو لەسەر تەختەکەی هاتە خوارەوە، پەتی زەنگەکەی راکێشاو خزمەتکارە نیوەخەوتووەکانی هاتن، فەرمانی پێ دان کە جلوبەرگ و ئازووقە بپێچنەوە، چونکە دەیەوێت لەگەڵ شەبەقی رۆژ خۆی و کچەکەی بەرەو شاری گرێنۆبل سەفەر بکەن. ئەوجا خۆی گۆڕی و هەموو بەردەستەکانی تری لە جێگەی خەو راپەڕاند.

لە نیوەی شەودا ئەو خانووەی سەر شەقامی درۆیت واگا هات و کەوتە ژیانێکی چالاک پڕ کار. ژنەکان ئاگری ئاشپەزخانەیان هەڵایساند، لە ڕاڕەوەکان خزمەتکارەکان بە تەنگەتاوی و بەپەلە دەهاتن و دەچوون، نۆکەرەکان بە پلیکانەکان هەڵدەگەڕان و دەچوونە خوارەوە، لە بن گومەزەکانی ژێرزەمین تەق و هۆڕی کلیلی سەرکار دەهات، مەشخەڵەکانی حەوشە دەتریسکانەوە، مەیتەرەکان بە دەوری ئەسپ و ماینەکان رایان دەکرد، هەندێکی تر لە تەویلەکان وڵاخیان ئالیک دەدا، جلەو و لغاویان دەکردن، زینیان دەکردن، ئامادەیان دەکردن و باریان دەکردن، دەتگوت شاڵاوی دوژمن بە ڕێگەوەیە، خاوەن ماڵ بە پەلەپرووزێ و بە تەنگەتاوی خەریکی هەڵاتنە. بەڵام شتی وا لە ئارا نەبوو! خاوەن ماڵ دەتگوت مارشالی فەرەنسایە، لە ژووری خۆی بە ئارامی لەسەر مێزی نووسینەکەی دانیشتبوو، شیرقاوەی دەخواردەوەو فەرمانی بەسەر نۆکەر و دەستوپێوەندەکانی دابەش دەکرد. لا بە لاش نامەی دەنووسی بۆ پارێزگاری شار، بۆ قونسوڵی پلە یەک، بۆ دادنووسەکەی، بۆ پارێزەرەکەی، بۆ سەرکاری بانکییەکەی لە مارسێی، بۆ بارۆن دێ بۆیۆن و بۆ چەندین لە هاوکارە بازرگانەکانی.

لە کاتژمێر شەشی بەیانی هەموو کاروبار و راسپارەدکانی خۆی تەواو کرد و هەموو پێویستییەکانی نەخشەکەی ئامادەکرد. دوو دەمانچەی بچووکی سەفەری خستە باخەڵی خۆی و، کیسەی پارەی لە خۆی گرێ داو مێزی نووسینەکەی داخست. ئەوجا چوو بۆ واگا هێنانی کچەکەی.

کاتژمێر هەشتی بەیانی کاروانی سەفەرەکەی کەوتە جووڵە. ریچی سوار خۆی بە پێش کەوت، سەڵتەیەکی رەنگ سووری شەرابی، کە بە زێڕ چنرابوو، پاڵتۆیەکی ڕەش، شەبقەیەکی رەش کە بە پەڕەمووچە رازابووەوە، زۆر پۆشتەو پەرداخ دەهاتە بەرچاو. کچەکەی لە دواوەی دەرۆیشت،

جلوبەرگێکی سادە، بەڵام ئەوەندە جوان، کە ڕێبواری سەر جادەکان و خەڵکی بەرپەنجەرەکان هەموو تەنها تەماشای ئەویان دەکرد. خەڵکی دەچوونە ناو ئاپۆرەکەو خۆیان بۆ دەچەماندنەوەو شەبقەی خۆیان لەسەر دەکردەوە، وایان پێشان دەدا کە ئەمە بۆ ریچی قونسوڵی پایە دووی شارە، بەڵام لە ڕاستیدا بۆ  خاتوونی شازادە بوو. ئەوجا دواتر نۆکەر و پیاوەکانی خان هەموو بەخۆو بە ئەسپی بارکراو. چونکە ڕێگای گرێنۆبل هەمووی قۆرت و تاسە بوو، هی ئەوە نەبوو گالسکە بەکار بهێنن، دوایی کاروانەکە بە تاخمێک وڵاخی بارکراو بە هەموو جۆرە کەرەسەیەکی پێویست کۆتایی دەهات، کە لەلایەن دوو نۆکەرەوە چاودێری دەکران. لە دەروازەی کۆرس پاسەوانەکان دەستبەچەک ئامادەباشیان پێشانداو، کە دوا وڵاخ تێپەڕی ئەوجا چەکەکانیان لە شان هێنا خوارەوە. منداڵان تا ماوەیەکی زۆر بە دوایاندا رایان کرد و دەستییان بۆ دوایی کاروانەکە رادەوەشاند، کە هێدی هێدی بە ڕێگا لێژ و پێچاوپێچەکان دووردەکەوتەوە.

سەفەرەکەی ئەنتۆن ریچ و کچەکەی کاریگەرییێکی قووڵ و سەیری لە خەڵکەکە کرد. وەک ئەوە وا بوو کە لە مەراسیمی قوربانیدانێکی ئارشیایی سەردەمانی کۆن بەشداریان کردبێت. قسە کەوتە سەر زاران کە ریچ سەفەری کردووە بۆ شاری گرێنۆبل، واتە بۆ ئەو شارەی کە لەم دواییەدا جانەوەرە کچ کوژەکەی لێ دەژیا. خەڵک نەیاندەزانی ئەمە چۆن ببینن و چۆنی لێکبدەنەوە. ئەوەی ریچ کردبووی، نەزانینێکی نابەرپرسانەو سزابار بوو، یان ئازاییەکی سەرسوڕهێنەر؟ ئایا ئەوە ڕوبەڕوبوونەوەی جەنگ و ململانێ بوو، یان ئارامکردنەوەیەکی  خوداکان؟ هەموو سۆسەی ئەوەیان دەکرد، کە ئەوە دوا جاریان بوو، کچە جوانە قژ سوورەکە ببینن، بەڵام نەیان دەزانی لەبەرچی، سۆسەی ئەوەیان دەکرد، کە ئیتر بۆ هەمیشە لاورای ریچیان لەدەستچوو، جارێکی تر نایبیننەوە.

ئەو سۆسەکردنەیان دەبووایە ڕاست دەربچێت، هەرچەندە لەسەر بنچینەی هەلومەرجی هەڵە بنیاتنرابوو. سەفەرەکەی ریچ بۆ شاری گرێنۆبل نەبوو، کاروانە پڕ زەمزەمەو هەراکە جگە لە فێڵ و چاوبەستەکێ  شتێکی تر نەبوو. دوای میل و نیوێک لە سەرووی ڕۆژئاوای گراس، لە نزیک گوندی سانت ڤالیر کاروانەکە وەستا. ریچ وەکالەتنامەو ڕاسپاردەکانی دایە دەست نۆکەرەکانی و فەرمانی پێ دان، کە بە تەنها کاروانی وڵاخەکان لەگەڵ خزمەتکارەکان بەرەو شاری گرێنۆبل ببەن.

خۆی و لاوراش لەگەڵ کارەکەرەکەی ڕوویان لە کابریس کرد، بۆ ئەوەی لەوێ پشووی نیوەڕۆ بدەن، ئەوجا بەناو بەرزایی شاخەکانی تەنێرۆن بەرەو باشوور لێیان خوڕی. ڕێگاییێکی تابڵێی سەخت و دژوار بوو، بەڵام بەم ڕێگایە دەیانتوانی خۆیان لە گراس و دۆڵی گراس لابدەن و تا ئێوارە، بێ ئەوەی بناسرێنەوە، بگەنە کەناری دەریا... نەخشەی ریچ وا بوو، کە بۆ ڕۆژی دوایی

خۆ بگەیەننە دورگەکانی لێرین و بچن بۆ دێرە بچووکەکەی سانت هۆنۆرات، کە لەلایەن کۆمەڵە قەشەیەکی پیر بەڕێوەدەبردرا، بەڵام هێشتان توانای پارێزگارییان لە دێرەکە هەبوو. ریچ لەگەڵ ئەمانە ئاشنایەتییێکی کۆنینەو باشی هەبوو، چونکە چەندین ساڵ بوو هەموو بەرهەمەکانی ئەو دێرەی لە دۆشاوی کاڵەبتۆز و ناوکەکاژ و  رۆنی سەروو دەکڕیەوە. ریچ بیری کردەوە، کە هەر ئەوێ، دێری سانت هۆنۆرات، لە تەنیشت بەندیخانەی شاتوێ دیف و زیندانی ئی سانت مارگرێت دڵنیاترین و ئەمینترین شوێنی ناوچەکەیە بۆ ئەوەی جارێ کچەکەی لێ حەشار بدات. بەڵام خۆی نیازی وا بوو یەکسەر بگەڕێتەوە سەر وشکانی، بۆ گراس. دەیویست بە رێگای ئەنتیب و کاگنێس بەرەو رۆژهەڵات باداتەوە، بۆ ئەوەی هەر لە هەمان ئێوارەدا بگاتەوە ڤێنس. پێشتر دادنووسەکەی راسپاردبوو، کە لەگەڵ بارۆن بۆیۆن رێکبکەوێت، کە لەوێ یەکتری ببینن بۆ ئەوەی لاورای کچی لە ئالفۆنسی کوڕی بارۆن مارە بکەن. ئەو وای دانا بوو، کە پێشنیارێک بخاتە بەردەم بارۆن، کە هی ئەوە نەبوو رەتی بکاتەوە: چل هەزار لیرەی قەرزی بارۆن بخاتە ئەستۆی خۆی، ئەوەندەش پارەی مارەیی، چەند پارچە زەمینێک و ئاشێکی رۆن لە ماگنۆس، هەروەها مووچەیەکی خانەنشینی ٣٠٠٠ لیرەیی بۆ بووک و زاوای لاو.  تاکە مەرجی ریچیش ئەوە بوو، کە لە ماوەی دە رۆژدا ئاهەنگی زەماوەند بگێڕدرێ و کچە بگوازرێتەوەو دواییش بووک و زاوا لە خانووەکەی ڤانس نیشتەجێ ببن.

ریچ دەیزانی، بۆ بە خێراکردنی پەیوەستکردنی ماڵەکەی خۆی بە ماڵی بۆیۆن نرخێکی لە رادەبەدەر ناهاوسەنگی پێشنیار کردووە. ئەگەر بهاتبا چاوەڕوانی کردبایە، دەیتوانی زۆر هەرزانتر بگاتە ئەو مەرامە. ئەوسا بارۆن بە خۆشییەوە دەهاتە داخوازی کچی بازرگانێکی وا گەورەی وەکوو ئەو بۆ کوڕەکەی، چونکە رۆژ دوای رۆژ جوانی لاورا گەشەی دەسەند،  سامانی ریچ پتر دەبوو، باری دارایی بارۆن بۆیۆنیش هەر خراپتر دەبوو.  بەڵام مەسەلەکە شتێکی تر بوو! لەم بازرگانییە ئەوە بارۆن نەبوو کە ریچ سەودای لەگەڵدا دەکرد، بەڵکوو بکوژی نەناسراو بوو. لای ریچ ئەوە گرنگ بوو کە سەوداو نەخشەی بکوژەکە تێکبدات. ژنێکی شووکردوو، کە کچێتیی لە دەستدابێت، یان لەوانەیە زگپڕ کرابێت، ئیتر بە کەڵکی پێشانگا  نایابەکەی بکوژ نایەت. لەوانەیە دوا بەردەکەی ئیتر کوێر ببێتەوەو لەبەینبچێت، ئیتر لاورا بۆ بکوژەکە هیچ نرخێکی نەمێنێت، کارەکەی سەرنەکەوێت. بکوژ دەبێت ئەو بەزینەی خۆی بە چاوی خۆی ببینێت! ریچ دەیویست زەماوەندەکە لە شاری گراس بە ئاهەنگێکی گەورەو بە ئاشکرا ساز بکات. ئەگەریش ئەو هاوسەودا دژەکەی نەدەناسی و لەوانەش بوو هەرگیز پێی ئاشنا نەبێت،  بەڵام ئەوە بۆ ئەم خۆشییەک بوو، کە بزانێت، هاوسەودا دژەکەی بە چاوی خۆی دەبینێت، کە خۆشەویسترینی کچەکانی لەبەر چاوی خۆیدا، لێ دەفرێنن.

نەخشەکە زۆر ورد بیری لێ کرابووەوە. ناچارین جارێکی تر سەرمان لە زیرەکی ریچ سورپبمێنێت، کە چەندە لە راستیی نزیک کەوتبووەوە، چونکە ئەمە راست بوو، زەماوەندی لاورا لە کوڕەکەی بارۆن بۆیۆن، مانای هەرەسێکی لەناوبەر دەبوو بۆ کچکوژەکەی شاری گراس. هێشتان ریچ کچەکەی نەگەیاندبووە ژێر سەیوانی رزگاری. هێشتان نەیگواستبووەوە بۆ دێری ئاسایش و دڵنیاگەی سانت هۆنۆرات. هێشتان سێ سوار بە پشتی ماینەکانیان بە ناوچە شاخاویە رووتەنییەکانی تانێرۆن بەڕێگەوە بوون. هەندێ جار رێگاکە ئەوەند دژوار بوو، دەبووایە لە وڵاخەکانییان دابەزن. هەموو کارەکان زۆر هێواش دەچوونە پێشەوە. ئاواتەخوازی ئەوە بوون دەوروبەری ئێوارە بگەنە دەریا، لای ناپۆلی، کە ئاواییێکی بچووک بوو لە رۆژئاوای شاری کان.

## ٤٤

لەو ساتەوەختەی کە لاورا لەگەڵ ریچی باوکی شاری گراسیان بەجێهێشت، گرێنوی لەو سەرەکەی تری شار لە کارگەکەی ئارنۆلف خەریکی کەڵاندنی گوڵەنەرگس بوو. تەنها بوو، خۆشحاڵ بوو. کاتەکانی لە شاری گراس بەرەو کۆتایی دەچوو. رۆژی خۆشی و گەیشتنە مرازی نزیک کەوتبووەوە . بیست و چوار شووشەی بچکۆڵە لە ناو سندوقێکی بچووکی بە پەمۆ بەرگکراو لە ناو کۆختەکەی داندرابوون، ئەم شووشانە تنۆکی تریفەی بیست و چوار کچیان تێدا بوو، ئەمانە بە نرخترین پێکهاتەی عەتری بوون، کە لە ساڵی رابردوو بە رێگای ساردی چەوریی، بە بەکارهێنانی جلوبەرگ و قژەکان، ئەوجا بە دڵۆپاندن، دەستی کەوتبوون. ئەمرۆ نیازی وا بوو، کە بۆ بیستوپێنجەمین شووشە، بەنرخترین و گرنگترینیان، پێویستییەکان ئامادەبکات. پێشتر لەگەنێکی بچووکی بۆ ئەمە ئامادەکردبوو، بە چەندین چین چەوری پاراو چەوری کردبوو، ناسکترین پەڕۆی پێچان، شووشەیەکی گەورە لە باشترین جۆری کحوول، ئەمانەی بۆ ڕاوی دوا ماسی ئامادەکردبوو. شوێنگەی ڕاوی زۆر بە دیققەت دیاری کردبوو. شەوێکی تاریکەمانگ بوو.

دەیزانی هەموو هەوڵێک بۆ دزەکردن بۆ ناو کۆشکە پڕ پاسەوانەکەی شەقامی درۆیت کارێکی بێ مانایە، بۆیە دەیویست لە کاتی تاریکیی رۆژئاوابووندا، بەر لەوەی دەروازەکانی شار دابخرێن، لە پەنای بێ بۆنییەکەی خۆیدا، کە وەک تارایێکی سەرپۆش لە سەرنجی مرۆڤ و گیانەوەرەکان، دەیشارێتەوە، دزە بکاتە ناو کۆشکەکەو خۆی لە گۆشەیەکی خانووەکە حەشاربدات. دواتر کاتێک کە خەو هەمووان دەباتەوە، ئەوجا قیبلەنومای لووتی بە ناوتاریکاییدا رانمایی بکات تا دەیگەیەنێتە ژووری گەنجینەکەی. جا هەر لە ژوورەکەی خۆی و لەسەر جێگاکەی پەڕۆچەورەکانی لە جەستەی دەئاڵێنێت. تەنها قژ و جلەکانی، وەک کارەکانی پێشووی، لەگەڵ خۆی دەبات، چونکە دەتوانێ ئەمانە راستەوخۆ لە ناو گیانی شەرابدا بشواتەوە، ئەوەش کارێکە بە ئاسانی دەتوانێت لە کارگەکەدا بە ئەنجامی بگەیەنێت. پاشان بۆ کاری کۆتایی بەرهەمەکەی و هەڵماندنی بۆ دەستکەوتنی چڕاوەکەی شەوێکی تری کاری پێویستە. جا ئەگەر هەموو کارەکە باش بەرێوەبڕوات، کە هیچ هۆیێکیش نیە بۆ ئەوەی گومان لەمە پەیدا بکات، ئەوا

دوو سبەی دەبێتە خاوەنی هەموو پێکنەرەکانی باشترین عەتری دونیا، ئەوسا وەک دەوڵەمەندترین کەسی سەر زەوی، گراس بەجێدەهێڵێت.

بەرەبەری نیوەڕۆ لە کاری نەرگزکوڵاندن بووەوە. ئاگرەکەی کوژاندەوەو سەری مەنجەڵی چەورییەکەی داخست، لە کارگەکە چووە دەرەوە بۆ ئەوەی خۆی فێنک بکاتەوە. باێک لە رۆژئاواوە دەهات.

لەگەڵ یەکەمین هەناسە هەستی بەوە کرد کە شتێک تەواو نیە، شتهاییێک روویداوە. ئاووهەوای بە دڵ نەبوو. لە بەرگەهەوای شارەکە، لەو تارای بە هەزاران داو چنراوە، داوەمووە زێڕینەکە نەمابوو. لە کاتێکدا لەم چەند هەفتەی دواییدا، ئەو تاڵەمووە بۆنداره ئەوەندە بەهێز ببوو، کە گرێنوی لەو سەری شارەکەو لە ناو کۆختەکەی خۆی هەستی پێ دەکرد. ئێستا ئەو تاڵەبۆنە نەماوە، گوم بووە، تەنانەت کە بە چڕیش هەستی بۆنی خۆی ڕادەگرت، هەستی بە بوونی نەدەکرد. گرێنوی لە حەژمەتان لە شوێنی خۆی وشک هەڵگەڕا، وەک ئەوەی گۆد بووبێت.

دیارە مردووە، گرێنوی بیری کردەوە. پاشان لەوەش سامناک تر: یەکێکی تر دەستی خۆی پێشخستووە، بەر لەمن یەکێکی تر گوڵەکەی منی چنیوەو بۆنەکەی بۆخۆی بردووە! گرێنوی ئەوەندە داهێزرابوو، لە هاواری نەداو نەیقیژاند، بەڵام بەشی ئەو فرمێسکانەی هێزی بەبەرەوە مابوو، کە لە گۆشەکانی چاوی قەتیس مابوون و لە ناکاوێک بەملاو بەولای لووتی چۆڕانە خوارەوە.

لەو کاتەدا بوو، کە درۆت لە مەیخانەی کوڤاترێ داوفینەوە بۆ نانی نیوەڕۆ بەرەو ماڵەوە هاتەوەو گێڕایەوە کە ئەمڕۆ بەیانی زوو کۆنسوڵی دووەم و کچەکەی لەگەڵ کاروانێکی دوازدە وڵاخی بەرەو شاری گرێنۆبل سەفەریان کردووە. گرێنوی فرمێسکەکانی خۆی قوت دایەوە، بە ڕاکردن بە ناو شارەکەدا بەرەو دەروازەی کۆرس چوو. لە مەیدانی بەردەم دەروازەکە وەستا، هەستی خۆی راگرت و بۆنی کرد. لە ناو ئەو شنەبایەی کە لە رۆژئاواوە دەهات و هێشتان بە بۆنەکانی شار ئالوودە نەببوو، تاڵەبۆنە زێڕینەکەی خۆی دۆزییەوە، راستە تاڵەبۆنەکە زۆر باریک و بێهێز بوو، کەچی لەگەڵ ئەوەش دەناسرایەوە. بەڵام ئەو بۆنە خۆشەویستە لە سەرووی رۆژئاواوە نەدەهات، واتە لەسەر ئەو جادەیەی کە بەرەوە گرێنۆبل دەچوو، بەڵکوو لەلای ئاراستەی کابریسەوە دەهات، خۆ لە لای باشووری رۆژئاواوە، ئەوە هەر هیچ.

گرێنوی پرسیاری لە پاسەوانەکە کرد، کە کۆنسوڵی دووەم بە کام رێگادا چووە. پاسەوانەکە ئاماژەی بۆ باکوور کرد. ئایا بەرەو جادەی کابریس نەچوون؟ یان بەرەو جادەکەی تر، بەرەو باشوور، بەرەو ئۆرۆبیا و ناپۆلی دەچن؟ پاسەوانەکە گوتی، بە دڵنیایی نا! ئەو بە هەردوو چاوی خۆی ئەوانی دی، کە بەرەو کێ چوون.

گرێنوی بە ڕاکردن  گەڕایەوە ناو شار، چووە ناو کۆختەکەی، پەڕۆ و لەفاف و مەنجەڵی کرێمەکانی، پێچایەوە، چەمچەو مەقەس و کوتکە لووسە بچووکەکەی هەڵگرت، کە لە داری زەیتوون دروستکرابوو، هەمووی خستنە ناو توورەگەی سەفەر، بێ دواکەوتن کەوتە ڕێگا. ڕێگای گرێنۆبلی نەگرتە بەر، بەڵکوو ئەو ڕێگایەی هەڵبژارد، کە لووتی پێشانی دەدا: بەرەو باشوور.

ئەمە ڕێگاییێک بوو ڕاستەوخۆ دەچوو بۆ ناپۆلی، بە درێژایی دامێنی چیاکانی تانێرۆن، بە ناو چەمەکانی فرایێر و زیاگنێ. ئەمە ڕێگاییێکی خۆش بوو بۆ ڕۆیشتن. گرێنوی بە خێرایی دەڕۆیشت. کاتێک شاری ئۆرۆبیا لە بەرزایی شاخەکان بە دەرکەوت، هەستی خۆی ڕاگرت، بۆنی هەڵمژی، وەک بڵێی گەیشتبووەوە هەڵاتووەکان. کەمێک دواتر گەیشتبووە ئاستی ئەوان. ئێستا ئیتر بۆنی یەکە یەکەی دەکردن، تەنانەت بۆنی ئارەقی ئەسپەکانیشی دەکردن. ئەو پەڕی نیوە میلێک لە لای ڕۆژئاواوە دوور بوون، تەواو وەکو ئەم لە شوێنێکی ناو دارستانەکانی تانێرۆن. بەرەو باشوور، بەرەو دەریا دەچوون.

کاتژمێر پێنجی دوای نیوەڕۆ گرێنوی گەیشتە شاری ناپۆلی. چووە مێوانخانەکە. نانی خوارد و داوای شوێنێکی هەرزانی کرد. گوتی کە شاگردێکی دەباغچییەو لە شاری نیساوە هاتووەو بەرەو مارسێی دەچێت. گوتی بە تەویلەش ڕازیە. بەمجۆرە لە گۆشەیەکی تەویلە باری لێ خست و پشووی دا. بۆنی کرد، کە سێ سوارەکە نزیک دەبوونەوە. تەنها ئەوەی پێویستی پی بوو، ئەوە بوو کە هێشتان چاوەڕوانیان بکات.

دوو کاتژمێر دواتر، کە دنیا زۆر تاریک ببوو، گەیشتن. بۆ ئەوەی نەناسرێنەوە جلوبەرگی خۆیان گۆڕی. ئێستا دوو ژنەکە جلوبەرگی ڕەشیان لەبەردا بوو، لەگەڵ سەرپۆشێک، ریچ سەترەیەکی رەشی لەبەردا بوو. خۆی وەک خانێک ناساند، گوتی کە لە کاستێلەوە دێن و بەیانی دەیانەوێت بچن بۆ دورگەکانی لێرین و گەرەکە خانەخوێ مشووری بەلەمێکییان بۆ بخوات، دەیانەوێت لەگەڵ شەبەقی بەیان سەفەر بکەن. پرسی کە ئایا جگە لەمان مێوانی تر لە مێوانخانەکەدا هەن؟  خانەخوێ گوتی: تەنها شاگردێکی دەباغچی لە نیساوە هاتووە، لە تەویلەدا خەوتووە.

ریچ ژنەکانی ناردە ژوورەوە. خۆی چووە ناو تەویلەکە بۆ ئەوەی شتێک لە ناو باری سەر پشتی ئەسپەکەی بهێنێت، وەک خۆی گوتی. لە سەرەتا شاگردە دەباغچییەکەی نەدۆزیەوە، ناچار بوو فانوسیک لە مەیتەرەکە وەربگرێت. ئەوجا دیتی شاگردەکە لە گۆشەیەکی تەویلەکە لەسەر چەرچەفێکی کۆن پاڵکەوتووە، سەری بە توورەگەی سەفەرەکەی کردووەو بە قووڵی خەوی لێ کەوتووە. ئەوەندە بێ نموود و نابەرچاو دیار بوو، ماوەیەک ریچ خەیاڵی بۆ ئەوە چوو، کە ئەو کوڕە وەک نەبوو بێت، وا بوو، تەنها تارمایی سێبەرەکەی لەبەر تیشکی فانۆسەکە بە لێلی بە

دەردەکەوت. هەرچۆنی بوو ریچ لەوە دڵنیا بوو کە ئەوە بوونەوەرێکی بێ وەیەو بە هیچ جۆرێک جێگەی هیچ مەترسییێک نیە، ئیتر بە ئەسپایی لێی دوورکەوتەوە، نەبادا لە خەوی بکات، گەڕایەوە ناو میٚوانخانەکە.

نانی شێوانی لەگەڵ کچەکەی لە ژوورەوە خوارد. پێشتر مەبەست و ئامانجی سەفەرەکەی بۆ کچەکەی باس نەکردبوو، ئێستاش هەر باسی نەکرد، هەرچەندە کچەکەی داواشی لێ کرد. پێی گوت کە سبەینێ بۆی باس دەکات، کچەکەی دڵنیا کرد، کە هەر کارێکی دەیکات و هەر نەخشەیەکی دایدەنێت، هەمووی بۆ بەرژەوەندی و بەختەوەری دوارۆژی ئەوە.

دوای نانخواردن چەند دەستێک یاری کارتیان کرد و ریچ هەموو یارییەکانی دۆڕاند، چونکە ریچ لە جیاتی تەمەشای کارتەکان بکات، بەردەوام تەمەشای رووی کچەکەی دەکرد، بۆ ئەوەی ئیلهام لە جوانیەکەی وەربگرێت. دەوروبەری کاتژمێر نۆی شەو کچەکەی بردە ژووری خەوەکەی، کە بەرامبەر ژوورەکەی خۆی بوو، ماچی کرد و شەوباشی لێ کرد، لە دەرەوە دەرگاکەی کلیل دا. ئەوجا خۆشی چووە سەر تەختی خەوەکەی.

بە هۆی سەفەری ئەم رۆژەو شەوی رابردوو بە جارێک خەستەو ماندوو ببوو، لە هەمان کاتدا هەستی بە خۆشحاڵییێکی زۆر دەکرد بەو سەفەرەی. بێ ئەوەی کەمترین خەم و پەرۆشی لە دڵدا هەبێت، بێ هیچ سۆسەو گومانێکی ناخۆشی وەک شەوانی رابردووی، کە هەمیشە لە دوای چراکوژاندنەوە یەقەیان دەگرت و ئازاریان دەداو لە خەویان دەکرد، خەوی لێ کەوت، نووست، بێ ئەوەی هیچ خەونێک ببینێت، بێ پرخە، بێ ڕاچەنین، بێ گرژبوونی دەمارەکانی، بێ خۆ وەرگێڕان و خۆ سووڕاندن، دوای دەمێکی درێژ، ئەوە یەکەمین جار بوو ریچ ئاوا ئارام و قووڵ بخەوێت.

لە هەمان کاتدا بوو گرێنوی لە جێگەکەی لە ناو تەویلە هەستایەوە. ئەویش هەستی بە ئاسوودەیی دەکرد و بە بەرەنجامی سەفەرەکەی خۆشحاڵ بوو، بە تەواوی هەستی بە تازەبوونەوەی خۆی دەکرد، هەرچەندە بۆ چرکەیەکیش خەو نەچووبووە چاوی. کاتێک ریچ هاتە ناو تەویلەکە، بۆ پشکنین، خۆی وا پیشاندا کە خەوتووە، بۆ ئەوەی خۆی بێ وەی تر پێشانبدات، لەو بێ وەیییەی کە بەهۆی بۆنە سەرنجبڕەکەی، لێی بەدیار دەکەوت. بە پێچەوانەی ریچ، ئەو بە هۆی هێزی لووتی زۆر بە وردی سەرنجی دایە ریچ، زۆر چاک دەرکی بەوە برد، کە گومان و پەرۆشی ریچ سەبارەت بە بوونی ئەو لە تەویلە، نەماو لەبەینچوو.

بەو جۆرە هەر دوو لایان بەو دیتنە خێرایەی یەکتری، بە نادروستی و دروستی، هەڵەو راست، لە یەکتری دڵنیابوون و تێگەیشتن کە زیانیان بۆ یەکتری نیە،. ئەوەش بۆ گرێنوی شتێکی باش بوو، چونکە ئەو بێ وەییە رووکەشییەی گرێنوی و بێ زیانییە راستییەی ریچ کاری گرێنویان ئاسان کردو، بە پێچەوانەش بۆ ریچ.

## ٤٥

بە شێوەیەکی زۆر وەستایانە گرێنوی دەستی بە کارەکەی کرد. توورەگەی سەفەرەکەی کردەوە، پەڕۆکان و کرێمی چەوری و چەمچەی لێ دەرهێنا، پەڕۆکانی لەسەر رایەخەکەی راخست، دەستی کرد بە هەڵسوونی چەوریەکە لە پەڕۆکەکان، ئەمە کارێک بوو کاتی گەرەک بوو، چونکە دەبووایە چینی چەورییەکە لە هەندێ شوێن ئەستوور و لە هەندێ شوێن تەنک بێت، بە پێی شوێنەکانی جەستە، پەڕۆ چەورەکانی دابەش دەکرد و بە جیاوازی چەوری تێ هەڵدەسوون. چونکە دەم و بن هەنگڵ، سنگ و ئەورەت، پێیەکان، پتر لە لوولاق و پشت و ئانشک بۆن پێشکەش دەکەن، ناولەپی دەست پتر لە پشتەدەست، برۆ پتر لە برژانگ...هتد، بۆیە پەڕۆی ئەو شوێنانە دەبووایە پتر چەوریان خرابایە سەر. گرێنوی وێنەیەکی رۆشنی جەستەی لەبەرچاو بوو، بەم پێیەش پەڕۆچەورەکانی ئامادەدەکرد، ئەو لە هەمووان پتر چێژی لەو بەشەی کارەکەی وەردەگرت، چونکە ئەمە کارێکی هونەری بوو، کە بیر و ئەنێشەو دەستەکانی پێکەوە خەریک دەبوون، سەرەڕای چێژی ئەو دوائەنجامەی کە چاوەڕوانی دەکرد، کە بە شێوەیەکی نموونەیی پێشبینی بۆ دەکرد.

کە هەموو چەوری مەنجەڵە بچووکەکەی بەکارهێنا، لێرەو لەوێ هێشتان کاری لەسەر دەکرد، لە شوێنێ چەوری هەڵدەگرت و لە شوێنێکی تری هەڵدەسوویەوە، چەوریەکەی جوان پەرت دەکرد و هاوسانی دەکردن، جارێکی تر تەمەشای دیمەنی چەوریەکەی دەکردەوە، بێ گومان بە لووت، نەک بە چاو، چونکە تەواوی ئەو کارانەی لە تاریکییێکی ئەنگوستەچاو بە ئەنجام دەگەیاندن، ئەوەشیان هۆییێکی تر بوو، بۆ ئەوەی گرێنوی بە زەوقێکی هاوسەنگ و ئاسوودە کارەکەی جێبەجێبکات. لەم شەوە تاریکەمانگەدا هیچ شتێک نەبوو کە مژوولی بکات و زەینی لە کارەکەی دوور بکاتەوە. جگە لە بۆن و دەنگی شەپۆلەکانی دەریا لەو دونیایەدا شتێکی تر نەبوو. ئەو لە کارەکەی خۆیدا تووا بووەوە. ئەوجا پەڕۆ چەورەکانی هەموو کۆکردەوە، بە شێوەیەک خستنیە سەر یەک، کە لا چەورەکانیان بکەوێتە سەر یەکتری. ئەمەیانی لا کارێکی دژوار بوو، چونکە چاک دەیزانی، هەرچەندیش بە ئاگادارییەوە ئەو کارە بکات، لێواری هەندێک لە پەڕۆکان دەنووشتێنەوەو

له جێگەی خۆیان لا دەکەون. بەڵام بۆ گواستنەوەی پەڕۆکان چارەیەکی تری نەبوو. دوای ئەوەی هەموو پەڕۆکانی پێچایەوە، بە شێوەیەک کە بتوانێت بێ بەربەست بتوانێت لە بن هەنگڵی خۆی هەڵیان بگرێت، چەمچەو مەقاس و کوتکە بچووکەکەی هەڵگرت کە لە داری زەیتوون ساز کرابوو، بێ چرپە خۆی گەیاندە دەرەوە.

هەور بەری ئاسمانی گرتبوو. هیچ چرایێک لە مێوانخانەکەدا نە دەسووتا، تاکە تروسکە لەو تاریکە ئەنگوستەچاوە، تریسکەیەکی دووری کەلووێکی ڕۆناکی بوو، لە لای ڕۆژهەڵاتەوە لە فۆرت لە سەرەوەی ئیل سانت مارگرێت، کە پتر لە میلێک دوور دەبوو، دەتگوت سەرەدەرزیێکی ڕۆناکە کەوتۆتە سەر قوماشێکی ڕەش. لە کەنداوەکە هەست بە شنەباییێکی بێهێز دەکرا، بۆنی ماسی لێوە دەهات. سەگەکان خەوتبوون.

گرێنوی چووە لای دیواری دەرەوەی خانووەکە، پەیژەیەک بە دیوار هەڵپەساردرابوو، دەستی ڕاستی ئازاد بوو، دەستی ڕاستی لە سێ پلیکەی ژێرەوەی پەیژەکە گیرکرد، سەرەوەی پەیژەکەی بە شانی ڕاگرت، بەم جۆرە  پەیژەکەی هەڵگرت و بەسەر حەوشەکەوە تا ژێر پەنجەرەی ژوورەکەی بە ڕێکی جێگیری کرد. پەنجەرەکە نیوەکراوە بوو. بە ئاسانی بەسەر پەیژەکە کەوت، وەک ئەوەی بەسەر پلیکانەیەک بکەوێت، زۆر هەستی بە خۆشحاڵی کرد، کە لێرە لە ناپۆلی جارێکی تر بۆنی کچەکەی دەکرد. ئەگەر ئەمە لە گراس بووایە، بە پەنجەرەی شیشبەند و پاسەوانی زۆری کۆشکەکەیان، کارەکەی زۆر سەختتر دەبوو. تەنانەت لێرە بە تەنها نوستبوو، پێوسیت نەبوو مشووری کارەکەرەکەشی بخوات.

پەنجەرەکەی پاڵداو کردیەوە، خشییە ناو ژوووڕەکە. پەڕۆکەکانی دانا، ئەوجا چووە لای تەختەخەوەکەی. بۆنی قژی بەسەر هەموو بۆنەکانی تری زاڵ بوو، لەسەر زگ خەوتبوو، ڕووی کردبووە سەرینەکەی، گۆشەی ئانشکیشی لە دەم و چاوی خۆی ئاڵاندبوو، دەتگوت پشتەسەری خۆی بە شیوەیەکی زۆر گونجاو بۆ لێدانی کوتەکەدارەکەی ئامادەکردبوو.

لێدانی کوتکەکە زرچە و تەپەیەکی تەپی لێوە هات. زۆر ڕقی لەم تەپە بوو، هەر لەبەر ئەوەی ئەو تەپەیە لەو کارە کڕو کپەیدا تاکە خشپەیەک بوو. تەنها بە قرمساندنی ددانەکانی توانی بەرگەی ئەو خشپە قێزەونە بگرێت، دوای ئەوەی خشپەکەش تێپەڕی، ماوەیەک هەر بە ددانی قرمساوی خۆی مایەوەو دەستیشی بە کوتەکەکەوە شەتەک ببوو، وەک ئەوەی لەوە بترسێت، تەپەکە دیسان لە شوێنێکەوە بە شێوەی دەنگدانەوە بگەڕێتەوە. بەڵام هیچ دەنگدانەوەیەک نەگەڕایەوە، بەڵکوو هێمنی و کپی دووبارە گەڕایەوە ژوورەکە، تەنانەت ژوورەکە هێمن و کپتر بوو

لە پێشوو، چونکە کچەکە دەستبەجێ هەناسەی بڕاو یەک هەناسەی تریشی نەدا. هەرکە شەتەکی و ڕەقبوونی لەشی خاوبووەوە، کە دەکرێ وەک دەقیقەیەک وەستانی یان جەستەشەتەککردن بۆ ڕێزلێگرتن لێکی بدەینەوە، لەشی بە نەرمی و خاوی هاتەوە باریەک.

کوتەکەکەی داناو ئیتر نقوومی ناو کارەکەی بوو. یەکەمین جار پەڕۆپێچراوەو دەقکراوەکانی لەیەکتری کردەوە، لەسەرخۆی هەموو پەڕۆکەکانی بەسەر کورسی و مێزەکە بەرەوپشت پەرت کردن، بە شێوەیەک کە رووە چەورەکەیان هیچیان بەرنەکەوێت. ئەوجا لێفەکەی لەسەر لابرد. خۆی بە بۆنی کچەکە لە گوورە نەبرد، کە لە پڕێکدا زۆر بە گەرمی بە خەستی ژوورەکەی پڕ کرد. ئەو دەمێک بوو بەو بۆنە ئاشنا ببوو، بەڵام دواتر کاتێک ئەو بەڕاستی دەبێتە ماخۆی ئەو بۆنە، ئەوسا هەڵی دەمژێت، هەڵی دەمژێت، تا بەو بۆنە مەست و گێژ دەبێت. ئامانجی ئێستایی ئەوە بوو، تا دەتوانێت زۆرتر و زۆرتر ئەم بۆنە ڕاوبکات و کۆیبکاتەوە، تا دەکرێ لێ نەگەڕێت پەرت و بڵاوببێتەوەو بەفیڕۆ بچێت. ئێستا کاتی ئەوە بوو، هەموو زیهنی خۆی بۆ کارەکەی کۆبکاتەوەو خێرا نەخشەکەی راپەڕێنێت.

بە قەیچکردنێکی خێرا شەقێکی لە کراسی خەوەکەی کرد، کراسەکەی لەبەرداکەند، پڕی دایە پەڕۆ چەورەکان و بەسەر جەستەی رووتیدا بڵاویکردنەوە. ئەوجا جەستەکەی بەرزکردەوە، پەڕۆ شوۆڕبووەوەکانی سوڕاندنەوە ژێری، وەک پاقلاوە، کۆتایی پەڕۆکانی لە جەستەی ئاڵاند، هەر لە پەنجەکانی پێیەوە، تاکو هەنیەی پەڕۆی لێ ئاڵاند. تەنها قژی کەوتبووە دەرەوەی پەڕۆکانی مۆمیاکە، بە ساف و پوخت قژەکەی بڕیەو بە شێوەی چەپکێک گرێی داو، خستییە ناو کراسی خەوەکەی و پێچایەوە. دوا پەڕۆی چەور کە مابووەوە، لە کەللەسەری کچەکەی ئاڵاند. دەستی بە لێوارەکانی داهێناو دەستماڵی کردن و بە پالەپەستۆی پەنجەکانی قایمی کردن. ئەزمایشێکی هەموو بەستەکەی کرد. هیچ درزێک، هیچ کونۆچکەیەک، هیچ لۆچێک، هیچ کەلێنێک نەما بوو، کە بۆنی کچەکەی پێ بێتە دەرەوە. بەستەکەی زۆر بە پوختی پێچابووەوە. هیچ کارێکی تر نەما بوو بیکات، جگە لە چاوەڕوانیکردن، شەش سەعات تا تاریکورونی بەیانی.

قەنەفەیەکی یەک نەفەری جلەکانی کچەکەی لەسەر بوو، جلەکانی هەڵگرت و خستنیە سەر تەختەخەوەکە و لەسەر قەنەفەکە دانیشت. بۆنی ناسکی کچە هێشتان بە کراسە ڕەشە بەرینەکەیەوە مابوو، کە تێکەڵی بۆنی کولیچە بە رازیانە ببوو، ئەو کولیچانەی کە بۆ رێگە خستبوویە گیرفانی خۆی. گرێنوی قاچەکانی خۆی خستە سەر لێواری تەختی خەوەکە، نزیکی قاچەکانی کچە، بە جلەکانی کچە خۆی داپۆشی و دەستی کرد بە خواردنی کولیچەکان. زۆر ماندوو

بوو، بەڵام نەیدەویست بخەوێت، چونکە نەدەبوو لە کاتی کارکردندا بخەوێت، ئەگەریش کارکردنەکە هەر چاوەڕوانیکردن بووایە. بیری لەو شەوانە کردەوە، کە لە کارگەکەی بالدین بە کاری دڵۆپاندن کاتی خۆی بەسەر دەبرد: بیری لە مەنجەڵەکەی دڵۆپاندن دەکردەوە، کە چۆن وەک تەنی رەش ببوو، لە ئاگرە بلێسەدارەکە، ترپەی هێمنی دڵۆپەکان، کە لە ناو بۆڕیە ساردەکەوە تنۆک تنۆک دەڕژانە ناو شووشەکەی ژێرەوە. دەم نا دەم دەبووایە تەماشای ئاگرەکەی کردبایە، ئاوی تری لە مەنجەڵەکە کردبایە، شووشەی ئاوە دڵۆپێنراوەکەی بگۆڕیبا، پەڕەگوڵەکانی بگۆڕیبایە. لەگەڵ ئەوەش لای ئەو ئامانجی ئەو پاسەوانیە راپەڕاندنی ئەو هەموو کارانە نەبوو، کە کەوتبوونە سەرشانی، بەڵکوو هەمووی بۆ مەبەستی تایبەتی خۆی بوو. ئەمڕۆش لەم ژوورەدا، کە کاری بۆنمژین و بۆنگرتن بە رێگای چەوری بە تەواوی سەربەخۆ دەڕۆیشت بەڕێوە، کە لەوانەبوو هەموو ئەزمایشێکی ناوەخت، یان سووڕاندن و دەستکاری کردنێکی بوخچەی بۆنەکە، زیانی بۆ کارەکە دەبوو، ئا لێرەش، وا دەهاتە بەرچاوی گرێنوی، کە پاسەوانییەکەی شتێکی گرنگە، نووستن لەوانەیە بیری سەرکەوتنی لێ بخاتە مەترسی.

سەرەڕای شەکەت و ماندووبوونەکەی، واگامانەوە و چاوەڕوانی لای ئەو کارێکی سەخت نەبوو. ئەو حەزی لەم چاوەڕوانیە دەکرد. لە بیستوچوار کچەکەی تریش، ئەو چاوەڕوانیەی لا زۆر خۆش بوو، چونکە ئەمە چاوەڕوانییێکی لێل و نادیار نەبوو، چاوەڕوانییێکی غەریبی و شەیدایی نەبوو، بەڵکوو ئەمە چاوەڕوانییێک بوو بۆ رێنمایی کارێکی مانادار، تا ڕادەیەک ئەمە چاوەڕوانییێکی کارا بوو. واتە لە کاتی چاوەڕوانییەکە کارێک جێبەجێ دەبوو. ئەگەریش خودی خۆی کارەکەی رانەدەپەڕاند، بەڵام بە رێگای ئەمەوە دەکرا. ئەو هەموو رەنجێکی خۆی پێشکەش کردبوو، تەواوی هونەرەکەی خۆی خستبووە کار، هیچ کەموکورتییێکی نەبوو، هیچ هەڵەیەکی نەکردبوو. کارێکی بێ وێنە بوو. هەر دەبوایە ئەو کارە تاجی سەرکەوتن بنێتە سەری... ئەوەی ماوە تەنها چەند سەعاتێک چاوەڕوانییەو بەس، ئەو چاوەڕوانییە ئەوی لە ناخەوە خۆشحاڵ دەکرد. لە هەموو ژیانی خۆیدا هەرگیز وەک ئەو چەند سەعاتە پشوودانەی هەستی بە ئاسوودەیی نەکردبوو، ئەوەند ئارام نەببوو، ئاوا هاوسەنگ نەببوو، ئەوەندە لەگەڵ خۆیدا گونجاو و یەک نەببوو، تەنانەت ئەو سەردەمەش کە لە شاخەکەیدا بەسەری برد، چونکە ئەمڕۆ لە قووڵایی ئەو شەوەدا لای قوربانییەکەی خۆی دانیشتبوو، پاسەوانی بۆ گرتبوو، چاوەڕوانی دەکرد. ئەمە یەکەمین جار و تەنها ساتەوەختێک بوو، کە لە مێشکی تاریکیدا، بیر و ئەندێشەی رۆشن دەهاتنە ئارا.

ئەو بیر و ئەندێشانە بەرەو دوارۆژ نەدەچوون. ئەو بیری لەو بۆنە نەدەکردەوە، کە دوای چەند سەعاتێکی تر، دەیدووریێتەوە، بیری لەو عەترە نەدەکردەوە، کە لە تریفەبۆنی بیستوپێنج شۆخەکچ بەرهەمی دەهێنیت، بیری لە نەخشەکانی داهاتووی نەدەکردەوە، بیری لە بەختەوەری و سەرکەوتن نەدەکردەوە. نا، بیری لە رابردووەکانی خۆی دەکردەوە. وەستگاکانی ژیانی رابردووی دەهێنایەوە بەرچاوی خۆی، ماڵی مادام گایارد، بۆنی گەرمی دارە شێدارەکان، تا دەگەیشتە سەفەری ئەمڕۆی بەرەو ناپۆلی، ئەو گوندە بۆن ماسییە. گریمالی دەباغچی هاتەوە بیر، جۆزێف بالدین، گراف تایادە- ئێسپیناس. بیری لە شاری پاریس کردەوە، هاڵاوی تێکەڵی هەزاران بۆن و بەرامەی، بیری لە کچە قژسوورەکەی شەقامی ماری کردەوە، دەشتە ئازاد و کاکی بە کاکییەکان، شنەبایە نەرم و تەنکەکان، دارستانەکان. هەروەهاش بیری لە پیرە شاخەکەی ئۆڤێرنیە کردەوە، بە هیچ شێوەیەک خۆی لەو بیرەوەریانە لانەدەدا، بیری ئەشکەوتەکەی خۆی کردەوە، لە هەواکەی، کە خاڵی بوو لە بۆنی مرۆڤ. بیری لە خەونەکانیشی کردەوە، بە خۆشییەکی زۆرەوە بیری لە هەموو ئەم شتانە کردەوە. بەڵێ، کاتێک ئاوا بیری لە رابردوو دەکردەوە، وا دەهاتە بەرچاوی، کە ئەو مرۆڤێک بووە، بەختێکی تایبەتی هەبووە، راستە چارەنووسەکەی ئاڵۆز و پێچاوپێچ بووە، بەڵام لە کۆتاییدا بەرەو راستەرێگای هێناوە، بەرەو بەختەوەری، ئەگەر وا نەبووایە، چۆن بۆی دەکراو بۆی هەڵدەکەوت، ئەمڕۆ لەو ژوورە تاریکەدا، لە کەناری ئامانجی خۆی دابنیشێت، کە هەمیشە هیوای بۆ دەخواست؟ خۆ ئەگەر بە ڕاستی بیری لێ بکاتەوە، ئەوا ئەو کەسێکی بە ڕاستی بەختیار و بەختەوەرە!هەژانێک کەوتە هەناوی، هەژانی هەستکردن بە ملکەچی و سوپاسگۆیی. "سوپاست دەکەم" بە هێواشی چرپاندی: "سوپاست دەکەم، جۆن پاتیست گرێنوی، کە تۆ ئاوایت، هەر وەکو خۆت!" ئاوا کەوتبووە ژێر کاریگەری خۆی. ئەوجا پێڵووەکانی چاوی خۆی قوچاند، نەک بۆ ئەوەی بخەوێت، بەڵکوو بۆ ئەوەی بە تەواوی خۆی دەخیلی ئاشتی و ئاسوودەیی ئەم شەوە پیرۆزە بکات. دڵی پڕ ببوو لە ئاشتی. نەک هەر دڵی، بەڵکوو وای هاتە بەرچاو، کە ئاشتی هەموو دەوروبەرەکەی پڕ کردووە، بۆنی خەوی ئاسوودەی کارەکەرەکەی کرد، کە لە ژوورەکەی تەنیشتیان خەوتبوو، هی خەوی قووڵی ئەنتۆن ریچ کە لەو بەری ڕاڕەوەکە نووستبوو، بۆنی بۆرژانی خاوەن مێوانخانەکەو خزمەتکارەکانی کرد، هی سەگەکان، هی وڵاخەکانی تەویلە، هی هەموو جێگاکان و هی دەریاش. با وەستا بوو، هەموو لایێک کپ و ئارام بوو. هیچ شتێک نەبوو ئەو ئاشتییە، ئەو ئارامییە خەوشدار بکات.

تەنها جارێک قاچی خۆی بەرەو تەنیشت چەماندەوە، بە ئاستەم پێی بە قاچی لاورا کەوت. راستتر بڵێین، نەک قاچی، بەڵکوو تەنها بە پەڕۆکەکەی کە قاچی پێ بەرگ کردبوو، چینێکی تەنک چەوری لەژێرەوە بوو، کە بۆنی قاچەکانی هەڵمژی بوو، بۆنە خۆشەکەی، بۆنە خۆشەکەی قاچی.

## ٤٦

که باڵندەکان کەوتنە جریواندن، واتە کەمێک بەر لە بولێڵەی بەیان، گرێنوی هەستایەوە سەر پێیان، ئیتر کارەکەی تەواو کۆتایی هاتبوو. پەڕۆکەکانی لە یەکتری کردنەوە، وەک پلاستەر لە لەشە مردووەکەی کردنەوە. چەوریەکان بە ئاسانی لە پێستەکە دەبوونەوە. تەنها لە گۆشەو کەلێنەکان هەندێ چەوری بە لاشەکەوە دەمان، ئەوانیشی بە چەمچەکەی لێ دادەماڵی. لە کۆتاییدا هەرچی پنتە چەوریەکی پێوەی مابوو، لە تەوقی سەرییەوە تا پێیەکانی هەمووی بە ژێرکراسەکەی لاورا ئەوەندە جوان سڕیەوە، تەنانەت هەرچی ورتکەچەورییکی هەڵوەریویش هەبوو، هەمووی لەسەر پێستەکەی لەگەڵ سڕینەوە ڕاماڵی، بەمەش دوا تنۆک و دوا تۆزی بۆنە خۆشەکەی کۆکردەوە. ئەوسا لای ئەو لاورا بەراستی مرد، ژاکاو، چورچ، وەک پاشماوەی پەڕی گوڵان.

گرێنوی ژێرکراسەکەی لاورای خستە ناو پەڕۆییێکی گەورە. تەنها لە ناو ئەو ژێرکراسەدا هێشتان لاورا دەژیا، کراسی خەوەکەی و قژەکانیشی خستە سەر، هەمووی وەک بوخچەیەکی بچووک توند گرێی داو خستییە بن هەنگڵی خۆی. ماندووبوونی ئەوەی نەدا بەر خۆی، لاشەکە دابپۆشێت. لەگەڵ ئەوەی تاریکی شەو بەرەو بۆراتی تاریکورۆنان دەچوو، وردە وردە کەلوپەلەکانی ژوورەکە دەردەکەوتن، ئەو تەمەشای سەر تەختەکەی نەکرد، بۆ ئەوەی بە لای کەم جارێک لە ژیانیدا کچەکە بە چاو ببینێت. شێوەی کچەکە لای ئەو گرنگ نەبوو، لە راستیدا لای ئەو چیتر کچەکە بە جەستە بوونی نەبوو، بەڵکوو تەنها بۆنێکی بێ جەستە بوو، کە ئەو لە بن هەنگڵی خۆی هەڵی گرتبوو، لەگەڵ خۆی دەیبرد.

بە هێواشی لە ئاستانەی پەنجەرەک ئاودیو بوو، دابەزیە سەر پەیژەکە. لە دەرەوە دیسان بایێک هەڵی کردبوو، ئاسمانیش ساف ببوو، رۆناکیێکی شینباوی تۆخی رژاندبووە سەر وڵاتەکە.

نیو کاتژمێر دواتر، کارەکەرەکە ئاگری لە ئاگردانی ئاشبەزخانەی پێ کرد. کە چووە بەر دەرگا بۆ ئەوەی داری سووتان بهێنیت، چاوی بە پەیژەکە کەوت کە بە دیوارەکە هەڵواسرابوو، بەڵام هێشتان کاتی ڕازان بوو، نەدەکرا، شتێک لەم بارە بهۆنێتەوە. کەمێک دوای کاتژمێر شەش، رۆژ شەبەقی دا. رۆژ بە زەبەلاحی و بە رەنگێکی زێڕینی سوور لە کەڵی نێوان هەر دوو دوورگەی

لێرین، لەسەر دەریا بەرز بووەوە. هیچ هەورێک بە بەری ئاسمانەوە نەبوو. رۆژێکی بەهاری تیشکدار دەستی پێکرد.ژوورەکەی ریچ بەلای رۆژئاواوە بوو، کاتژمێر حەوت واگا هات. ئەوە یەکەمین جاری بوو، دوای چەندین مانگان، کە بەڕاستی بخەوێت و تێر خەو ببێت، پێچەوانەی عادەتی خۆی، ئەمڕۆ چارەکە کاتژمێرێکی تریش خۆی لە ناو جێگادا گلمخاند، لە ئاسوودەییان خۆی لێکڕاکێشاو باوێشکی هاتێ، گوێی خۆی لەو خوڕە خۆشە گرت، کە لە ئاشپەزخانەکەوە دەهات. کە هەستایەوەو پەنجەرەی ژوورەکەی بە گەورەیی کردەوە، چاوی بە ئاووهەوای خۆشی دەرەوە کەوت، بای تازەو بۆنخۆشی بەیانی رژایە ژوورەوە، دەنگی پێڵەکانی دەریا گەیشتنە گوێی، ئیتر زەوقێکی بێ سنوور خۆشی پەیداکرد، لێوەکانی لوول کردو دەستی کرد بە فیتەفیت و منگە منگی گۆرانی.کاتێک جلەکانی لەبەر دەکرد، هێشتان هەر فیتەفیتی بوو، هەر فیتەی لێ دەدا، کە ژوورەکەی خۆی بەجێهێشت، بە هەنگاوی گورج و گۆل لە ڕاڕەوەکەوە خۆی گەیاندە دەرگای ژووری کچەکەی، لە دەرگاکەی دا، دیسان بە هێواشی لە دەرگاکەی دا، نەبادا کچەکەی رابجفرێت، بەڵام هیچ دەنگێک نەبوو. ریچ پێکەنی، باش تێگەیشت، کە کچەکەی هێشتان خەوتووە.

لەسەرەخۆ کلیلەکەی خستە کونی کیلۆنی دەرگاو بای دا، بەبێ دەنگی، زۆر بە هێمنی، نەوەک واگای بهێنێت، زۆر مەراقی بوو، کە لە خەودا بیبێنێت و بە ماچ بە واگای بهێنێت، جارێکی تر، بۆ دوا جار، بەر لەوەی بە ناچاری بیداتە دەستی پیاوێکی تر.

دەرگاکە بووەوە، چووە ژوورەوە، هەتاوی رۆژەکە بە تەواوی کەوتە سەر دەموچاوی. دەتگوت ژوورەکە پڕ بووە لە زیوی تریسکەدار، هەموو شتێک تیشکی دەدایەوە، ناچار بوو، لەبەر ژانی چاوی، خوولەکێک چاوەکانی خۆی بنووقێنێت.

کە چاوەکانی خۆی دیسان کردەوە، چاوی بە لاورا کەوت، لەسەر جێگاکەی کەوتبوو، رووت و قووت و مردوو، سەری ساف تراشراو، سپی وەک بەفر. دەتگوت مۆتەکەخەون دەبینێت، ئەو مۆتەخەونەی کە لە شەوی رابردوو لە گراس دیتبووی و لەبیری چووبووەوە، ئێستا ناواخنی خەونە زۆر ناخۆشەکەی هەموو وەک بروسک هاتەوە خەیاڵ. دیمەنەکە، تەواو کت و مت وەک خەونەکە بوو، بەڵام ئەم جارە زۆر ساف و رۆشنتر.

## ٤٧

هەواڵی کوشتنی لاورا ریچ وەک بروسک خێرا بە وڵاتی گراسدا بڵاوبووەوە، وەک ئەوە بوو، کە بڵێن "پاشا مرد!" یان "جەنگ هەڵگیرسا!" یان "ڕێگرەکانی دەریا دابەزینە کەناری دەریا!" ترسێکی سامناکی ئاوای هێنا ئاراوە. لە پڕێک ئەو ترسەی کە لەبیری خەڵک چووبووەوە، دیسان پەیدا بووەوە، وەکو پایزی پێشوو، بێزاری، تووڕەیی، گومانی هاروهاجانە، دڵەڕاوکێ وەک نەخۆشییێکی درم هەموو کەسێکی گرتەوە. خەڵکەکە کە شەو دادەهات لە ماڵەکانیان دەمانەوە، کچەکانی خۆیان لە ماڵەوە بەند دەکردن، خۆیان لە بۆسە دەنا، گومانییان لە یەکتری دەکرد و ئیتر خەو نەدەچووە چاویان. هەموو کەسێک وا بیری دەکردەوە، کە دیسان وەک جاری پێشوو، ئەو تاوانکارییە درێژە دەکێشێت و هەر هەفتەیەک کچێک دەبێتە قوربانی. دەتگوت نیوساڵ کاتییان بەرەو دواوە گەڕاندۆتەوە.

پتریش لە نیوساڵ لەمەوبەر ترسەکە پەکی خەڵکی خستبوو، چونکە ئەو مەترسییە، کە دەمێک بوو خەڵک باوەڕی بە نەمانی هێنا بوو، لە پڕێکی سەیر گەڕایەوە، بەمە هەستی نەبوونی یارمەتی و بێچارەیی لە ناوخەڵکدا بڵاوبووەوە. چونکە نزاو نەفرەتکردنی قەشە سەرکەوتنی بەدەست نەهێنا! تەنانەت ئەنتۆن ریچ، ریچی مەزن، دەوڵەمەندترین هاووڵاتی شارەکە، نوێنەری دەوڵەت، پیاوێکی تایبەت و بە دەسەڵات، کە هەموو توانایێکی لەبەر دەستدا بوو، توانای ئەوەی نەببوو کە تاقە منداڵەکەی خۆی بپارێزێت! چونکە ئەو مرۆکوژە لە پیرۆزیی جوانیی لاورای شۆخ و شەنگ نەترسا بوو، کە بە ڕاستی لە لای هەموو ئەوانەی دیبوویان پیرۆز تەماشا دەکرا، بە تایبەت ئێستاکە دوای مردنی. ئیتر چ هیوایێک هەبوو بۆ خۆرزگارکردن لەو بکوژە؟ ئەم بکوژە لە ئاهۆ دڕندەترە، چونکە پیاو دەیتوانی لە دەستی ئاهۆ ڕا بکات، بەڵام نەیاندەتوانی لە دەستی ئەم بکوژە ڕابکەن، وەکو چارەنووسی ریچ، ئەمەی سەلماندبوو. دەبێت ئەو بکوژە خاوەنی بەهرەیەکی خەیاڵیی نائاسایی بێت. هەبێ و نەبێ دەبێت هاوبەندی ئەهریمەن بێت، بەو جۆرە زۆرکەس، بە تایبەت خەڵکە سادەو نەبانەکان خەڵکی تریان ئامۆژگاری دەکرد، کە روو لە کڵێسا بکەن و لە خودا بپاڕێنەوە، هەموو خاوەن پیشەیەک بچێتە لای خان و وەستای خۆی، کلیلسازان با بچنە لای ئالۆسیوسی پیاوچاک، تەونچیان بچنە لای کریسپینیوسی پیاوچاک، باخچەوانان بچنە لای

ئەنتۆنیۆسی پیاوچاک، عەترسازان بچنە لای جۆزێفی مەزن. بەم جۆرە هەموو ژن و کچەکانی خۆیان لەگەڵ خۆیان برد و پێکەوە دەستییان کرد بە پاڕانەوە، خواردن و خەویان بردە ناو کڵێسا، تەنانەت کە ڕۆژیش دەبووەوە، چیتر کڵێسایان بەجێنەدەهێشت، ئەو کۆمەڵە ترساو و سەرلێشێواوە، باوەڕیان بەوە هێنابوو، ئەگەر بێت و ئومێدی رزگاربوون هێشتان مابێت، ئەوا هەر تەنها لای حەزرەتی مریەمە، بەو لە دەستی ئەو جانەوەرە رزگاریان دەبێت.

ئەو کەسانەی لەوان ژیرتر بوون لە ماڵەکانیان مابوونەوە دەرگایان لەسەر خۆیان کلیلدابوو، چونکە جاری پێشوو دیبوویان کە کڵێسا سەرکەوتنی بەدەستنەهێنا بوو، ئەو گرووپانەی نهێنیدار بوون، بە پارەیەکی زۆر جادووبازێکیان لە گۆردۆنەوە هێنابوو، خزیبوونە بنگەوەڕێکی بەردینی شاری گراس و نوێژیان بۆ ئەهریمەن دادەبەست، تا مەرایی بۆ ئەهریمەن بکەن و وابەستەیی خۆیانی پێشانبدەن. دیسان پیاوماقوڵان و پیاوەدیار و خانەدانە ڕۆشنبیرەکان ڕێوشوێنی زانستییان گرتەبەر، ماڵەکانی خۆیان مەگنێتیزاند، کچەکانی خۆیان هوپیۆنۆتیزاند، بازنەی بێ دەنگییان لە هۆڵەکاندا دابەست و هەوڵی ئەوەیان دا، کە بە هێزی پەیامیی ئەندێشەیی هەموویان، پێکەوە بە شێوازیکی تێلیپاتی بکوژەکە شاربەدەر بکەن. ڕێکخراوەکان خۆپێشاندانیکی نزاخوێنی و سزاخوێنییان لە گراسەوە تا ناپۆلێ و لە ناپۆلییەوە تا گراس ڕێکخست. پیر و قەشەی پێنج دێری شارەکە نوێژی بەردەوامییان دابەست، کە بەردەوام سروودی ئاینییان تێدا دەخوێند، هێندەی نەبرد وای لێ هات، لە هەموو گۆشەو کەناریکی شارەکە شەو و ڕۆژ دەنگی نزاو پاڕانەوە دەهات. وای لێ هات نزیکە هەموو کارێک وەستا.

خەڵکی شاری گراس، لە جۆش و خرۆشی بێ کاری، وەک بڵێی زۆر بە بێ سەبری، لە هەڵپەی قەومانی کوشتنی کچێکی تردا بوون، هیچ کەسێک گومانی لەمەدا نەبوو، کە ئەمە هاکە ڕوودەدات. هەر یەکێک لەوان لە دڵی خۆیدا، ئەو هەواڵە سامناکەی پێشبینی دەکرد، تاکە ئومێدیشان ئەمە بوو، کە خودی خۆیان بەرنەکەون، بەڵکوو یەکێکی تر بەربکەوێت.

دەسەڵاتدارانی شار، هی پارێزگاو هەرێمەکە، ئەمجارە خۆیان نەخستە داوی ئەو بارە پڕ لە هاروهاجیەی خەڵک. ئەوە جاری یەکەمین بوو، لە دوای ئەوەی کە ئەو کچکوژییە پەیدا ببوو، هاوکاری و پێکەوەکارییێکی پڕنەخشەو سوودبەخش لە نێوانی فەرمانبەر و بەڕێوەبەرانی شارەکانی گراس، دراگویگنان، تۆلۆن، لە نێوانی نوێنەرانی دەوڵەت و، پۆلیس و سوپاو ئەندامانی پەرلەمان و سوپای دەریایی پیادەبکرێت.

هۆی ئەو پێکەوەکاری و هاوکارییەی دەسەڵاتداران لە لایێک لە ترسی راپەڕینی سەرتاسەری گەل بوو، لە لاییکی تر ئەمە راستییێک بوو، کە لە دوای کوشتنی لاورا ریچ، خاڵێکی دیاری لێکۆلینەوە لە دەستدا هەبوو، کە دەکرا ئیتر لەو خاڵەوە، بە شێوەیەکی نەخشەدار بکەونە دوای بکوژەکە. بکوژەکە بە چاو دیترا بوو، دەرکەوتبوو، کە بکوژەکە شاگردێکی دەباغخانەیە، کە شەوی کوشتنی لاورا لە تەویلەکەی مێوانخانەی ناپۆلی بووەو بۆ بەیانییەکەی گوم بووە، بێ ئەوەی هیچ شوونێک لە دوای خۆی بەجێبهێلێت. بە پێی قسەکانی خاوەنی مێوانخانە، هی مەیتەری تەویلە، هەروەها قسەکانی ریچ، کە هەموو یەکییان دەگرتەوە، دەبووایە، بکوژ کابراییێکی بەژنکورتی بێ نموودی چاکەت قاوەیی بێت و توورەگەیەکی سەفەری پێ بێت. هەرچەندە هەر سێ گەواهیدەر نەیاندەتوانی وەسفی دەموچاوی، رەنگی قژی، زمانی بکەن، ئەوە نەبێت کە خاوەن مێوانخانەکە دەیگوت، ئەگەر هەڵەی نەکردبێت، لە کاتی جووڵەو رۆیشتندا هەندێک لەنگی و شەلی پێوە دیار بوو، وەک ئەوەی قاچێکی بریندار بێت، یان پێییێکی گۆج بێت.

بەو یاداشت و ئاماژانەوە لە نیوەڕۆی رۆژی کوشتنەکە دوو تیپە پۆلیسی سواریی بەرەو شاری مارسێی کەوتنە پشکنین بۆ دۆزینەوەی بکوژ. یەکێکییان بە درێژایی کەناری دەریاو، ئەوەی تریان بە رێگاکانی ناوەوە. دەوروبەری ناپۆلی لەلایەن خەڵکەوە خۆبەخشانە دەپشکنرا. دوو راسپێردراوی دادگای گراس بەرەو شاری نیسا چوون، بۆ ئەوەی لەوێ لێکۆلینەوە لەگەڵ شاگردانی دەباغخانەکان بکەن. لە بەندەرەکانی فرێوس و کان و ئەنتیب هەموو کەشتییەکان دەپشکنران، هەموو رێگا مەرزییەکان بەرەو ساڤۆین گیران، دەبووایە موسافیرەکان ناسنامەی خۆیان پێشانبدەن. بانگەوازنامەیەک، کە وەسفی بکوژی تێدا نووسرا بوو، بۆ ئەو کەسانەی کە خوێندەوارییان هەبوو، بە هەموو دەروازەکانی شارەکانی گراس و ڤێنس و گۆردۆن و دەروازەی کڵێسای لادێکان هەڵواسرا. رۆژێ سێ جاران بانگەوازەکە جاڕدەدرا. جا چونکە دەگوترا کە بکوژەکە پێیەکی قوڵەیە، ئەو بیروڕایە رژتر دەبوو، کە دەیانگوت بکوژ خودی شەیتان خۆیەتی، ئەمەش هێندەی تر ترس و پشێوی دەخستە ناو خەڵک، وەک ئەوەی کە بەڵگەیەکی بە نرخیان دەستکەوتبێت.

دوای ئەوەی سەرۆکی دادگای گراس بانگەوازێکی لەسەر راسپارەدی ریچ بڵاوکردەوە، کە هەر کەسێکی ئاماژەیەک بدۆزێتەوە بۆ گرتنی بکوژ، ئەوا خەڵاتێکی پێ دەبەخشرێت کە کەمتر نەبێت لە دوو سەت لیرە، ئەوجا لەسەر زمانلێدانی خەڵکی هەندێک لە شاگردە دەباغچیەکانی شارەکانی گراس و ئۆپیۆ و گۆردۆن گیران، یەکێک لەوان لە بەدبەختی خۆی بە ڕاستی دەشەلی. لەگەڵ ئەوەی ئەو گومانلێکراوە بە هۆی کۆمەڵێک شاهید دەیسەلماند، کە لە کاتی کوشتنی لاورا، لە شوێنی تاواندا

نەبووە، بەڵام هەر خرایە بەر ئازار و ئەشکەنجە. دە رۆژ دوای کوشتنی لاورا، پاسەوانێکی شار، ئەو زانیارییەی خوارەوەی گەیاندە نووسینگەی دادوەرەکان: "لە نیوەڕۆی ئەو رۆژە، ئەو، گابریل تالیاسکۆ، پاسەوانی سەرەکیی دەروازەکەی کۆرس، کاتێک وەک رۆژانی ئاسایی خەریکی ئەرکی خۆی بوو، کەسێکی، کە ئێستا دێتەوە بیری، وەک ئەو وەسفانەی ناو بانگەوازەکە، قسەی لەگەڵ کردووە، زۆر بە تەنگەتاوی و چەندبارە پرسیاری ئەو ڕێگایەی لێ کردووە، کە ئەو بەیانییە کاروانەکەی کۆنسوڵی دووەم، ریچ، لە کاتی بەجێهێشتنی شار، گرتووتیە بەر. بەڵام چ ئەو کات و چ دواتر ئەو بایەخی بەم رووداوە نەداوە، بێگومان هەرگیز بە هێزی بیری خۆی لەوانە بوو نەتوانێت شێوەی ئەو کەسە بهێنێتەوە بیری خۆی، ئەگەر بهاتبا دوێنێ بە ڕێکەوت دیسان چاوی بەم کەسە نەکەوتبایەوە، چونکە ئەوسا هیچ بایەخێکی پێ نەدابوو، بەڵام دوێنێ ئا لێرە، لە شاری گراس، لە سەر جادەی لا لۆڤ، لەبەر دەم کارگەکەی وەستا درۆت و مادام ئەرنولف، کاتێک دەگەڕایەوە ناو کارگەکە، ئەو کەسە سەرنجی ئەوی راکێشاوە کە زۆر بە رۆشنی لە کاتی رۆیشتندا دەشەلی.

کاتژمێرێک دواتر گرێنوی گیرا. خاوەن مێوانخانەکەی ناپۆلی و مەیتەری تەویلە، کە هێنرابوون بۆ گراس، بۆ ئەوەی بزانن، گومانلێکراوەکە دەناسنەوە، یەکسەر ناسیانەوەو گوتیان ئەمەیە شاگردە دەباغچییەکە، کە لای ئەوان خەوتووە: "ئەمەیە و کەسی تر نیە، دەبێت ئەوە ئەو بکوژە بێت، کە بەدوایدا دەگەڕێن،"

کارگەکەیان پشکنی، کۆختەکەی ناو باخەزەیتوونەکەیان پشکنی، ئەوەی پشت دێری فرانسیزکا. لە گۆشەیەکدا، کە بە ئاستەم شاردرابوونەوە، پارچە هەڵزڕاوەکانی جلی خەو و ژێرکراس و قژەسوورەکەی لاورا ریچیان دۆزییەوە. کاتێک زەویەکەیان هەڵکۆڵی، جلوبەرگ و قژی بیستوچوار کچەکەکەی تریش دەرکەوتن. ئەو کوتەکە دارەش دۆزرایەوە، کە کچەکانی پێ کوژرا بوو، توورەگە گوشەکەی سەفەریش دۆزرایەوە. بەڵگەکان زۆر بەهێز بوون. زەنگی کڵێساکانیان لێ دا، سەرۆکی دادگا بانگەوازی راگەیاند، کە نزیکە دوای ساڵێک هەوڵ و پشکنین، تاوانبارە کچکوژەکە دۆزرایەوەو گیرا، ئیستاکە دەستبەسەرە.

## ٤٨

لە سەرەتادا خەڵک باوەڕیان بە بانگەوازەکە نەکرد. گوتیان دەیانەوێت بەم فێڵە نەتوانیی و بێ بەهرەیی فرمانبەرانی دەوڵەت بشارنەوەو و مەترسی ناڕەزایی خەڵکی پێ دابمرکێننەوە. خەڵک هێشتان ئەو کاتانەیان بە باشی لە یاد بوو، کە دەیانگوت، بکوژەکە ڕۆیشتووە بۆ شاری گرێنۆبل و گراسی بەجێهێشتووە. ئەمجارەیان ترس قووڵایی گیانی خەڵکەکەی داخۆری بوو.

تەنها ئەو کاتەی کە بەڵگەکانییان لە مەیدانەکەی کڵێسا، لە بەردەم قشڵە، پێشانی خەڵک دا، ئەوجا ڕای گشتی گۆڕانی بەسەرداهات، بەڵگەکان بریتی بوون لە جلوبەرگی بیستوپێنج کچ، لەگەڵ بیستوپێنج چەپکە قژ، کە وەک داوەڵ لەبەردەم مەیدانەکەدا، بەرامبەر کڵێسا، بە ڕێز بەسەر ستوونان هەڵیانواسیبوون.

سەدان خەڵک ریزیان بەستبوو، بە هەڵەداوان بەلای ئەو پێشانگای مەرگەدا دەچوون و تەماشایان دەکرد. کەسوکاری قوربانییەکان کاتێک جلوبەرگەکانییان دەناسییەوە، زیڕەیان لێ هەڵدەستاو لەخۆدەچوون، خەڵکەکەی تریش، بەشێکییان هەر بۆ خۆشی و، بەشێکییان بۆ ئەوەی بە تەواوی دڵنیا ببن، داوایان دەکرد، کە بکوژەکەیان پێشان بدەن. ئەوەندەی نەبرد داخوازی دیتنی بکوژ زیادی کرد و بوو بە هەرایەکی هەڕەشەدار لە مەیدانە بچووکەکە، ناچار سەرۆکی دادگا بڕیاری دا، گرێنوی لە ژووری بەندیخانەکەی بهێننە دەرەوەو لە پەنجەرەی نهۆمی یەکەمی سەرا، پێشانی خەڵکی بدەن.

کاتێک گرێنوی هاتە بەردەم پەنجەرەکە، قیژەو هەراکە هەمووی کپ بوو. وەک ساتەوەختی نیوەڕۆی ڕۆژە گەرمەکانی هاوین، کاتێک کە هەموو دەچنە دەرەوە، بۆ سەر مێرگەکان، یان خۆیان دەخزێننە بەر سێبەری ماڵەکان، لە پڕێکدا خامۆشییێکی تەواو ئاوا مەیدانەکەی داگرت. نە دەنگی پێیێک، نە کۆخەیەک، نە دەنگی هەناسەدانێک، نە چرپەیەک، هیچ نەدەهاتە گوێ. ماوەیەک ئاپۆڕەی خەڵکەکە هەمووی تەنها ببوون بە چاوی زەق و دەمی بەش. کەس نەیدەتوانی ئەوە باوەڕ بکات، کە ئەو پیاوە بابردەڵە، نابووتە، بچووکە، ئەو سیسەڵە، ئەو ریتەیە، ئەو سیرمەیە، ئەو چنەیە، ئەوەی لەسەرەوە لەبەر پەنجەرەکە وەستا بوو، بکوژی ئەو هەموو کەسە بێت. بە هیچ

شێوەیەک وەک بکوژێک نەدەهاتە بەرچاوان. راستە کەس نەیدەتوانی بڵێت، چۆن چۆنی پێشتر شێوەی بکوژەکەیان، هی ئەو ئەهریمەنەیان، هێنابووە بەرچاوی خۆیان، بەڵام هەموویان لەسەر ئەوە هاوڕا بوون، کە هەرگیز بیریان بۆ ئەوە نەدەچوو، کە ئەو بکوژە کەسیکی ئاوا بابردەڵە بێت! جا لەگەڵ ئەوەش کە شێوەی بکوژەکە لەگەڵ ئەندێشەی ئەوان نەدەگونجاو، وەکو خۆیان دەیانگوت، پێشاندانەکەی کاریگەری ئەوتۆی بۆ دڵنیابوون و قناعەتهێنانیان نەبووە، بەڵام بە شێوەیەکی دوودڵ هەر تەنها بە هۆی جەستەی ئەو مرۆڤەی بەردەم پەنجەرە، بە هۆی ئەو راستییە، کە تەنها ئەم و کەسی تر نا، وەک بکوژ خراوەتە بەرچاویان، ئەوە کاریگەرییێکی قناعەتهێنی هەبوو. هەموو بیریان بۆ ئەوە چوو: قەت نابێت ئەمە راست بێت! بەڵام لە هەمان چرکەساتدا، دەیانزانی، کە هەر ئەوەیە کە دەبێت راستیی بێت.

بێگومان، کە پاسەوانەکان پیاویلکەکەیان دووبارە راکێشایەوە تاریکی ژوورەوە، کاتێک لەبەرچاویان ون بوو، چیتر دیار نەبوو، بەڵکوو ئەگەریش بۆ ماوەیەکی کورتیش بێت، تەنها وەک بیرەوەریەک لە مێشکیاندا مایەوە، تەنیا وەک زاراوەیەک لە مێشکییاندا بوونی هەبوو، وەک زاراوەی چەپەڵی بکوژ، ئەوجا سەرسوڕمانی ئاپۆڕەی خەڵکەکە ڕەویەوە، مۆڵەتی کاردانەوەیەکی گونجاو هاتە پێشەوە: زارەکان کەوتنە گەڕان، هەزاران چاو دووبارە ژیانەوە. ئەوسا تاکە تووڕەیی و هاواری تۆڵە تەقییەوە: "دەمانەوێت بیخەنە بەردەستمان!" خۆیان دادەپچڕاند کە پەلاماری سەرا بدەن، تا بەدەستەکانی خۆیان بیخنکێنن، لێکی هەڵبزڕێنن و پارچەپارچەی بکەن. پاسەوانەکان هەموو هەوڵێکیان دا، دەروازەکەی دابخەن و خەڵکەکە بۆ دواوە بگەڕێننەوە. بە پەڵە گرێنوی بردرایەوە ژووری بەندیخانە. سەرۆکی دادگا هاتە بەردەم پەنجەرەو بەڵێنی بە خەڵک دا، کە دادگاییکردنێکی خێراو نموونەیی بەڕێوەببات. لەگەڵ ئەوەش چەندین سەعاتی پێ چوو، تا ئاپۆڕەکە پەرتەیان لێ کرد و، چەندین رۆژی پێ چوو، تا شارەکە ئارام بووەوە.

جا بە ڕاستی دادگایی کردنی گرێنوی یەگجار بە خێرایی دەستی پێکرد، چونکە نەک هەر بەڵگەکان زۆر و رۆشن بوون، بەڵکوو شکاتلێکراو خۆشی لە کاتی لێکۆڵینەوە، بێ ئەوەی نکۆڵی لەو تاوانانە بکات کە خرابووە پاڵی، دانی بە هەموو شتێک نا.

تەنها لە پرسیاری ئەوەی کە چی پاڵی پێوە ناوە، کە بەم تاوانانە هەڵبستێت، نەیدەتوانی هیچ وەلامێکی قناعەتهێن بداتەوە. تەنها ئەمەی دووبارە دەکردەوە، کە ئەو پێویستی بە کچەکان هەبووە، لەبەر ئەوە کوشتوونی. بۆچی پێویستی بە کچەکان هەبووە، مەبەستی لەوە چبوو، "پێویستی بە کچەکان هەبووە"، لەمە بێ دەنگ دەبوو. بۆیە خرایە بەر ئەشکەنجەدان، چەندین سەعات سەرەو ژێر

به قاچەکانی هەڵیاندەواسی، بە پەمپ حەوت شووشە ئاویان تێ کرد، پێیان لە قالب دا، بەلام هەمووی بێ سوود بوو. وا دەهاتە بەرچاو، کە هەستی بە ئازاری جەستە نەدەکرد، هیچ ناڵەناڵ و هاوارێکی لێ نەدەهاتە دەر، کە پرسیاریان لێ دەکردەوە، هەر ئەوەندەی دەگوت: "من پێویستیم بە کچەکان هەبوو." دادوەرەکان گوتیان ئەمە نەخۆشی دەروونی هەیە. وازیان لە ئەشکەنجەدانی هێنا و بڕیاریان دا، چیتر لێکۆلینەوەی لەگەڵدا نەکەن و دادگاییکردنەکە بگەیەننە کۆتایی.

تاکە رێگر لە رێگەی ئەمەدا کە هەبوو، هەوڵ و تەقەلای شارەوانی دراگوینان، کە دادگای ناپۆلی کەوتبووە ئەوێ، هەروەها هی پەرلەمانی ئایکس، هەردوولایان هەوڵیان دەدا، کە دادوەریەکە ببەنە لای خۆیان. بەڵام دادوەری گراس رێگەی نەدەدا، پرسەکەیان لەدەست دەربهێنن، چونەک ئەوان بوون، کە بکوژەکەیان گرتبوو، لە سنووری حوکمی ئەواندا، زۆرینەی قوربانییەکان کوژرا بوون، ئەگەر بکوژەکەیان بۆ دادگایێکی تر بناردبایە، دەکەوتنە بەر هەڕەشەی تووڕەیی گەل. پێویست بوو خوێنەکەی لە گراس بڕژێنرێت.

لە ١٥ی نیسانی ساڵی ١٧٦٦ حوکمەکەی دەرچوو، لە ژووری بەندیخانەدا بۆ شکاتلێکراو خوێندرایەوە: "پێویستە لە ماوەی بیستوچوار سەعاتدا، شاگردی دەباغخانە جۆن پاتیست گرێنوی، ببرێتە بەردەم دەروازەی کۆرسی شار، لەوێ روو لە ئاسمان، بە خاچێکی دار ببەسترێتەوە، بە زیندوویی دوازدە جار بە شیشی ئاسن لێی بدەن، تا ئێسقانەکانی باسک و لاق و سمت و شانەکانی ورد و خاش دەبن، پاشان تا مردن بە خاچەکەوە هەڵبواسرێت." بە شێوەیەکی ئاسایی، تاوانباران دوای وردوخاشکردنی ئێسقانەکانیان، وەک بەزەیی پیاهاتنەوە، بە بەنێک دەخنکێندران، بەڵام بە رۆشنی ئەمەیان بە جەڵلادەکەی گرێنوی راگەیاند، ئەگەریش گیانەڵای مەرگی چەندین رۆژ بخایەنێت. ئەوجا دەبوایە لاشەکەی لە گۆڕستانی تاوانکاران بشاردرابایەوەو گۆڕەکەی بێ نیشان شوێنبزر بکرێت.

گرێنوی لە بیستنی حوکمەکەی هیچ کاردانەوەیەکی پێشان نەداو خۆی تێک نەدا. فەرمانبەری دادگا لێی پرسی، کە ئایا دوا ئارەزووی چیە. گرێنوی وەڵامی دایەوە: "هیچ"، هەموو ئەو شتانەی هەیە، کە پێویستیەتی.

قەشەیەک چووە ژوورەکەی، تا گوێ لە دانپێدانان لە گوناهەکانی بگرێت و پەیڤەکانی پەشێمانی لێ وەربگرێت. بەڵام دوای چارەگە کاژێرێک هاتە دەرەوە، بێ ئەوەی چی وەگیر بکەوێت. مەحکومکراو کە گوێی لە ناوی یەزدان دەبوو، تەقەی سەری دەهات، وەک ئەوەی ئەوە یەکەمین جارە ئەو ناوە ببیستێت، پاشان لەسەر تەختەکەی راکشاو یەکسەر رۆچووە ناو خەوێکی قووڵ. هەموو قسەیەکی تر بۆ ئەو شتێکی بێ مانا بوو.

له ماوەی دوو رۆژی دوایی خەڵکێکی زۆر هاتن بۆ ئەوەی لە نزیکەوە ئەو بکوژە بەناوبانگە ببینن. پاسەوانەکان رێگایان دەدان کە لە دەرچەی ژوورەکەی تەماشای بکەن، بۆ هەر تەماشاکردنێک شەش سۆلیان وەردەگرت. مسگەرێک کە دەیویست رەشنووسی نیگارێکی بۆ بکێشێت، دوو فرانکیان لێ وەرگرت. بەڵام ناواخنی نیگارەکەی پتر هیوابڕاوی پێوە دیار بوو. مەچەکی دەست و پێیەکانی بەندییەکە بە زنجیر بەسترابوونەوە، تەواوی کاتەکە لەسەر تەختەکە راکشا بوو، نووستبوو. رووی خۆی لە دیوار کردبوو، هیچ کاردانەوەیەکی پێشاننەدەدا، کاتێک لە دەرگاکەیان دەدا یان هاواریان دەکردێ. بە هیچ شێوەیەک بۆ تەماشاوانەکان نەبوو پێ بخەنە ناو ژوورەکەی، هەرچەندە بە بەرتیل هەوڵی زۆر دەدرا پاسەوانەکان دەستەمۆ بکەن، بەڵام پاسەوانەکان نەدەوێران ئەو فەرمانی قەدەغەکردنە ببەزێنن. ترسی ئەوە هەبوو کە کەسێک یان خزمێکی کوژراوەکان لە کاتێکی ناوەختدا دەستی بۆ درێژ بکەن و بیکوژن. هەر بەو هۆیەشەوە قەدەغە بوو کە خواردنی بۆ بهێنن. لەوانە بوو ژەهرخواردووی بکەن. تەواوی کاتی زیندانییەکەی گرێنوی تەنها خواردنی ئاشپەزخانەی خزمەتکارانی کۆشکی قەشایەتی دەدرایێ، ئەوش دەبووایە پێشتر سەرکاری چاودێرانی زیندان خۆی لێی بخوات. خۆ لە دوو رۆژی دوایی هیچی نەخوارد. هەر لەسەر تەختەکەی پاڵکەوتبوو و نووستبوو. جار جار کاتێک زڕەی زنجیرەکانی دەهات، پاسەوانەکەی بە خێرایی بەرەو دەرچەی دەرگاکەی دەچوو، قومێک ئاوی لە شووشە ئاوەکەی فڕدەکردو، خۆی دەهاویشتەوە سەر تەختەکەی و دەنووستەوە. وا دەهاتە بەرچاو کە ئەو مرۆڤە ئەوەندە لە ژیانی خۆی بێزار و خەستە بووە، کە چیتر نایەوێت لەو چەند کاژێرەی دواییدا بە واگایی ئاگای لە ژیان ببێت.

لە لایێکی تر مەیدانی کۆرس بۆ ئیعدامکردنی ئامادە دەکرا. دارتاشەکان سەکۆی ئیعدامکردنییان بۆ دادەمەزراند، سەکۆیەکی سێ بەسێ مەتر و دوو مەتر بەرز، کە پەرژین و پەیژەیەکی قایمیشی هەبوو، چ جاران شاری گراس شانۆی وا پوخت و پۆشتەی ئیعدامکردنی بەخۆوە نەدی بوو. سەکۆیێکی تەماشاکردنیش بۆ ژن و پیاوە ماقووڵەکانی شار دروستدەکرا، لەگەڵ پەرژینێک لە نێوان ئەو سەکۆیەو خەڵکی ئاسایی تر، کە دەبووایە هەندێک دوور بەرزەفت بکرێن. پەنجەرەکانی کۆشک وبالاخەنەکانی چەپ و راستی دەروازەی کۆرس و بینای پاسەوانەکان، لەمێژ بوو، بە پارەیەکی خەیاڵی بەکرێ چووبوون. تەنانەت نەخۆشخانەی شاریتێش، کە کەمێک دوور و لاچەپیش هەڵکەوتبوو، کۆمەککاری جەللاد، سەودای لەگەڵ نەخۆشەکان کردبوو، بە قازانجێکی باش هەموو ژوورەکانی بەکرێ دابووەوە تەماشاچیان. شەربەتفرۆشان بە بەرمیل شەربەتی لیمۆیان لەگەڵ شەکراو تێکەڵکردبوو، مسگەر هەندێک کاری لەسەر رەشنووسی نیگارەکەی کردبوو، کە لە کاتی تەماشاکردنی بکوژ لە زیندان کێشابووی، سەدان دانەی لێ

چاپکردبوو، چەند دێوەرەو فرۆشیارانی دەستگێڕ روویان لە شارەکە کردبوو، نانەواکان کولیچەیان لە چەشنی وێنە بۆ هەڵگرتن و بیرەوەری برژاندوبوو.

وەستا پاپۆنی جەللاد، کە چەند ساڵێک بوو هیچ تاوانبارێکی وردوخاش نەکردبوو، شیشەئاسنێکی برگە چوارگۆشەیی لای ئاسنگەر بەڕادان دابوو، بە خۆو بەو ختورمە ئاسنە چووە مەیدانی قەسابخانە، تا لەسەر کەلاکی گیانەوەران بە ختورمەکەی راهێنان بکات. ئەو بۆی هەبوو تەنها دوازدە جار ئاسنەکەی رابوەشێنێت و بەو دوازدە جارە بە دڵنیاییەوە دوازدە جومکە ورد و خاش بکاتن، بێ ئەوەی بەشە گرنگەکانی جەستە، وەک سنگ و کەللەسەر زیانیان بەربکەوێت. ئەم کارە وردە، هەستیاری و دەسترەنگینییێکی زۆری گەرەکە.

هاووڵاتییان خۆیان بۆ ئەو رووداوە ئامادەکردبوو، وەک ئەوەی خۆیان بۆ ئاهەنگێکی گەورە ئامادە بکەن. کارنەکردن لەم رۆژەدا شتێکی ئاسایی و پوازشنەویست بوو. ژنان جلی رۆژانی بێکارییان ئوتوو کردبوو، پیاوان سەترەکانی خۆیان لە تۆز داوەشاندبوو، رایانسپاردبوو جزمەکانیان وا بۆ بۆیە بکەن، کە ببریقێنەوە. ئەوانەی نیشان و مەدالیای سەربازی و داموودەزگاکانی دەوڵەتییان هەبوو، ئەوانەی پلەی وەستاییان هەبوو، ئەوقاتەکان، دادنووسەکان، سەرۆکی هاوبەندییەکان، یان ئەوانەی نیشانێکی گرنگییان هەبوو، هەموو قاتی رەسمی خۆیان پۆشی بوو، پلەو خەت و نیشان و زنجیر و مەدالیاو بارۆکی بە پۆدرە سپیکراویان پۆشی بوو. بڕواداران بیریان لەوە کردەوە کە دواتر بۆ نوێژکردن کۆببنەوە، شەیتانپەرستەکان نوێژێکی سوپاسگۆیی شەیتانانە بکەن، ناودارە ماگنێتناسەکان لە مێوانخانەکانی کابریس و ڤیلنۆیس و فۆنتمیشێل کۆبوونەوە. ئاشپەزخانەکان دەستییان کردبوو بە برژاندن و سوورکردنەوە، شەراب لە ژێرزەمینەکانەوە دەهێندران، لە بازاڕەکان گوڵی ڕازانەوە دەهێنران، لەناو کڵێساش ئۆرگانژەن و کۆری سروود مەشقییان دەکرد.

ریچ لە ماڵەکەی خۆیدا لەسەر شەقامی دۆریت خۆی مات کردبوو. ئەو حەزی دەکرد، هەموو ئامادەکارییێک بۆ رۆژی ئیعدامکردنی بکوژ قەدەغەبکرێت، ئەو رۆژەی خەڵک ناویان بە "رۆژی ئازادی" دەبرد. لای ئەو ئەمە هەرایێکی قێزەوەن بوو. دووبارە گەڕانەوەی ترس و لەزر بۆ ناو خەڵکەکە، لای ئەو شتێکی قێزەوەن بوو، ئەو ئاهەنگ و خۆشییەش لای ئەم روودانێکی قێزەوەن بوو. هەموو خەڵکەکەی پێکەوە قێزەوەن دەهاتە بەرچاو. نەچوو بۆ دیدەنی پێشانگای بکوژ و قوربانییەکان لە مەیدانی بەردەم کڵێسا، هەروەهاش بۆ دادگایی کردنەکەشی نەچوو، بەشداری نەکرد لە هەڵەداوانە قێزەونەکە بۆ تەماشاکردنی حوکمدراو لە ژووری بەندیخانەکەی. بۆ ناسینەوەی قژ و بەرگی کچەکەشی نەچوو، رایسپارد کە دادگا بیانهێنێتە ماڵەکەی، لە ماڵەوەش بە کورتی

قسەی خۆی کرد و، تکای کرد، کە ئەگەر دەکرێت وەک پاشماوەیێکی پیرۆز شتەکانی بۆ بەجێبهێلن، ئەو داوایەشییان جێبەجێ کرد. قژ و جلوبەرگەکەی هەڵگرت بردنیە ژوورەکەی لاورا، کراسەخەوە پارچەپارچەکراوەکەو بەرگەکانی تری خستە سەر تەختەخەوەکەی، قژە سوورەکەی خستە سەر سەرینەکەی و لەبەردەم تەختەکە دانیشت، ئیتر شەو و رۆژ ژوورەکەی بەجێ نەدەهێشت، وەک ئەوەی بەو پاسەوانییە بێ سوودە، ئەو هەڵە قەرەبوو بکاتەوە، کە لە شەوەکەی ناپۆلی بەسەریدا تێپەڕی. ئەوەندە پڕ ببوو لە قێزەونی، قێزی لە هەموو دونیا دەبووەوە، قێزی لە خۆی دەبووەوە، کە نەیدەتوانی بگرییێت.

قێزی لە بکوژەکەش دەبووەوە. ئەو نەیدەویست جارێکی تر وەک مرۆڤێک بیبینێت، بەڵکوو تەنها ئەو کاتەی کە وەک قوربانیێک سەردەبڕدرێت، دەیویست تەنها کاتێک ئیعدام دەکرێت بیبێنێت، ئەو کاتەی دەیخەنە سەر خاچەکەو دوازدە خوتورمەی ئاسن لەسەر جەستەیدا زرچەی دێت، ئەوجا دەیەوێت چاوی پێ بکەوێت، زۆر لە نزیکەوەش بیبێنێت. بۆیە جێگەیەکی لە ریزی پێشەوە بۆخۆی گرتبوو. وای دانا بوو، کاتێک کە خەڵکەکە هەموو پەرتەی لێ دەکەن، ئەوجا چەند سەعاتێک دواتر بچێتە سەر سەکۆ خوێناویەکەو لە تەنیشتی دابنیشێت و پاسەوانی بگرێت، ئەگەر پێویست بوو، بە درێژایی رۆژ، تەمەشای ناو چاوی بکوژی کچەکەی بکات، هەموو پیسایی خۆی رووبکاتە ناو چاوەکانی، ئەوەی لە ناویا هەیە، هەمووی وەک تیزابی سووتێنەر بڕژێنێتە سەر گیانەڵای مەرگی، تا دەتۆپێت...

پاشان؟ پاشان چی؟ نەیدەزانی. رەنگە ئەوجا دەستبکاتەوە بە ژیانی ئاسایی خۆی، لەوانەیە ژنێک بهێنیت، لەوانەیە کوڕێکی ببێت، خۆ لەوانەشە هەر هیچ نەکات، لەوانەیە بمرێت. لای ئەو هیچی گرنگ نەبوو، چ دەبوو با ببووبایە. ئەوەی بە شتێکی زۆر بێ مانا هاتە بەرچاوی، کە بیر لەمانە بکاتەوە، وەک ئەوەی بیر لەوە بکاتەوە، کە لە دوای مەرگی خۆی چی بکات: هیچ، بێگومان هیچ، دەیتوانی لە ئێستاوە، ئەوە بزانێت.

## ٤٩

کاتژمێر پێنجی ئێوارە کاتی ئیعدامکردنەکە بوو. بەیانی زوو خەڵک بۆ تەماشاکردن و بۆ جێگاگرتن لە مەیدانەکەدا کۆببونەوە. کورسی، تەختەپێ، سەرین، شەراب، خواردن و خواردنەوەیان بۆخۆیان و منداڵەکانیان لەگەڵ خۆ هێنابوو. دەوری نیوەڕۆ خەڵکی دێهاتەکان لە هەموو لاییێکەوە کۆمەڵ کۆمەڵ بە شاڵاو دەهاتن، مەیدانەکەی کۆرس جممەی دەهات، دەرزیت هەڵبهاویشتبایە بەر زەوی نەدەکەوت، ئەوانەی تازە دەهاتن، دەبووایە بەسەر لێوار و سەکۆی دەم باخچەکانی ئەملاو ئەولای مەیدانەکەو شەقامەکان هەڵبگەڕێن و رووەو گرێنوی جێیەک بۆخۆیان بدۆزنەوە. فرۆشگاکان ئەو رۆژە بازاڕیان گەرم بوو، دەیانخوارد، دەیانخواردەوە، بەزم و هەرا بوو، دەتگوت ئاهەنگی سەری ساڵە. هێندەی نەبرد هەزاران کەس کوبوونەوە، پتر لە ژمارەی ئەو خەڵکەی کە بۆ کەرنەڤاڵی شاژنی یاسەمین کۆدەبنەوە، لە هەموو ماجەرای ئیعدامکردنەکانی پێشووتری شاری گراس، خەڵک پتر کۆببوونەوە. بێ شومار خەڵک کۆببوونەوە. بە درەختەکان هەڵگەڕابوون، لەسەر دیوار و سەربانەکان لەسەر چیچکان دانیشتبوون، لەبەر هەر پەنجەرەیەک دە کەس، دوازدەکەس قەرەپەستانێیان بوو، تەنها چەقی مەیدانی کۆرس بە هۆی پەرژینێک پارێزرا بوو، ئەو چەقەش وەک کونێک لە ناو ئاپۆرەی خەڵکەکە دەهاتە بەرچاو، تەنها شوێنی سەکۆکەو شوێنی جەللاد خاڵی مابووەوە، کە ئەویش لە چاو رووبەر و بارستەی ئەو ئاپۆڕەیە زۆر بچووک دەردەکەوت، دەتگوت ئامرازێکی یاریە، یان دەتگوت سەکۆیێکی شانۆگەری لەیزتۆکانە. رێگاییێکیش لە مەیدانی ریشتەوە تا دەروازەی کۆرس و تا جادەی درۆیت خاڵی هێشترابووەوە.

کەمێک دوای کاتژمێر سێ، وەستا پاپۆنی جەللاد و بەردەستەکانی دەرکەوتن. دەنگی چەپڵە بەرزبووەوە. بەردەستەکان خاچەکەیان هێنایە سەر ساباتی ئیعدامکردن، خاچەکە لە کاریتەی دار دروستکرابوو، خاچەکەیان لە شوێنی خۆی و بە بەرزی گونجاو لەسەر چوار مێزی دارتاشی دامەزراندو بە بزمار توند قایمیان کرد. دارتاش و بەردەستەکانی جەللاد دەستیان بۆ هەر کارێک دەبرد، لە ئاپۆڕەی خەڵکەکەوە شەپەشەپی چەپلەلێدان بەرز دەبووەوە. کاتێکیش پاپۆن بە خۆو بە خوتورمە ئاسنینەکەی هاتە مەیدان، لە دەوری خاچەکە سووڕایەوە، هەنگاوەکانی خۆی ئەندازە

گرت، جارێک لەم لاو جارێکی تر لە لاکەی تر، شیشە ئاسنەکەی یەک دوو جار راەوشاند و تاقی کردەوە، ئیتر بە جارێک هوراو چەپڵەلێدان دەنگی دایەوە.

کاتژمێر چوار سەکۆکانی تەماشاکردن هەمووی پڕ بوون. پیاوماقووڵانێکی زۆر هاتبوون، دەوڵەمەندەکان بە خۆیان و نۆکەرەکانیان هاتبوون، گرانیان دەفرۆشت، خانمانی شۆخ و جوان، شەبقەی زەبەلاح، جلی چەمەنچقزی بریقەدار. تەواوی خانەدانەکانی وڵات هەموو ئامادەبوون. پیاوانی ئەنجوومەن بە خۆو بە قات و کەرەواتەوە، کە هەردوو کۆنسوڵ لە پێشەوەیان دەرۆیشتن. ریچ بەرگێکی رەشی لەبەردا بوو، گۆرەوی ڕەش، شەبقەی ڕەش. لە پشتەوەی پیاوانی ئەنجوومەن، فەرمانەبەرانی دەزگاکانی تری شارەوانیش بە پێشڕەوایەتی سەرۆکەکانی دادگا، یەک بە دوای یەک بە ڕیز هاتن. لە دوای هەمووانەوە جەنابی قەشە لەسەر کەژاوەیەکی کراوە، بە کەوایەکی درەوشاوەی رەنگ بنەوشەیی و کڵاوێکی سەوز هاتە سەر سەکۆی تەماشاکردن. ئەوانەی کڵاویان لەسەر بوو، کڵاوەکەیان لە سەری خۆیان کردەوە. ئیتر ئاهەنگێکی گەورە بوو بۆ خۆی.

نزیکەی دە خووڵەکی پێ چوو هیچ شتێک رووی نەدا. گەورەپیاوان هەموو لە شوێنی دیاریکراوی خۆیان دانیشتن. خەڵک نقەی لێوە نەدەهات، کەس هیچی نەدەخوارد، هەموو چاوەڕوانییان دەکرد. پاپۆن و بەردەستەکانی لەسەر سەکۆی ئیعدام وەستا بوون، دەتگوت بە پێچ قایم کراون. رۆژێکی گەورەو زەرد بەرامبەر سەکۆکە لار ببووەوە. لە حەوزە ئاوەکانی گراس بایێکی هوڕە دەهات و بۆنی گوڵە نارنجی بەو ناوەدا بڵاودەکردەوە. دنیا زۆر گەرم بوو، بە تایبەت بە هۆی کپی و بێ دەنگی نائاسایی خەڵکەکە.

نە دەکرا ئەو بارە ئاوها سەقامگیر ببێت، دەبووایە ئەو گرژییە درێژە نەکێشێ و خاوببێتەوە، بێ ئەوەی هەزاران هورا و هەراو قیژە قیژ بتەقێتەوە، بێ ئەوەی تەنگەتاوی قەڕەپەستانێ رووبدات، یان رووداوێکی تری جەماوەریی بقڵیشێتەوە، تەقە تەقی ناڵی ئەسپ و جیرەی چەرخی گالسکە خەڵکی واگا هێنا.

لە جادەی درۆیتەوە گالسکەیەکی داخراو هاتەخوارەوە، جێگەی دانیشتنی دوو ریز بوو، ئەمە گالسکەی هەیتەکان بوو. لە دەروازەی شار هاتە ژوورەوەو کەوتە بەرچاوان، هەموو کەسێک لە شوینی خۆیەوە دەیدیت، هاتنە ناو کووچە باریکەکە، بەرەو مەیدانەکە دەهات. بۆ ئەوەی بەم شێوە پۆلیسەکان بە سەرکەوتوویی تێپەڕ ببن، چونکە ئەگەر وایان نەکردبایە، لەوانە بوو نەتوانن گیانی تاوانبارەکە بپارێزن. دەنا ئەم جۆرە هاتنە شتێکی ئاسایی نەبوو. بەندیخانەکە هەر پێنج خولەک لە مەیدانی ریشت دوور دەبوو یان نەدەبوو، جاران ئەگەر لەبەر هەر هۆیێک مەحکومکراو

نەیتوانیبایە ئەم ڕێگا کورتە بە پێ ببڕیت، ئەوا بە کەر و عارەبانەیەکی کراوە دەیانهێنا. هەرگیز کەس پێشتر شتی وای نەدیبوو، مەحکومێک بە گالسکەی داخراو و بە یاوەری خزمەتکاری پۆشتەو ئەسپسواران بهێنرێت بۆ مەیدانی ئیعدام.

سەرەڕای ئەوەش هیچ پشێوی و نائارامی نەکەوتە ناو ئاپۆڕەی خەڵکەکە، بە پێچەوانەوە، خەڵکەکە دڵیان خۆش بوو، کە بەلای کەم شتێکیان بینی، هاتنی گالسکەکەیان وەک شێوازێکی سەرکەوتوو هاتە بەرچاو، وەک چۆن لە شانۆگەرییەکدا، لە ناکاوێک، دیمەنێکی پێشتر لای خەڵک ناسراو، بە شێوازێکی زۆر نوێ پێشانبدرێت. تەنانەت زۆریان ئەو شێوازە هێنانەی بکوژیان بە شتێکی شیاو و گونجاو زانی. تاوانبارێکی وا گەورەو سامناک و نائاسایی، پێویستی بە رەفتاری ئاوا تایبەتە. نەدەکرا وەک ڕێگرێکی ئاسایی، بە زنجیرکراوی رابکێشرێتە ناو مەیدان و لەبن داران بکوژرێت. ئەو کاتە هیچ شتێکی سەرنجراکێشی تێدا نەدەبوو. کەسێک لەسەر کوشنی نەرمونیانەوە راکێشیت و بیخەیتە سەر خاچی مەرگ، ئەوەیە ئازاردان، ئازاردانێک کە لە ڕادەبەدەر هەستی پێ بکرێت.

گالسکەکە لە نیوان سەکۆی ئیعدام و سەکۆی تەماشاوانان وەستا. خزمەتچییەکان بە قەڵەمباز دابەزین، گیرەکەیان لابرد و پەیژۆکەکەیان بەرەو خوارەوە راکێشا. گەورەی پۆلیسەکان دابەزی، پاشان ئەفسەرێکی پاسەوانی، دوای ئەوانیش گرێنوی. گرێنوی چاکەتێکی شین و کراسێکی سپی لەبەردا بوو، گۆرەوییێکی ئاوریشمی سپی، پێڵاوێکی رەشی قەیتاندار. زنجیر نەکرا بوو، کەس قۆڵی نەگرتبوو. وەک کەسێکی ئازاد لە گالسکەکە دابەزیە خوارەوە.

پاش ئەمە شتێکی عەنتیکە قەوما، پەڕجووێک ڕوویدا، یان شتێکی وەک موعجیزە، واتە شتهایێک کە بۆ کەس ڕۆشن نەبوو، کەس تێی نەدەگەیشت، شتێکی نەبیستراو و باوەڕپێنەکراو، کە دواتر هەموو ئەوانەی کە لەوێ بە چاوی خۆیان دیبوویان، ئەگەر ڕوویان هەبایە بیگێڕنەوە، وەک پەڕجووێک باسیان لێوە دەکرد، چونکە هەموو شەرمییان دەکرد باسی ئەوە بکەن، کە ئەوانیش تێیدا بەشدار بوون.

شتەکە ئاوا بوو، هەزاران خەڵکی کۆبووەوەی ناو مەیدانی کۆرس و سەرشەقام و بەرزاییەکانی دەوروبەر، لە پڕێکدا هەستییان بە شتێکی نائاسایی کرد، هەستییان بەوە کرد، کە باوەڕێکی پڕ خورپەو هەژێن رژایە ناو دەروونیان، هاتە خەیاڵییان، پیاوە بچووکە چاکەت شینەکە، ئەوەی کە لە گالسکەکە دابەزیە خوار، ***قەت ناکرێ و نابێ کەسێکی بکوژ بێت***. نەک لەبەر ئەوەی گومانییان لەمە هەبووبێت، کە ئەمە خودی گرێنوییە! چونکە دەیاندیت، کە ئەمە هەمان ئەو کەسەیە کە چەند رۆژ پێشتر لە مەیدانی کڵێسا، لەبەر پەنجەرەی قشڵە دیبوویان و ئەوەندە رقییان لێ ببوو

که بەگرتنی خۆشحاڵ ببوون، حەزیان کردبوو، هەنجن بە هەنجنی بکەن.  هەر ئەو کەسە بوو دوو رۆژ پێشتر، بە بەڵگەی رۆشن و بە دانپێدانانی خۆی، بە پێی یاسا حوکم درا. ئەوە هەر ئەو کەسە بوو، کە چەند خولەکێک پێشتر بە مەراقەوە ئاواتەخوازی ئەوە بوون، کە زوو بیهێنن و ببینن چۆن بە دەستی جەللاد دەکوژرێت. هیچ گومان لەوەدا نەبوو، کە ئەوە هەمان ئەو کەسە بوو.

بەڵام لەگەڵ ئەوەش ئەوە ئەو کەسە نەبوو، نابێت ئەمە ئەو بووبێت، نەدەکرا ئەو کەسە کابرایێکی بکوژ بێت. ئەو پیاوە کە ئێستا لە مەیدانەکەی ریشت وەستابوو، پڕ بوو لە بێ گوناهی. لەم چاوتروکانەدا هەموو ئەوەیان دەزانی، هەر لە سەرۆکی قەشانەوە تا دەگەیشتە شەربەتفرۆشەکان، هەر لە گرافەوە تا دەگەیشتە پاسەوانەکان، هەر لە سەرۆکی دادگاوە تا دەگەیشتە لاوەکانی سەرجادە.

پاپۆنی جەللادیش ئەمەی دەزانی. مستەکۆڵەکانی کە بە توندی شیشەئاسنەکەیان گرتبوو، دەلەرزین. لە پڕێک هەستی بەوە کرد کە بازووە بەهێزەکانی خاوبوونەوەو داهێزران، ئەژنۆکانی شل بوون، دڵی ساف بووەوە وەک دڵی منداڵ. تازە نەیدەتوانی ئەو شیشە بەرز بکاتەوەو رایبوەشێنێت، نا هەرگیز لە ژیانی خۆیدا ناتوانێت هێزی ئەوە پەیدا بکات، ئەو شیشە ئاسنە لە پیاوێکی بچکۆڵەی بێ گوناهی ئاوا، بەرز بکاتەوە. پاپۆنی گەورە، پاپۆنی بەهێز، ئەوەی هاتە خەیاڵی، ئەگەر بێت و بیبەنە سەر سەکۆکە، هەموو جەستەی دەلەرزێت، ئەژنۆکانی شل دەبن، ناچار دەبێت خۆی بە شیشە ئاسنە بکوژەکەیەوە رابگریت، بۆ ئەوەی لە بێ هێزییان بەرنەبێتەوە!

حاڵی هەزاران پیاو و ژن و منداڵ و پیر لەم باشتر نەبوو، ئەوانەی لەوێ کۆببوونەوە: داهێزران هەموانی گرتبووەوە، وەک کچێکی بچووک، کە کەوتبێتە داوی دڵدارەکەی. هەستێکی خۆشەویستیی مەزن بەسەریاندا زاڵ بوو، هەستێک پڕ لە ناسکیی، ئەشقێکی گەورەی منداڵانە، بەڵێ، هەر خوا بۆ خۆی دەزانێت، نەیاندەتوانی و نەیاندەویست هیچ شتێک لە دژی ئەشقی پیاوە پوخە بکوژەکە بکەن. ئەمە وەک گریانێک بوو، کە نەتوانیت خۆتی لێ رزگار بکەیت، ئەمە وەک گریانێک بوو، کە دەمێکی درێژ لە ناو هەناوی خۆتدا بەندت کردبێت، لە ناکاوێک لە زگتا هەڵبقوڵێت و بەرزەفت نەکرێت و هەموو کۆسپ و بەرگرییێک بە شێوەی پەڕجوو، بتاوێنیتەوەو لە بەینیان بەرێت. خەڵکەکە ببوون بە شلەیەک و لە ناو ئەندێشەو رۆحی خۆیاندا تواببوونەوەو، ببوون بە شلەیەکی بێ شێوە، تەنها هەستییان بە دڵی خۆیان دەکرد، کە وەک بارستەیەکی نەوەستاو لە ناو دەروونییان دەلەرێتەوە، هەر یەکێکییان، چ مێ چ نێر، بۆ هەمیشە، چاک یان خراپ ئەو دڵەی خۆیان خستبووە ناو دەستی ئەو پیاوە بچووکە چاکەت شینە: هەموو خۆشییان دەویست، هەموو ئاشقی ببوون.

چەندین خولەک گرێنوی لەبەردەم دەرگەی کراوەی گالسکەکە بە ئاسوودەیی وەستا بوو، خۆی لە گووره نەدەبرد. خزمەتکارەکەی تەنیشتی خۆی بۆ چەماندبووەوەو بەردەوام پتر خۆی بۆ دەچەماندەوە، تا باری کرنووش بۆ بردن، وەک چۆن لە رۆژهەلات، خەڵک کڕنووش بۆ سوڵتان یان بۆ خودا دەبەن ئاوا. لە باری کڕنووشیشدا هەموو جەستەی دەلەرزی و دەهەژایەوە، وەک ئەوەی بیەوێت هێشتان خۆی بچەمێنێتەوەو بە تەواوی خۆی بخاتە سەر زەوی و رۆچێتە ناو زەوی و بچێتە ژێریەوە. دەیەویست لە هەستی خۆدەخیلکردن، ئەوەندە خۆی نقوومی ژێر زەوی بکات، تا دەگاتە بەرەکەی تری زەوی. ئەفسەری پاسەوانەکان و سەرۆکی یاساوڵان و دوو زەلامە زەبەلاحەکەی تر، کە ئەرکییان ئەوە بوو، مەحکومکراو بگرن و بیبەنە سەر ساباتی خوێناوی و بیخەنە بەردەستی جەللاد، چیتر نەیانتوانی خۆیان بگرن و ئەو کارە رابپەڕێنن، خۆیان خستە سەر زەوی و کەوتنە باوەشی یەکتری، خۆیان لێکتری کردەوەو، بێ ماناو مەبەست باسکی خۆیان لە هەوا رادەوەشاند، دەستی خۆیان دەقوچاند، موچڕکییان دەهاتێ، دەموچاوی خۆیان گێڕ دەکرد، دەتگوت گەشکەیان گرتووە.

دیار بوو خەڵکە دیار و ماقووڵەکانیش زۆر بە ئاشکرا کەوتبوونە ژێر کاریگەری ئەو ئەشقە. ئەوانیش خورپەی دڵی خۆیان ئازاد کرد. هەندێک لە ژنەکان کە چاویان بە گرێنوی کەوت، مستەکۆڵەکانی خۆیان پەستایە ناو کۆشی خۆیان و لە حەژمەتان هەناسەیان سوار بوو، ئەوانەی تر، لە ئەشق و ئارەزوویان بۆ ئەو گەنجە قۆزە، کە ئاوا دەهاتە بەرچاویان، دەستییان کرد بە گۆرانی بێ ئاواز و لە هۆش خۆیان چوون. هەندێک لە پیاوەکان، کە لە پێش ئەوان دانیشتبوون، لە شوێنی خۆیان هەڵدەبەزین و دادەبەزین، مشەمشیان دەهات، دەستی خۆیان توند بە دەسکی شمشێرەکانییان گرمۆڵە کردبوو، دەتگوت دەیانەوێت شمشێرەکانیان راکێشنە دەرەوە، رایانکێشا بوون، دیسان پاڵیان دەدایەوە ناو کاڵانەکان، خشەو کرتە لە کاڵانەکانەوە دەهات، هەندێکی تر چاویان بەرەو ئاسمان بەرز دەکردەوەو دەستەکانیان بۆ نزا رادەگرت، جەنابی قەشە، وەک ئەوەی رشانەوەی بێت، خۆی چەماندبووەوەو نێوچەوانی خۆی بە جۆرێک خستبووە سەر ئەژنۆکانی، کڵاوە سەوزەکەی لار ببووەوە، بەلام رشانەوەی نەدەهات، بەڵکوو ئەوە یەکەمین جاری بوو لە ژیانی، موچڕکێکی خودایی بە لەشیا دابێت، چونکە دەیدیت، وا لەبەر چاوی هەموو خەڵکدا موعجیزەیەک روو دەدا، خودا بە خودی گەورەیی خۆی کەوتبووە باوەشی جەللاد، کە خۆی وەک فریشتە پێشاندەداو لەبەر چاوی دنیا وەک بکوژ دیار بوو —ئۆە خودایە، هەمان شت لە سەدەی هەژدەم روویدا. خودا چەندە مەزن بوو! ئەو پیاوەش چەندە بچووک و نابووت، ئەو پیاوە فەرمانی دەرچوونی دا لە ئاینی کڵێسا، بێ ئەوەی

باوەڕی پێ هەبێت، تەنها بۆ ئارامکردنەوەی گەل! ئای ئەوە چ کارێکی ناڕەوایە، چ باوەڕێکی لاوازە! ئێستاش ئەوە خودایە، وا پەڕجووێک پێشاندەدات! ئەوە چ شەرمەزارییێکە، چ کەمایەتییێکی شیرینە، چ بەزەییێکە، کە وەک قەشەی خودا، ئاوا موچڕکت بێتێ.

خەڵکی ئەملاو ئەولای پەرژینەکە، وردە وردە پتر بێ شەرمانە، هەستی نامۆی خۆیان پێشاندەدا، ئارەزووی خۆیان بەرەڵلا دەکرد. ئەو هەستەی کە لەدەرکەوتنی گرێنوی بەسەریاندا زاڵ بوو. ئەوەی لە سەرەتاوە لەگەڵ دیتنی تەنها هەستی بە هاوسۆزی و کاریگەریی کردبوو، ئەوا ئێستا پڕ ببوو لە ئەشق و هەوەس، ئەوەی دواتر کەوتە ئەشق و ئارەزووی، ئیتر خەریکی حاڵگرتن بوو. هەموویان تێکڕا، بە هەموو توانای بیرکردنەوەیان، ئەو پیاوە چاکەت شینەیان وەک جوانترین و سەرنجراکێشترین و تەواوترینی بوونەوەران دەهاتە بەرچاو: ڕەبەنەکانی دێر، وەک ڕزگارکار و فریادرەس دەهاتە بەرچاویان، شەیتانپەرستەکان دەیانگوت ئەوە خۆیەتی شای تاریکیی، مونەوەرەکان وەک بەرزترین بوونەوەر دەیاندیت، کیژە لاوەکان وەک شای ئەفسانەکان، پیاوان وەک نموونەییترین نیگاری خۆیان. هەمووشیان هەستییان بەوە دەکرد، کە ئەو پیاوە، شوێنە هەستیارەکانی جەستەیانی پێکاوە، چەقی ئێرۆسی ئەوانی پێکا بوو. وەک ئەوە وابوو، کە ئەو پیاوە هەزاران دەستی نادیاری هەبوو بێت و، هەر دەستێکی خستبێتە سەر ئەورەت و سیرەتی ئەو هەزاران کەسەو هەستی هەوەس و خۆشییان بجۆشێنێت و، هەر یەکێکیان، چ پیاو، چ ژن، لە ناو نهێنیترین ئەندێشەیاندا، کەوتبنە ئەو پەری لەززەتی هەوەس.

لە ئەنجامدا، نەخشەی ئیعدامکردنی چەپەڵترین تاوانکار لە کاتی خۆیدا، گۆڕا بۆ گەورەترین ئاهەنگی هەوەس و ڕابواردن، ئاهەنگێک کە جیهان لە دوو سەدەی بەر لە هاتنی حەززرەتی مەسیحەوە تا ئێستا، بە چاوی خۆی نەدیبوو: ژنانی خانەدان کراسەکانی خۆیان هەڵدەزڕاند و بە زریکاندنێکی شێتانە سنگی خۆیان واڵا دەکرد، بە کراسی هەڵکراوەوە لەسەر زەوی ڕادەکشانە سەر زەوی، پیاوان بە تەمەشای شێتانە ساتمەیان دەکرد، دەکەوتنە سەر مێرگی ئەو گۆشتە خرپنە هەڵخراوانەو بە پەنجەی لەرزۆکییانەوە، چووکی خۆیان لە شەڵوارەکانیان دەردەهێنا، کە دەتگوت بە بەستەڵەکێکی نادیار ڕەق بەستووبوویان، بە هەناسەبڕکێ و مشەمش لە شوێنێکیان رادەکرد، جا لە هەر شوێنێک بایە، گرنگ نەبوو، بە ناجوری جووت دەبوون و دەپەڕین، پیاوی پیر لە کچان، خوڵام لە ژنی ئەوقات، منداڵانی قوتابخانە لەگەڵ ڕەبەنەکانی دێر، ڕەبەن لەگەڵ بیناکار، هەموو تێکئاڵابوون، چۆنی هات و چونی ڕێکەوت. هەوا پڕ ببوو لە بۆنی شیرینی ئارەقەی هەوەس،

لە دەنگی ئاە و قیژە، لە مشاندن و مڕاندن، لە هەناسەبڕکێی هەزاران گیانەوەری مرۆیی. ئەوە کەڕنەڤاڵێکی گانبازی و گەلەگانی بێ شەرمانەی دۆزەخیی بوو.

گرێنوی لەو ناوە وەستا بوو پێدەکەنی. ئەو خەڵکەی کە دەیاندیت، وایان دەزانی ئەوە پێکەنینی ئەشقە، ئەوە پێکەنینێکی پاکی بێ گوناهیی و خۆشەویستییەو، لە هەمانکاتدا ئەوە پێکەنینە بە پێکەنینە فرێودەرکانی دونیا. بەڵام لە ڕاستیدا ئەوە پێکەنین نەبوو، ئەوە زەردەیەکی ناشیرینی مەکربازانە بوو، کەوتبووە سەر لێوەکانی، ئەوە تەواوی خۆشحاڵی و بێباکییەکانی بوو کە دەردەکەوتن. ئەو، جۆن پاتیست گرێنوی، کە لە بۆگەنترین شوێنی جیهان بەبێ بۆن لەدایکببوو، لەناو زبڵ و پاشەڕۆک و کەلاک سەری هەڵدابوو، بێ نازو خۆشەویستی گەورە ببوو، ژیانێک بێ گەرمی مرۆڤیی، تەنها بەهۆی کەللەڕەقی و هێزی قێزەونی خۆی، نابووت، پوخە، کووڕ، شەل، ناشیرین، دابڕاو، چەپەڵ، لە ناوەوەو دەرەوەی، – لەگەڵ ئەوەش توانی خۆی لەبەر چاوی دونیا خۆشەویست بکات، خۆشەویستی چی؟ ئاشقی ببن! شەیدای ببن! ڕێزی لێ بگرن! وەک خودا بیپەرستن! ئەو توانی کارێکی خودایی ئافەریدئاسای تەواو جێبەجی بکات. تریسکەی خودایی، کە بۆ مرۆڤەکانی تر، بۆ من، بۆ تۆ، نەخراوەتە بێشکە، ئەویش وەک تاکە کەسێک لێی بێبەش کرابوو، توانی بە کارێکی زرنگی بێپایان ورد، بێ کۆڵدان، بەدەستی بهێنێت. پتر لەمەش! توانی بە راستی خودی خۆی، لە ناوەوە بپێکێت، تەنانەت ئەو لە پرۆمێتۆیسیش گەورەتر بوو. توانی تریفەیەک بۆ خۆی بئافرێنێت، تریفەیەکی تیشکدەری کاریگەر، تریفەیەک کە هەرگیز مرۆڤێکی تر نەبۆتە خاوەنی. ئەو ئەمەی لە هێچ باوکێک و لە هیچ دایکێک و لە خودای لە هەموو کەس میهرەبانتریش بۆ نەماوەتەوە، ئەو ئەمەی تەنهاو تەنها ***لە خودی خۆی*** وەرگرتووە. جا بە ڕاستی ئەو خودانی تایبەتی خۆی بوو، خودایێکی مەزنتر لەو خودایەی کە بۆنی ناخوشیی بخووری لێ دەهات، ئەوەی کڵێسای کردبوو بە ماڵی خۆی. ئەوا قەشەیەک لەبەر دەمیدا چۆکی داداوە، لە خۆشییان دەنووزێتەوەو دەپاڕێتەوە. دەوڵەمەند و دەسەڵاتداران، ئاغایان و خانمانی شۆخ و شاناز لە هەژمەتان گیانی بۆ دەدەن، هەموو خەڵک، لە هەر چوار دەوری، باوکان، دایکان، برایان، خوشکان، بۆ ڕێزگرتن لێی، بە ناوی ئەوەوە پێکەوە جەژنی ئۆرگیا، جەژنی گەلەگان سازدەکەن. تەنها بە ئاماژەیەکی ئەو هەموو تێکڕا ئامادەن، واز لە خودای خۆیان بهێنن و ئەو، گرێنوی مەزن، بپەرستن.

بەڵێ ئەو ***بوو*** ئەو گرێنوی مەزن! کە ئەمڕۆ دەرکەتبوو. ئەمە ئەو بوو، وەک کەسێکی کە ئەشقی ئەندێشەکانی خۆی بووبێت، ئەمڕۆ هاتبووە ئارا، کەسێک بوو بە ڕاستی لە واقیع بوونی

هەبوو. لەم ساتەوەختەدا لە ناو خۆشترین و گەورەترین ئاهەنگی ژیانی خۆیدا دەژیا. کەچی ئەو ئاهەنگەش بۆ ئەو بووە شتێکی سامناک.

ئەو ئاهەنگەی بۆ بووە شتێکی سامناک، چونکە نەیتوانی چرکەیەکیش چێژی لێ وەربگرێت. هەر کە لە گالسکەکە دابەزی و پێی نایە مەیدانە پڕ هەتاوەکە، بە خۆ و بە بۆنی عەترەکەیەوە، ئەو عەترەی لە ناوخەڵکدا خۆشەویستی دەکرد، بۆنی ئەو عەترەی دوو ساڵی تەواو کاری لەسەر کردبوو، ئەو عەترەی بۆ ئەوەی بە دەستی بهێنێت، تەوای ژیانی خۆی رەنجی بۆ کێشا بوو... لەو چرکە ساتەدا کە بە چاوی خۆی دیتی و بۆنی کرد، ئەو عەترە چ کاریگەرییێکی بەرگەنەگیراوی هەیەو چۆن خۆی بە تەلەکانی هەواوە بڵاودەکاتەوە، چۆن مرۆڤەکانی تر بە خۆیەوە گیرۆدە دەکات، ئا لەو چرکەساتەدا دیسان تەواوی هەستی کینەو قێزبوونەوەی لە مرۆڤەکان کەفی کرد و هەڵچوو، ئاهەنگی خۆشییەکەی لە بن و بۆتکەوە، لە ریشەوە دەرکێشا، بە جۆرێک کە نەک هەر هەستی بە هیچ شادییێک نەکرد، بەڵکوو کەمترین چێژی لێ وەرنەگرت. چونکە ئەوەی ئەم بە دوایدا عەوداڵ بوو، ئەوە بوو کە مرۆڤەکانی تر ئەمیان خۆش بووێت، ئەو ئامانجەش لەو چرکەساتەدا، بووە سەرنەکەوتنی و بەزینێکی بەرگەنەگیراو، چونکە ئەو خۆی مرۆڤەکانی خۆشنەدەویست، بەڵکوو رقی لێیان بوو. لە پرێکدا تێگەیشت، کە ئەو هەرگیز بە خۆشەویستیی ئاسوودە نابێت، بەڵکوو تەنها لە ناو رق و کینەدا، تەنها کاتێک نەبێت کە خەڵک رقیان لێی بێتەوەو ئەمیش رقی لەمان بێتەوە.

بەڵام ئەو رق و کینەی کە ئەو بەرامبەر خەڵکەکە هەستی پێ دەکرد، هیچ دەنگدانەوەو کاردانەوەی لە لایەن خەڵکەکەوە نەبوو، لەم چرکە ساتەدا، ئەو هەرچەند پتر ئەوانی دەبوغزاند، ئەوەندە پتر ئەوان ئەشقی ئەو دەبوون و دەیانپەرست، چونکە ئەوان تەنها سەرنجییان دەدایە تریفە عەتراوییەکەی، ماسکە عەتراویەکەی، عەترە دڵفرێنەکەی، ئەو عەترەی کە بەڕاستی هی پەرستن بوو.

لە هەموو شتێک پتر حەزی لەوە دەکرد، کە ئەو خەڵکە، ئەو مرۆڤە گێل و چنەو بۆگەن و هەوەسهەڵچووانە هەمووی تێکڕا قڕ بکرێن، وەک چۆن کاتی خۆی بۆنە نامۆ و وەک قەڵەرەش رەش و چڵکنەکانی لە نێو دەبردن. ئەو حەزی دەکرد، کە ئەو خەڵکە بەوە بزانن، کە ئەو چەندە قینی لێیانە، تا ئەوانیش لەبەر ئەمە، لەبەر ئەو تاکە هەستە راستەقینەو ئەو حەزەی، کە بەراستی هەستی پێ دەکات، رقیان لەو ببێتەوەو، ئەوانیش لەلایەن خۆیانەوە بێن و پارچەپارچەی بکەن، وەک پێشتر نەخشەیان بۆ کێشا بوو. ئەو دەیویست، لە ژیانی خۆیدا تەنها جارێک دەروونی خۆی ئاوەڵا بکاتەوەو ویستەکانی خۆی بەرەڵلا بکات. ئەو دەیەویست، وەک مرۆڤەکانی تر، ئەویش ناوەخۆی دەرببڕێت: وەک چۆن ئەوان خۆشەویستی و رێزی گێلانەی خۆیان دەردەبڕن، ئەویش رق

و کینەی خۆی دەرببڕییبایە. ئەو دەیویست، جارێک، تەنها بۆ جارێک، بوونی واقیعیی ئەو، وەک هەیە، ڕەچاو بکرێت، بەرامبەر کینەکانی، بەرامبەر هەستی ڕاستەقینەی خۆی تەنها وەڵامێک لە مرۆڤێک وەربگرێت.

بەڵام ئەمە هیچی لێ شین نەبوو، نەتوانرا ئەمە بێتە دی. ئەوا ئەمڕۆ هەر هیچ. چونکە ئەمڕۆ ئەو خۆی بە باشترین عەتری جیهان رووپۆش کردبوو، لە ژێڕ ئەو رووپۆشە ئەو خاوەنی هیچ دەموچاوێک نەبوو، لە ژێڕ ئەو رووپۆشە ئەو هیچ نەبوو، تەنها بێ بۆنییەکی تەواو و ئەنگوستەچاو بوو. بۆیە لە ناکاو تێکچوو، هەستی بەوە کرد دیسان تەمەکە دونیا دادەگرێت.

وەک ئەو کاتەی کە لە ئەشکەوتەکەیدا خەونی دیت، لە ناوەندی چەقی ئەندێشەکانیدا بە جارێک لە ناکاو تەم دونیای داگرت، تەمێکی سامناک، تەمی بۆنی خودی خۆی، بۆنی بێ بۆنیی، چونکە ئەو هیچ بۆنی نەبوو، هیچ بۆنی لێ نەدەهات. وەکو ئەوسا هەستی بە سەرەگێژی و ترسێکی بێ سنوور کرد، وای زانی بێ چارە خەریکی خنکانە. بەڵام ئەمجارەیان وەک ئەوسا خەون نەبوو، بەڵکوو ئەمجارە واقیعێکی رووت و ئاشکرا بوو. ئەمجارە وەک ئەوسا لە ئەشکەوتێک نەبوو بە تەنها، بەڵکوو لەناو مەیدانێکدا بەرامبەر هەزاران مرۆڤ وەستابوو. ئەمجارەیان وەک ئەوسا فەریاد و هاوار بە هانایەوە نایەت، تا واگای بهێنێت و لە خەونەکەی رزگاری بکات، هیچ هەڵاتنێک نایگەیەنێتەوە ناو دونیا باش و گەرم و فریارەس. چونکە ئەمەی ئێستای خۆی ***دونیا*** بوو، ئەمەی ئێستای خەونێکی راستیی بوو. ئەویش خۆی هەر ئاوای ویستبوو.

تەمە تاریک و سامناکەکە لە زەلکاوی گیانییەوە هەر بەرز دەبووەوە، لە کاتێکدا خەڵک لە هەرچواری دەوری ئەودا خەریکی هاوار و موچڕک و هەناسەبڕکێ و مشەمشی پەڕین و رابواردن بوون. پیاوێک لە ریزی پێشەوەی سەکۆی تەماشاکەران قەڵەمبازێکی داو بە تەنگەتاوی بەرەو رووی هات، ئەوەند بە پەڵەپرووزێ، کە شەبقە ڕەشەکەی لە سەر کەوتە خوارەوە، کەوا ڕەشەکەی فڕەی دەهات و دەشەکایەوە، دەتگوت قەڵەڕەشە دەنیشێتە سەر مەیدانی ریشت، یان دەتگوت فریشتەیەکی تۆڵەستێنە. ئەمە ریچ بوو.

گرێنوی بیری کردەوە، وا دێت و دەمکوژێت. ریچ تاکە کەسێکە کە بە رووپۆشەکەی هەڵنافریوێت. ئەو کەسێکە هەڵناخەڵەتێت. بۆنی کچەکەی بە منەوە نووساوە. وەک خوێنێک کە بکوژ ئاشکرا بکات. دەبێت ئەو من بناسێتەوەو بمکوژێت. ئەو دەبێت ئەم کارە بکات.

گرێنوی باوەشی خۆی بۆ کردەوە، بۆ ئەوەی ئەو فریشتە لە باوەش بکات کە دابەزییە خوارەوە. ئەو بیری لەوە کردوە، ها کە ئێستا نووکی خەنجەرێک، دمکی شمشێرێک، زرمەی دێت و

هەموو رووپۆشە عەترییەکان و تەمە تاریکەکە دەبڕێت و بەر سینەی دەکەوێت، سینەی شەق دەکات و دەچەقێتە ناوەندی دڵی ساردی، ئیتر نامرێت و دەگاتە ئاوات، وا دەبینێت شتێک، شتکی تر، جیا لە خۆی، خۆی دەگەیێنێتە دڵی! خەریک بوو هەست بە رزگاری بوونێک بکات.

بەلام ریچ لە پڕێکدا کەوتە سەر سینەی، نەک وەک فریشتەیەکی تۆڵەکار، بەڵکوو وەک ریچ-ێکی داهێزراو، کە دەپاڕایەوەو نزگرەی دەهاتێ، باوەشی خۆی لە گرێنوی وەرهێنا بوو، دەتگوت بە چڕنووک گرتوویەتی، وەک ئەوەی ئەگەر وا نەکات، لەم دەریای بەختەوەرییە، شەپۆل دەیبات. چ خەنجەرێکی فریارەس لە ئارادا نەبوو، چ دمکە خەنجەرێک نەچەقایە ناو دڵی، نە نەفرەتێک، نە هاوار و دەنگی کینەیەک. لە جیاتی ئەمە ریچ فرمێسک بەسەر روومەت و دەم و دەستە لەرزۆکەکانی جۆگەلەیان بەستبوو، لەبەر گرێنوی دەنووزایەوە: "بمبوورە کوڕم! کوڕی خۆشەویستم بمبوورە!"

ئیتر لە ناوەوە، دونیای لەبەر چاودا سپی بوو، دونیای دەرەوەشی وەک تەنی لەبەر چاو رەش داگەڕا. تەمە پەنگ خواردووەکە بوو بە شلەیەکی هەڵچوو، دەتگوت شیرێکی کوڵاوەو کەف دەکات. کەوتە بەر لافاوی ئەو شلە کوڵاوە، پالەپەستۆییێکی بەرگەنەگرتووی خستە سەر دیوارەکانی ناوەوەی جەستەی، بێ ئەوەی بتوانێت بەرەو دەرەوە فیچقە بکات. دەیویست ڕابکات، لە راهی خودا رابکات، بەڵام بەرەو کوێ... دەیویست شەق بەرێت، بتەقێت، بۆ ئەوەی لەناو خۆیدا نەخنکێت. تا لە کۆتایی چەمایەوەو کەوتە خوارەوەو لە هۆش خۆی چوو.

## ٥٠

کاتێک گرێنوی واگا هات، لەسەر جێگەکەی لاورا کەوتبوو. جلوبەرگ و قژە پیرۆزەکانی لاورا کۆکرابوونەوە. مۆمێک لەسەر مێزی خەوەکە داگیرسابوو. لە پەنجەرە نیوە کراوەکەوە دەنگی هەراو بەزمی شار دەهاتە گوێی. ئەنتۆن ریچ لە تەنیشت تەختی خەوەکە لەسەر کوڤلێک دانیشتبوو، پاسەوانی لێ دەکرد. دەستی گرێنوی خستبووە ناو دەستی خۆی و دەستی پێ دادەهێنا.

بەر لەوەی چاوەکانی خۆی بکاتەوە، دەوروبەرەکەی خۆی ئەزمایشکرد. دونیای ناوەوە ئارام بوو. هیچ شتێک چیتر نەدەجۆشاو پاڵی نەدەدا. دیسان شەوە ساردە ئاساییەکە باڵی کێشابووە سەر رۆحی، ئەو شەوە ساردەی کە ئەو پێویستی پێی هەبوو، بۆ ئەوەی هۆشی خۆی پێ سارد و ساف بکاتەوە، تا روو لە دەرەوە بکات: ئەو لەوێ، لە دەرەوە، بۆنی عەترەکەی دەکرد. گۆڕانێک رووی دابوو. دمکە بۆنەکان هەندێک بێ هێزتر ببوون، بە شێوەیەک ئێستا دڵی نۆتەکانی بۆنی لاورا زۆر جوانتر دەردەکەوت، وەک ئاگرێکی پڕوشکەداری نەرم و تاریک. هەستی بە دڵنیایی کرد. زانی کە تا چەند کاتژمێرێکی تریش کەس توخنی ناکەوێت و هێرشی بۆ ناهێنێت، ئیتر چاوەکانی خۆی کردەوە.

ریچ تەماشای دەکرد. ئارەزووێکی بێ سنووری ئاسوودەیی لە تەماشاکەی دەردەکەوت، پڕ لە ناسکیی و پێکراویی قووڵاییێکی گێل و بۆشی خۆشەویستەکەی.

بە زەردەخەنەوە بە توندی دەستی گرێنوی گوشی و گوتی: "ئیتر هەموو شتێک باش دەبێت. دادگا حوکمەکەتی هەڵوەشاندەوە، هەموو گەواهیدەرەکان سوێندییان خواردەوە، تۆ ئیتر ئازادی. چیت دەوێت، دەتوانیت بیکەیت. بەڵام من دەمەوێت، تۆ لای من بمێنیتەوە. من کچێکم لەدەستچوو، من دەمەوێت تۆ بکەم بە کوڕی خۆم. تۆ زۆر لەو دەچیت. وەک ئەو جوانی، قژەکانت، دەمت، دەستت... من هەموو کاتەکە دەستتم خستۆتە ناو دەستی خۆم، دەستت وەک دەستی ئەوە. کاتێک تەمەشای چاوەکانی تۆ دەکەم، وەک ئەوەیە من تەمەشای لاورا بکەم. تۆ برای ئەوی، من دەمەوێت تۆ ببیت بە کوڕی من، ببیت بە دۆستی من، ببیت بە جێگەی شانازی من، ببیت بە میراتگرتی من. ئایا دایکوباوکت لە ژیاندا ماون؟"

گرێنوی سەری خۆی لەقاند. دەموچاوی ریچ لە خۆشییان وەک پۆپیتەی قەڵەموون سوور هەڵگەڕا. "کەواتە دەبیت بە کوڕی من؟" بە پچڕ پچڕی ئەمەی گوت و لەسەر کوڤلەکەی هەستا، لەسەر رۆخی تەختەکە دانیشت و دەستەکەی تریشی خستە ناو دەستی خۆی و گوشی. "دەبیت؟ دەبیت؟ دەتەوێت من ببم بە باوکت؟ هیچ مەڵێ! قسە مەکە! تۆ هێشتان زۆر بێ تاقەتی، توانای قسەکردنت نیە. تەنها سەر راوەشێنە!"

گرێنوی سەری خۆی لەقاند. خۆشحاڵی لە هەموو کونۆچکەکانی دەموچاوی ریچ وەک ئارەقی سوور دەربوو، خۆی چەماندەوەو ناودەمی گرێنوی ماچ کرد.

"ئێستا بخەوە، کوڕە خۆشەویستەکەم!" کاتێک خۆی دیسان راست کردەوە ئەمەی ووت. "من پاسەوانیت لێ دەگرم، تا ئەو کاتەی خەوت لێ دەکەوێت." پاش ئەوەی ماوەیەکی درێژ بە بێدەنگیی تەمەشای کرد وتی: "تۆ، من زۆر زۆر بەختەوەر دەکەیت!"

گرێنوی گۆشەکانی دەمی خۆی بە سووکی خستە سەر یەک، وەک چۆن بە زەردەخەنە تەمەشای مرۆڤەکانی دەکرد ئاوا، پاشان چاوەکانی خۆی قوچاند. کەمێک چاوەڕوانی کرد، تا هەناسەکانی ئارامتر و کەمێک قووڵتر بوون، وەک کەسێکی خەوتوو. هەستی بە تەمەشای خۆشەویستیی ریچ دەکرد، کە تەمەشای دەم و چاوی ئەمی دەکرد. جارێک هەستی بەوە کرد، کە ریچ خۆی بۆ چەماندەوە، بۆ ئەوەی ماچی بکات، بەڵام وازی لە ماچەکە هێنا، نەبادا بە واگای بهێنێت. تا لە دوایی مۆمەکە فووی لێ کراو، ریچ بە ئەسپایی بەسەر نووکی پەنجەکانییەوە لە ژوورەکە چووە دەرەوە.

گرێنوی هەر بە راکشاوی مایەوە، تا ئەو کاتەی نە لە ماڵەکەو نە لە شارەکە هیچ خوست و چرپەیەک نەما. کاتێک کە هەستایەوە، دونیا تاریک و روون ببوو. خۆی لەبەرکرد و لە ژوورەکە هاتە دەرەوە. بە کپی راڕەوەکەی بڕی، بە کپی چووە خوارەوە، هۆڵەکەی جێهێشت و چووە پێشخانەکە.

لێرەوە، بەسەرەوەی دۆڵاییەکەی شاری گراسەوە، پیاو دەیتوانی شوورەکەی شار ببینێت، خۆ ئەگەر هەوا ساف بووایە، تا دەم دەریا دەدیترا. بەڵام لە دەمەدا تەمێکی تەنک دونیای داگرتبوو، پتر لە هاڵاوێک دەچوو، بەسەر مێرگەکانەوە، هەروەها ئەو بۆن و بەرامەی کە لە وێوە دەهات، بۆنی کژوگیا، گوڵەترنج، دارگەز و، گوڵەباخ، ئەوەندە بێ گەرد و سادەو پڕ نەوازش بوو، دەتگوت شۆردراونەتەوە. گرێنوی بەناو باخچەکەدا ڕەت بوو، بەسەر دیوارەکەدا هەڵگەڕا.

لەسەرەوە لای مەیدانی کۆرس، بەر لەوەی بگاتە ئاقارە چۆڵەکان، ناچار بوو، جارێکی تر رووبەڕووی هاڵاوی مرۆڤەکان ببێتەوە. تەواوی مەیدان و رۆخەکانی دەتگوت ئۆردوگاییێکی زەبەلاحی وێرانبووی لەشکرێکە. هەزاران کەسی داهێزراو و مەست و سەرخۆش بە بەزم و رابواردنی ئاهەنگی

شەوەکە لەم ناوە کەوتبوون، هەندێک رووت و قووت، هەندێک نیوە ڕووت و نیوە لەبەر، کە دەتگوت خشیونەتە ژێر پارچە پۆشاکێک. بۆنی شەرابی ترشاو دەهات، هی ئارەق، ئارەق و میز، پیسایی مندالان هەروەها بۆنی گۆشتی سووتاو دەهات. لێرەو لەوێ لەناو ئەو هەزاران پرخە پرخە، ئاهو نووزەی خۆشی، منگە منگ و هەروەهاش تریقەی پێکەنین دەهات. لەوانەش بوو، هەندێکییان هێشتان واگا بوون و، دوا تیلمی هۆشی خۆیان لە مێشکی خۆیان خالّی دەکرد. بەلام کەسیان گرێنوییان نەدی، کە بە ئاگایی، لە هەمانکاتیشدا بە خێرایی، وەک ئەوەی بەناو زەلکاوێکدا ڕەت ببێت، بەسەر ئەو لاشە پەرتەوازەبووانەدا رەت دەبوو. ئەوەی کە دەشی دیت، نەیدەناسییەوە. چونکە چیتر بۆنی لێ نەدەهات. پەڕجووەکە ئاوا ببوو.

گەیشتە کۆتایی مەیدانی کۆرس، ڕێگەی گرێنۆبلی نەگرتە بەر، بەرەو کابریس نەچوو، بەلکوو بە بەرینی بەناو مێرگەکاندا رۆیشت، بەرەو رۆژئاوا، بێ ئەوەی تاقە جارێکیش تەماشای دەوروبەرەکە بکات. کاتێک رۆژ بەرز بووەوە، رۆژێکی زەبەلاح، زەرد، گەرم، تیشەکانی دەتگوت دەرزین دەچەقنە گیانی مرۆڤ، ئەو کاتە، ئەو دەمێک بوو لەبەر چاوان گوم ببوو.

خەلّکی گراس واگا هاتن، ژانە سەرێکی توند مێشکی داگیرکردبوون، تەنانەت ئەوانەی نەشیان خواردبووەوە ژانەسەر گرتبوونی، ژانەسەرێکی قورسی وەک قورقوشم، دلّ و گەدەیان تێکچوو بوو، رشانەوەیان دەهاتێ. لەسەر مەیدانەکەی کۆرس، لەبەر تیشکی خۆر، جوتیارە چەلەنگەکان لە جلوبەرگەکانیان دەگەڕان، کە لە شاگەشکەیی ئاهەنگی گەلەگان لەبەر خۆیانیان تووڕهەلّدابوون، خانمە رێزدارەکان بەدوای مێرد و مندالّەکانیان دەگەڕان، خەلّکەکە خۆیان لە باوەش و ناولنگی خەلّکی نەناس و بیانی دەردەهێنا، ئاشناو خزم و دراوسێ و ژن و مێرد، بە شێوەیەکی نەگونجاو و پەشۆکاو و شەرمەزار بە ڕووتی رووبەڕووی یەکتری دەبوونەوە.

ئەو رووداوە بۆ زۆریان ئەوەندە ناجوور و ناخۆش و تالّ بوو، کە بە تەواوی تێی نەدەگەیشتن و بە هیچ شێوەیەک لەگەلّ بیرکردنەوەو رەوشت و ئاکاری ئەوان نەدەگونجاو یەکی نەدەگرتەوە، بۆیەشە پڕ بە مانای وشە، هەر لەو چرکەساتەی واگاهاتنەوەدا، ئەم رووداوەیان بە تەواوی لە مێشکی خۆیان سڕیەوە، لەبەر هەندێش بوو کە دواتر بەڕاستی نەیاندەتوانی بیهێننەوە بیری خۆیان. ئەوانەی تر، کە ئاوا دەسەلاتیان بەسەر ئەندامی هەستپێکردن و زاکیرەیان زالّ نەبوو، هەولّی ئەوەیان دەدا خۆیان نەبان بکەن و تەمەشای شوێنێکی تر بکەن، گوێ لە شتێکی تر بگرن، بیر لە شتێکی تر بکەنەوە، ئەوەش کارێکی ئاسان نەبوو، چونکە هەتک و حەیاچوونەکە زۆر ئاشکراو زۆر گشتگر بوو. ئەوەی کەلوپەل و کەسوکاری خۆی دەدۆزییەوە، هەموو هەولّێکی دەدا

کەس نەیبینێت بە خشپەو بە پەلە تێیدەتەقاند. بەرەبەری نیوەڕۆ مەیدانەکە چۆڵ وهۆڵ بوو، دەتگووت گەسکی لێ درایە.

تەنها ئەوانەی کاری زۆر پێویستییان هەبوو، بەرەبەری ئێوارە لە ماڵەکانیان هاتنەدەرەوە بۆ شار، بۆ ئەوەی ئاتاجییەکانیان جێبەجێ بکەن. کاتێک رووبەڕووی یەکتری دەبوون، سەربەرەو ژێر و بە هەشتاوی سلاویان لێکتری دەکرد، تەنها باسی شتی لابەلایان دەکرد. هیچ پەیڤێک لەبارەی رووداوەکانی رۆژی پێشوو و شەوی رابردوو نەدەبیسترا. هەر دوێنێ بوو کە ئەو خەڵکە ئاوا تەڕ و بێ شەرم و بێ پەروا رەفتاریان نواند، ئێستاش ئاوا پڕ شەرم و پڕ حەیا بوون. هەمووشیان هەر وەسا بوون، چونکە هەموویان گوناهبار بوون.  هەرگیز خەڵکی گراس وەک ئێستایان ئەوەندە لەگەڵ یەکتری نەرم و نیان نەبوون، دەتگوت ئێستا لەناو پەمۆدا دەژیان.

بێگومان، هەندێک بەهۆی ئەرکی فەرمی دەزگاکانییان ناچار بوون راستەوخۆ خۆ بەو رووداوە خەریک بکەن. بەردەوامی ژیانی گشتیی،  خەوشدارنەکردنی یاساو نیزام، پێویستی بەوە هەبوو، کە خێرا هەنگاو بهاوێن. هەر ئەو رۆژە، دوای نیوەڕۆ ئەنجوومەنی شار کۆبووەوە. ئاغایان، لەوانەش کۆنسوڵی دووەم، واتە ریچ، بە بێدەنگی باوەشییان لەیەکتری وەرهێنا، وەک ئەوەی بیانەوێت بەم رێزلەیەکتری گرتنە مانادارە، خۆیان سەرلەنوێ رێکبخەنەوە. پاشان بێ ئەوەی باس لە رووداوەکە بکەن، یان ناوی گرێنوی بهێنن هەموو یەکدەنگ بڕیاریاندا، کە "سەکۆی تەماشاوانان و ساباتی ئیعدامکردنەکە لە مەیدانەکە هەڵبووەشێننەوەو لای ببەن و مەیدانەکەو دەوروبەری وەکو پێشوو پاک بکەنەوەو رێکی بخەنەوە." بۆ ئەمە بڕیاری تەرخانکردنی سەت و شەست لیڤرەیان دا.

لە هەمان رۆژ لە ناو سەرادا دەستەی دادگا دانیشتنی خۆی کرد، دادوەر بێ قسە لەسەر بابەتەکە   بڕیاری دا، "قەزیەی گ." وەک قەزیەیەکی کۆتاهاتوو رەچاودەکرێت، فایلەکەی دادەخرێت، بێ ژمارە دەخرێتە ئارشیف، فایلێکی نوێ بۆ لێکۆڵینەوە لە بکوژە نەناسراوەکەی بیستوپێنچ کچەکە لە گراس دەکرێتەوە. ئەم فەرمانە بۆ لێکۆلەرەوەی پۆلیس نێردرا، تاکو بێ دواکەوتن دەستبەکار ببێت.

هەر بۆ رۆژی دوایی لێکۆلەرەوەی پۆلیس سۆراغێکی دەستکەوت. لەسەر بنچینەی گومانێکی رۆشن وەستا عەترسازەکەی جادەی لالۆڤ، دۆمینیکۆ درۆت دەستگیر کرا، چونکە لە کۆختەکەی ئەوان بوو، کە تەواوی جلوبەرگ و قژی قوربانییەکان دۆزرابوونەوە. دادوەرەکان بە نەهیکردنە سەرەتاییەکانی درۆت هەڵنەخەلەتان. دوای ئەشکەنجەدانێکی چواردە سەعاتی دانی بە هەموو شتێک ناو، تەنانەت پاڕایەوە کە تادەکرێت زوو لە سێدارەی بدەن، ئەوە بوو چەند رۆژێک دواتر

داواکەی جێبەجێ کرا. لە تاریکورووونی بەیانیدا، بێ بەزم و هەرا، بێ شانۆی ئیعدام، بێ سەکۆی تەماشاکردن، تەنها بە ئامادەبوونی جەللاد و چەند ئەندامێکی دەستەی دادگاو پزیشکێک و قەشەیەک لە سێدارەیاندا. دوای ئەوەی سەلمێنرا کە مردووە، پرۆتۆکۆلی بۆ نووسراو بێ دواکەوتن نێژرا. بەم جۆرە قەزیەکە جێبەجی بوو.

ئیتر شارەکە پرسەکەیان بە تەواوی لە بیرخۆ بردەوە، بە جۆرێک چەند رۆژێک دواتر ئەو موسافیرانەی کە دەهاتنە شارەکەو لە بارەی کچکوژە بەناوبانگەکەی گراس پرسیاریان دەکرد، تاکە کەسێکی ماقوولیان نەدەدیتەوە، زانیاریان پێ ببەخشێت. هەبوو نەبوو، تەنها چەند گێلێکی نەخۆشخانەی شاریتێ نەبێت، کە ناسرابوون بەوەی نەخۆشی مێشکیان هەیە، پەرتاویان دەکرد، باسی ئاهەنگێکی گەورەیان دەکرد کە لە مەیدانی کۆرس گێڕدراوە، ئەوان بە ناچاری ژوورەکانیان بۆ چۆل کردوون.

زۆر بە خێرایی ژیان بە تەواوی باری ئاسایی خۆی وەرگرتەوە. خەڵکەکە چالاکانە کەوتنە کارکردن و، شەوان وەک جاران باش دەخەوتن، ئیتر کەوتبوونە دوای کارو سەودای خۆیان. وەک هەمیشە ئاو لە بیر و کانیاوەکان هەڵدەقولاو قوڕاو بە کووچەکانەوە وەردەبوو. دیسان شارەکە بە سادەیی و شاناز لە لاپاڵی دەم دۆڵ و دامێنە بەپیتەکان وەستایەوە. رۆژ بە گەرمی دەرکەوت. مانگی گوڵان زوو هات و، گوڵ چنین دەستی پێ کرد.

# بەشی چوارەم

## ٥١

گرێنوی هەر بە شەو دەڕۆیشت. وەک سەرەتای سەفەرەکەی، خۆی لە شارەکان لا دەدا، لە جادەکان دوور دەکەوتەوە، کە ڕۆژهەڵدەهات لە شوێنێک پاڵدەکەوت و دەخەوت، ئێوارە هەڵدەستایەوەو دەستی بە ڕۆیشتن دەکردەوە. هەرچی لە ڕێگا بە چنگی کەوتبا هەڵی دەلووشی: گیا، کوارگ، گوڵ، باڵندەی مرداربوو، کرم. بە درێژایی ناوچەکە ڕۆیشت، بە هۆی بەلەمێکی دزراو لە ڕووباری ڕۆن لە خوارووی ئۆرانج پەڕییەوە ئەو دیو، بە درێژایی ڕووباری ئاردێچەوە ڕۆیشت تا قووڵایی ناوچە شاخاویەکانی کێڤن و پاشان بەرەو ئالیێر  بە ئاراستەی باکوور.

لە ئاوڤێرجینەوە لە شاخی پلۆمب دوکانتالەوە نزیک بووەوە. گرێنوی لە لای ڕۆژئاوایەوە شاخەکەی کەوتە بەرچاو، شاخێکی گەورە، کە لەبەر ڕۆناکی مانگەشەو ڕەنگی بۆرێکی زیویی دەردەکەوت. گرێنوی بۆنی بایێکی فێنکی کرد، ئەو بۆنە لە شاخەکەوە دەهات. بەڵام حەزی نەکرد بەرەو شاخەکە بچێت. چیتر غەریبی ژیانی ئەشکەوتەکەی نەدەکرد. چونکە پێشتر ئەوەی ئەزموون کردبوو، دەیزانی کە کەڵکی ژیانی نیە، وەک هەموو ئەزموونەکانی تری ژیانی لە ناو کۆمەڵگەی مرۆڤان. پیاو لێرەو لەوێ دەخنکێ. ئەو هەر نەیدەویست چیتر بژیت. ئەو دەیویست خۆی بگەیەنێتەوە پاریس و لەوێ بمرێت. ئەو ئەوەی دەویست.

کاتێک نا کاتێک دەستی خۆی دەخستە سەر گیرفانی، شووشە بچووکەکەی دەخستە ناو دەستی خۆی، کە عەترەکەی تێدا بوو. شووشەکە نزیکە هێشتان پڕاو پڕ بوو. بۆ بەزمەکەی شاری گراس تەنها تنۆکێکی لێ بەکارهێنابوو. ئەوەی مابووەوە بەشی ئەوەی دەکرد، کە هەموو دونیای پێ سیحراوی کردبایە. ئەگەر ئەو بیویستبایە، دەیتوانی وا بکات نەک هەر دە هەزار، بەڵکوو سەدان هەزار کەسی شاری پاریس ئاهەنگی بۆ بگێڕن و چەپڵەی بۆ لێ بدەن، یان دەیتوانی بە پیاسە بچێتە ڤێرسای تا پاشا پێیەکانی ماچ بکات، دەیتوانی نامەیەکی عەتراوی بۆ پاپا بنووسێ و خۆی وەک پێغەمبەرێکی نوێ دەربخات، دەیتوانی لە کڵێسای نۆتردام لە پێش پاشاو قەیسەر خۆی بۆ پایەی قەیسەری باڵا ئارایشت بکات، تەنانەت دەیتوانی خۆی وەک خودای سەر زەوی لێ بکات.

ئەگەر گرێنوی بیویستبایە دەیتوانی ئەو شتانە هەمووی بکات. ئەو دەسەڵاتی ئەوەی هەبوو. ئەو دەسەڵاتە لەناو دەستی بوو، ئەوە دەسەڵاتێک بوو بەهێزتر لە دەسەڵاتی پارە، یان لە دەسەڵاتی تێرۆر، یان لە دەسەڵاتی مەرگ: دەسەڵاتێکی بێ پەروا، دەسەڵاتێک کە بەرگری لێ نەدەکرا: رژاندنی ئەشق و خۆشەویستی بۆ ناو دەروونی مرۆڤ. ئەو دەسەڵاتە تەنها توانای یەک شتی نەبوو: توانای ئەوەی نەبوو بتوانێت وا بکات، خودی خۆی بۆنی بێت. ئەگەرچی بە هۆی عەترەکەی دەیتوانی خۆی لەبەرچاوی دونیا وەک خوداییێک پێشانبدات، بەڵام چونکە نەیدەتوانی وا بکات خۆی بۆنێکی هەبێت، هەرگیز نەیدەزانی، کە ئەو، خۆی چ کەسێکە، بۆیەشە فشەی بە دونیا دەهات، فشەی بەخۆی دەهات، فشەی بە عەترەکەشی دەهات.

ئەو دەستەی کە خستبوویە سەر عەترەکەی، بۆنێکی ناسکی لێ دەهات، کە نزیکی لووتی خۆی دەکردەوەو بۆنی دەکرد، ئەندێشەیەکی ئازوردە بەسەریا زاڵ دەبوو، بۆ تاوێک رۆیشتنی لە یاد دەچوو، دەوەستاو بۆنی دەکرد. بیری دەکردەوە: کەس نازانێت، کە ئەو عەترە، بە راستی عەترێکی چەندە باشە. کەس نازانێت چەند باش دروستکراوە. ئەوان تەنها هەست بە کاریگەرییەکەی دەکەن، تەنانەت ناشزانن، کە ئەوە عەترێکە، کە کاریگەری لەمان دەکات و سیحراوییان دەکات.  تاکە کەسێک کە رۆژێک لە رۆژان بە جوانی بەو عەترە ئاشنا بووبێت، ئەوە هەر منم، چونکە من خۆم ئافراندوومە. لە هەمان کاتدا من تاکە کەسم، کە ناتوانێت سیحراویم بکات. من تاکە کەسم، کە بۆ ئەو عەترە ماناییێکم نیە.

جارێکی تریش، کاتێک کە ئەو لە ناوچەی بورگونددا بوو:  کاتێک من لە تەنیشت دیوارەکەدا وەستابووم، لە ژێرەوەی باخچەکەدا، کاتێک کچە قژسوورەکە یاری دەکرد، بۆنەکەی بەرەو لای من هەڵی دەکرد... یان باشتر بەڵێنی بۆنەکەی، چونکە ئەو بۆنەی پاشتر هاتە ئارا، ئەوسا هێشتان بوونی نەبوو، لەوانەیە ئەوە بووبێت، کە من ئەوسا هەستم پێ دەکرد، وەک ئەوانەی کە لە مەیدانی کۆرس هەستییان پێ دەکرد، کاتێک من بۆنی عەترەکەم بەسەردا پەخش کردن...؟ ئەوسا وازی لەم خەیاڵە هێنا: نەخێر، ئەو جۆرێکی تر بوو. چونکە من ئەوەم دەزانی، کە من حەز لە بۆنەکەی دەکەم، نەک لە کچەکە خۆی. بەڵام ئەو خەڵکەی مەیدانی کۆرس، وایان دەزانی حەز لە من دەکەن، بەڵام ئەوەی کە ئەوان بەراستی حەزیان لێ دەکرد، بۆ ئەوان شتێکی نهێنی بوو.

پاشان چیتر بیری لێ نەکردەوە، چونکە توانای بیرکردنەوەی نەبوو، هەروەهاش گەیشتبووە ئۆرلێیانس.

لە لای شاری سولی لە روباری لۆیرێ پەڕیەوە. رۆژێک دواتر بۆنی شاری پاریس گەیشتە لووتی. لە ٢٥ی حوزەیرانی ١٧٦٧ کاتژمێر شەشی بەیانی بە جادەی سانت جاکدا هاتە ناو پاریس.

رۆژەکە گەرمی کرد، بووە گەرمترین رۆژی ئەو ساڵە. هەزاران چەشنە بۆنی بۆگەن لە شارەکە هەڵدەستا، دەتگوت لە هەزاران کوانی کێمکردووی تەقیوەوە سەرچاوە دەگرن. هیچ باییێک هەڵی نەدەکرد. هێشتان نەببوو بە نیوەڕۆ، سەوزەی سەر مێزەکانی بازاڕ هەمووی سیس ببوون. گۆشت و ماسییەکان بۆگەن ببوون. هەواییێکی ناخۆش لە ناو کووچەکان پەنگاوی خواردبووەوە. وا دەهاتە بەرچاو، کە رووباریش وەستا بێت و چیتر نەڕوات، بەڵکوو خەریکی قەتیسمان و بۆگەنبوون ببێت. ئەم رۆژە وەک ئەو رۆژە بوو، کە گرێنوی تێیدا لە دایکببوو.

بە کەناری دەستە راستی پردی پۆنت نویف، پەڕیەوەو بەرەو هۆڵەکان و گۆڕستانی ئینۆسۆم چوو. لە ناو تاقەکانی ئیسکوپروسکەکان، بە درێژایی شەقامی ئۆفێر چووە خوارەوە. ئاقاری قەبرستانەکە کەوتبووە بەردەمی، دەتگوت مەیدانی جەنگەو بۆمباباران کراوە، قۆرت قۆرت، پڕ درز و کەلێن، هەمووی بە گۆڕ داپۆشراو، کەللەسەر و هێسکوپرووسک لەو ناوە کەوتبوو، نە درەختێک، نە پنچکێک، نە لاسکە گیاییێک، هیچی لێ نەڕوا بوو، بریتی بوو لە قۆمەتێکی کەڵەکەبووی مەرگ.

هیچ مرۆڤێکی زیندوو نەدەدیترا. بۆگەنی لاشەکان ئەوەندە ناخۆش بوو، تەنانەت گۆڕهەڵکەنەکانیش ئەو ناوەیان جێهێشتبوو، ئەوان دوای رۆژئاوابوون دەگەڕانەوە، بۆ ئەوەی لەبەر رۆناکی مەشخەڵە ئاگر گۆڕ بۆ مردووەکانی رۆژی دواتر هەڵبکەنن.

درەنگ، دوای نیوەشەو، ئەوکاتەی گۆڕهەڵکەنەکان ئەوێیان بەجێدەهێشت، ئەوجا ئەو ناوە پڕ دەبوو لە جرِوجامشت، دز، بکوژ، چەقۆکێش، سۆزانی، یاخی، بەرەڵلا، چەورەو شەللاتی. ئاگرێکی بچووک بۆ چێشتلێنان و پەرتکردنی بۆنی بۆگەن، دەکرایەوە.

لەسەرەتا کاتێک گرێنوی لە تاقەکانەوە هات و تێکەڵی ئەو مرۆڤانە بوو، ئەوان هەر سەرنجیشیان نەدایێ. بێ کۆسپ لە ئاگرەکە نزیک بووەوە، وەک ئەوەی یەکێک بێت لەوان. بەڵام دواتر دەیانگوت و دەیانگێڕایەوە، هەبێ و نەبێت، دەبێت ئەو کەسە جنۆکە، فرشتە، یان شتێکی ناسروشتیی تر بووبێت. چونکە هەمیشە کاتێک بیانییێک لێیان نزیک دەبووەوە، ئەوان زۆر بە هەستیارییەوە کاردانەوەیان پێشاندەدا.

بەڵام پیاوە بچووکە چاکەت شینەکە لە پڕێکدا پەیدا بوو، وەک ئەوەی کە لە زەویەوە هاتبێتە دەرەوە، شووشەیەکی بچووکی لەدەستدا بوو، سەری شووشەکەی کردەوە. ئەوە یەکەمین شت بوو،

که هەموو بەبیریان دەهاتەوە: **کەسێک لێرە وەستا بوو، سەری شووشەیەکی کردەوە**. پاشان ناواخنی شووشەکەی بە خۆی داکرد، بە جاریک بووە یەک پارچە جوانیی، دەتگوت ئاگرێکی تیشکدارە.

بۆ ماوەی خولەکێک، بە هۆی ترس و حەپەسان کەمێک خۆیان لێ دوور خستەوە. بەڵام لە هەمان چرکەساتدا، هەستییان بەوە کرد، کە خۆلێکێشانەوەکەیان گۆڕا بۆ خۆ لێ نزیکخستنەوە، ترس و حەپەسانەکەیان گۆڕا بۆ حەز و خۆشەویستی، بە جارێک واقیان وڕ مابوو. هەستییان کرد کە بەرەو ئەو مرۆفرشتەیە راکێش دەکرێن. هێزێکی بەهێزی هەڵمژین لەو فریشتەوە دەردەچوو، شەپۆلێکی بەهێز بەرەو ئەو کێشیان دەکات، هیچ مرۆڤێک بەرگەی بەرگریکردنی نەبوو، کەسیش نەیدەویست دژی ئەم هێزە بەرگری بکات، چونکە ئەوە هێزی ویست و ئیرادەبوو، بەو ئاراستە پاڵی پێوەدەنای: بەرەو ئەو.

هەموو بازنەییی لە دەوری کۆبوونەوە، بیست، سی کەسێک دەبوون، وردە وردە بازنەکەیان تەسک دەکردەوە. زوو وای لێ هات، ئیتر لە بازنەکە جێگەی هەمووان نەدەبووەوە، دەستیان بە قەڕەپەستانێ کرد، بە پاڵەپەستۆ دەیانویست جێگەی خۆیان بکەنەوە، هەر یەکێکیان دەیویست لە هەمووان پتر لە چەقی بازنەکە نزیک ببێتەوە.

پاشان لە ناکاوێک نەیانتونی چیتر دانبەخۆدابگرن، پەتی شەرمیان پچڕا، بازنەکە چەقییە ناو یەک. خۆیان خستە سەر فریشتەکە، کەوتنە سەری، خستییانە سەر زەوی. هەموو دەیانویست خۆی بگەیەننێ، هەموو دەیانویست پارچەیەک، باڵۆکەیەک، پەڕەمووچەیەک، یان پرۆشکێکی ئەو نوورە جوانەیان بەربکەوێت. جلوبەرگەکەیان لێکهەڵزڕاند، پرچییان لەبندا دەرهێنا، پێستەیان لەبەردا داکەند، لیکیان هەڵزڕاند، بە چنگ و بە ددان کەوتبوونە سەر گۆشتەکەی، وەک مێگەلی کەمتیاران کەوتبوونە سەری.

بەلام جەستەیەکی ئاوای مرۆڤ چیرە، بەئاسانی پارچە پارچە نابێت، تەنانەت ئەو ئەسپانەی لە کارێکی ئاوا بەکاردەهێنرێن، زۆر خەستە دەبن. بۆیە هەر زوو دمکە خەنجەر چەخماخەیان دا، چەقین و هەڵیانزڕاند، تەور و سیکارد بەسەر جومگەکانیەوە زرچەو کرتەیان هات و چوونە خوارەوە، قرچەیان لە ئێسقانەکانەوە هەڵساند. لە کاتێکی کەمدا فریشتەکە کرایە سی پارچە، هەر ئەندامێکی ئەو چەتە گەلەکۆمەککارە پارچەیەکی بۆ خۆی ڕاکێشا، کەوتبوونە ژێر جلەوی هەڵچوونی غەریزەی شەهوەت و هەوەسبازییان، هەرکەس کشاوە پاش و پارچەکەی خۆی هەڵلووشی. تەنها کاتژمێرێک دواتر، جۆن پاتیست گرێنوی لە هەموو شوێنێکی سەر زەوی گوم بوو.

کاتێک مرۆخۆرەکان دوای ئەو ژەمە خواردنەیان دووبارە لە دەوری ئاگرەکە کۆبوونەوە، کەس ورتەی لە دەم نەدەهاتە دەر. ئەمیان، یان ئەویان قلّپەیەکی سووکی دەهاتێ و، لچ و زمانی خۆی گرژ دەکرد و پارچە ئێسکێکی ماوەی ناو دەمی تف دەکردە دەرەوە، یان بە پێیەکانی تیلمە کەوتووەکانی چاکەتە شینەکەی دەخستە ناو ئاگرەکە: هەموویان هەستییان بە شتێکی نەگونجاو و شەرمەزارییێک دەکرد، roویان نەدەهات تەمەشای یەکتری بکەن. هەر یەکێک لەوان چ ژن چ پیاو، لەمەو پێش کوشتنێک یان تاوانکارییێکی چەپەڵیان لەدەستدا قەوما بوو. بەڵام مرۆڤ خواردن؟ شتێکی ئاوا سامناک، بیریان دەکردەوە، هەرگیزاو هەرگیز ئەمان هی ئەوە نین ئەو کارە بکەن. دۆش دامابوون، سەریان لە خۆیان سوڕمابوو، کە چەندە بە ئاسانی دەستییان چووبووە کارێکی ئاوا، بەڵام لەگەڵ هەموو هەستی شەرمەزارییان، هەستییان بە کەمترین ئازاری ویژدان نەدەکرد. بە پێچەوانە! ئەگەریش لە ناو گەدەیاندا هەندێک هەستییان بە گرانیی دەکرد، بەڵام لە ناو دڵییاندا هەستییان بە بارسووکی دەکرد. لە ناکاوێک لە ناو تاریکی ئەنگوستەچاوی رۆحیان، هەستییان بە رۆناکییێکی خۆش دەکرد. تریسکانەوەیەکی ناسکی کچانەی بەختەوەری کەوتبووە سەر دەموچاویان. لەوانەشە هەر لەبەر ئەوە بووبێت، کە شەرمییان دەکرد، تەمەشای ناو چاوی یەکتری بکەن.

پاشتر، کاتێک ورەی ئەوەیان هاتەوە بەر تەمەشای یەکتری بکەن، لە سەرەتا بە دزە، پاشان بە ئاشکرا، ناچاربوون دەست بە پێکەنین بکەن. یەگجار شاییان بە خۆیان دەهات، بەوەی بۆ یەکەمین جار بوو لە ژیانیاندا، شتێکییان لە خوشەویستیدا بە ئەنجام گەیاندبوو.

****

(**پەندی کوردی: لە خۆشەویستی، هێسکیان ورد کرد لە پێستی**).

کۆتایی: لە ١٩.٠١.٢٠١٠ لە وەرگێڕانی ئەو رۆمانە بوومەوە. بەرلین.

**فەرهەنگۆک**

| | |
|---|---|
| ئازوردە | ئازارهێن، ئازاردەر |
| ئاغەل | جێی داکردنی مەڕ و بزن لە دەمی سەرمادا |
| ئاهۆ | تاعوون |
| ئەلتار | تەماشای قوربانگە بکە! |
| ئەورەت | واتە رووت، بەڵام لە کوردەواریدە مەبەست لە ئەورەت ئەندامی مێینەی ژنە |
| ئۆرگل | ئەو ئامێرە موسیقا گەورانەی کە لە کڵێساکان مۆسیقای پێ لێ دەدەن. |
| باسترمە | کالباس، گوشتی لە رێخۆلەکراو. |
| برکدار | خنک. خنکدار، شوێنێک بۆنی ناخۆش بێت و ئۆکسجینی کەم بێت |
| بەستەنی | ئایسکرێم. شیر یان ئاوی بەستوو. |
| بەش | کراوە |
| بەلسەم یان بالسام: | Balsam, Terpentin |
| بەنزۆل | Benzoe |
| بە هەشتاوی | بە تەنگەتاوی، بە خێرایی |
| بەیار | زەوی تۆنەکراو. |
| بوشکە | بەرمیل |
| بولێڵە | تاریکوروون، سەرەتای سپێدەی بەیان |
| پرۆمێتۆیس | خودایێک بووە لە مێتۆلۆژیای یۆنانیی کۆن. کە بە ئافرێنەری مرۆڤ و گیانەوەرەکانی تر ناسراوە. |
| پفکە | تۆقلە |
| پەرچین | تانۆکێک، کە بە چەند چینەدارێکی چڕ، یان پنچکێکی چڕ وەک مورتک، چاندرابێت. |
| پەسیو | هەڵامەت |
| پوخ | نابووت |
| پووتەلە | بوودەڵە، وورد و لاواز |
| پۆستکاری | ئەو کارانەی پەیوەندیان بە پۆست هەیە، ناردن و وەرگرتن. |

| | |
|---|---|
| پیپێت | Pipette بۆڕیەکی شووشەی چیلکەیی باریکە، لە تاقیگەکان شلەی پێ لە کەمولەیەکەوە بۆ کەمولەیەکی تر دەگوازنەوە، بە پێی تنۆک و یەکەی پێویست. |
| پێوەرهێل | ئەو هێڵانەی کە بۆ پێوان لەسەر گلاس نەخشکراون. |
| تاریکەمانگ | کاتێک مانگ دەکەوێتە نیوانی رۆژ و زەوی، لا تاریکەکەی مانگ دەکەوێتە لای زەوی. پێچەوانەی مانگە شەوی تەواو. جیاوازە لەگەڵ مانگگیران. لە مانگگیراندا، سێبەری زەوی دەکەوێتە سەر مانگ. |
| ئاومۆر | تەعمید، لە ئاو هەڵکێشان کە ئەرکێکی ئاینییە. لە ئاینی کریستی کاتێک منداڵ لە دایک دەبێت لە کڵێسا لە ئاوی هەڵدەکێشن.. نزیکە ریتوالێکی ئاواش لای ئێزدییەکان هەیەو مندال لە ئاوی پیرۆزی ئاومۆر (تەعمید) دەکەن. |
| تەنی | ڕەشایی نیشتووی دوکەڵ. |
| تیلم | پارچە |
| جالۆزین | پەردەی پەڕ پەڕی ئاسۆیی، کە زۆرجار لە مێتالی سووک دروست دەکرێت و وەک دەرابەی دوکانەکان بۆ سەرەوە هەڵدەکێشرێن و دەچنەوە بار یەکتری. |
| چڕاو | Konzenrtat: شلەیەک کە مادده بنەڕەتەکەی (جەوهەرەکەی) بە ڕێژەیەکی چڕ تێدا بێت. پەیتەی شلەیەک بەر لە ڕۆنکردنەوە. |
| چەقۆی لانکیی (بێشکەیی): | جۆرە سیکاردێکی شێوەکەوانەییە لە چەشنی قاچەکانی بێشکەی مندالان سازکراوەو دوو دەسکێ لەملاو لەولا هەیە. |
| چووک | سەیری سیرەت بکە |
| چنە | ناکەس بەچە، هیچ |
| چەمەنچقز | قوماشی بە سیم چنراو، کە هەموو رەنگێک بریقە بداتەوە. |
| دادنووس | کاتیب عەدل |
| داردەق | چیلکەیەکە، بۆ دەقکردنی کاغەز و کارتۆن بەکار دێت. |
| دەرداوی سەگلاو | دەرداوی ئەندامی زایندەی سەگلاو (Castoreum). |
| دەفنە: Daphne | بوکی دەریا کە لەدەست ئەپۆلۆ رایکرد بوو بە درەختی دەریا (ئەفسانەی یۆنانی) ئەو گوڵەو درەختەکەی بە ناوی ئەو ئەفسانە |

| | |
|---|---|
| | کراوە. |
| راجفراند | راچڵەکاند |
| زاماکیی | غەریزەیی |
| زیوانیی | خاڵ خاڵ |
| سایەدبوون | وریا بوون، ئاگاداربوون |
| سۆل | یەکەیەکی پارەی ئەوسا بووە. |
| سیرەت | ئەندامی نێرینە، نێرک، نێرتک. کێر |
| شاژنی یاسەمین | ئاهەنگێکە لەگەڵ گەیشتنی کەژی یاسەمین سازدەکرێت و شاژنی جوانی یاسەمین هەڵدەبژێردرێت. |
| شتۆراکس | (Storax) چەند جۆرە درەختێکن کە بۆنێکی خۆش لە جەوەکەیان (چەسپ) دێت |
| شەونمەی دەریا | Rosmarin رووکێکە بە لاتینی پێێ دەڵێن رۆزمارینوس (رۆزمارین) ، لە دەم کەنارەکانی دەریای ناوەڕاست دەڕوێت و، گوڵەکانی شەو خوناو کودەکەنەوە، بۆیە وای پێ دەڵێن |
| شۆرە | Salpeter |
| شیشبەند | تۆڕێک کە لە شیشی ئاسن ڕایەڵ کرابێت |
| شێمانە | ئیحتیمال |
| فەلامەرز | زۆر گەورە، زەبەلاح |
| ڤێکتۆریاو پارما | ناوی دوو شوێنن. |
| قەیچکردن | بڕین بە مەقەس |
| قوربانگە | ئەلتار، بەو شوێنە دەگوترێت کە لە پەرستگای ئاینە کۆنەکان، دوعایان لەسەردا کردووهو قوربانییان بۆ خوا لەسەردا کوشتووەو ، یان سەربڕیوە، ئەو سەکۆیە گەیشتۆتە ئاینە نوێکان و وەک بەشێکی ناوەوەی کڵێساکانیش هەر ماوە. بۆ نموونە ئەو بەردەی حەزرەتی ئیبراهیم ویستی حەزرەتی ئیسماعیلی لەسەر سەرببڕێت، ئەو بەردە بە زمانی کۆن ئەلتاری پێ گوتراوە. |
| قوڵە | گۆج، کورت. |
| قۆمەت | گردۆکە، کۆبووەوەو بەرزبوونەوەی شتێک لەسەر یەکتری. |
| کافوورە | نافوورە |
| کاڵباس | باسترمە، گوشتی لە ڕێخۆڵەکراو. |

| | |
|---|---|
| کامیساردەکان | ناوی هۆگنۆتەکانە، ئەوانەی لە چاکسازی ئاینی موسیحی لە سەدەی حەڤدەم دایانە پاڵ ڕێفۆرمیستەکان |
| کاول | وێران |
| کەپەنگ | سایەوانی سەر فرۆشگاکان |
| کهرمان | Bernsteim: ، زەرەک، مووروی کارەبا |
| کوارگ | قارچک |
| کوفک | رەحەتی |
| کوفکەگوڵ | Tuberose: گوڵێکی سپییە لە چەشنی کوفک (رەحەتی) |
| کوڤل | کۆتکە دار، یان کورسی بێ پشتۆک: تەختۆکە |
| کۆز | تامانی جێگەی بەرخ و کار |
| کیسەبۆن | کیسەیەکی بچووکە ماددەی بۆنداری تێ دەکرێت، دەخریتە ناو کانتۆری جلوبەرگ، بۆ بۆنخۆشی. |
| کێڤن | (سێڤن) ناوچەیەکی شاخاوی خوارووی فەرەنسایە. |
| گەشکە | فێ، خوو. |
| گەنە | قرنە |
| گوڵەترنج | Genista, Ginster |
| گۆڵم | گەنم یان هەر شتێک، پڕ بە دەستی مرۆڤ، گۆڵمێک گەنم، واتە چنگێک گەنم. |
| گڵمخاندن | لە ناو جێگا خۆ گڵمخاندن: لە ناو جێگا مانەوە دوای واگاهاتن. |
| گیانوسک | ساردۆنیا: Geranium |
| گیانی شەراب | بە ئێتانۆل دەگوترێت C2H6O |
| لات | ئەو زەویەی بۆ تۆکردن و کێلان مەرزەکانی دیار دەکرێت. |
| لەوەند | لاڤێندل، لالە |
| لەیزتۆک | لەیستۆک، کەرەسەو ئامرازی یاری منداڵان |
| لۆک | زەمقێکی رەنگ زەردە، لە درەختێکی ناوچەگەرمەکان وەردەگیرێت. |
| لیڤرە | یەکەیەکی پارەی زیوەی فەرەنسی بووە لە سەدەی نۆیەم تا |

| | |
|---|---|
| | هەژدەم بەکارهێنراوە. |
| مایرە | مورِ Myrrhe، چەسپێکە لە درەختی مایرە (مورِ) دێتە دەرەوە، لە بەرهەمهێنانی بۆن و هەتوانی بۆنخۆش بەکاردێت. |
| مەن | پێوەر، کێشان، ئەندازە: "هەموو شت بە خوێ خوێش بە مەن!" (نەک بە مەعنا، کە بە هەڵە دەگوترێت) |
| مۆتەخەون | مۆتەکەخەون، خەونی کابوسیی، خەونی زۆر سامناک. |
| میسکی پشیلە | Zibet: جۆرە میسکێکە، زبدی پشیلە، لە عەرەبییەوە وەرگیراوە، دەرهاویشتەی گلاندێکی کۆمی پشیلەیە، پشیلە شوێنی حوکمڕانی خۆی پێ نیشان دەکات، ئەگەر ئەو دەرهاویشتە رۆن بکرێتەوە، بۆنێکی خۆشی لێ دێت، لە عەترسازیدا بەکار دێت و، میسکی لێ ساز دەکرێت. بەڵام لە رۆژگاری ئەمڕۆدا، بە شێوەیەکیگشتی تەنها هی دەستکرد، بەکاردێت. |
| نموود (بێ نموود) | پەڕیوت، سیس، ژاکاو، خەمبار، بێ زەوق. |
| هاوقەران | هاوچەشن، هاویەک. |
| هاس | گوڵە *Hyacinthus* |
| هەرزاڵە | بریتییە لە کانتوڕیکی بێ دەرگا، تاق تاق، زەخیرەی تیا هەڵدەگیرێت، یان کەرەسی متبەقی تێ دەکرێت. |
| هەرێ | وادە، پەیمان. |
| هەنیە | تەوێل، نێوچەوان |
| هورە | گرە، بای گەرم. |
| هەیتە | پۆلیس |
| هینبوو | فێربوو |
| یاساوڵ | کێشکچی، پاسەوان |
| یەکانە | تەنێک، کە لە چاو دەوروبەرەکەی خۆی زاڵ و بەرچاو و بێ وێنە دەربکەوێت، بۆ نموونە قەڵای هەولێر تەنێکی یەکانەیە لە شاری هەولێر (دۆمینانت). |
| زێلاق | قوڕاو، چلپاو |
| گوش | ئەو رووەکەیە کە گوش ی گەنم و جۆ لە ریشالەکانی |

| | |
|---|---|
| | دەچندرێ. |
| ماورەرەکان | بزووتنەوەیەکی فکری و شێوە ئاینی داخراو بوون لە سەدەی حەڤدەم لە ئەوروپادا سەری هەڵدا، گۆڕینەوەو تەواوکاری زانست و ئەزموونی پیشەگەری یەکێک بوو لە ئامانجەکانی. ماورەر، بە ئەلمانی واتە وەستای دیواردروستکردن. |
| مرکی | وەک هی هاونیشتمانیانی ئاسایی، ئەهلی |
| مسگەر | (Kupferstecher) بەو پیشەگەرانە گوتراوە کە لەسەر مێتال بە زۆری لەسەر مس نەخش و نیگاریان هەڵکۆڵیوە. مسگەرەکانی کوردستان و رۆژهەڵاتی ناوەراستیش لەسەر سینی و مەنجەڵ و کەرەسەکانی تر پشەیێکی نزیکە لەو بابەت بە ئەنجام دەگەیەنن، بۆیە ئەو وشەیەمان بۆ هەڵبژارد. |

## لە بەرهەمەکانی وەرگێڕ:

ئەو بەرهەمانەی لە شێوەی کتێب و نامیلکە بڵاوکراونەتەوە:

١- چیلکەسوورە، لە ئەفسانەکانی کوردەواری، ١٩٩٦ بەرلین. بنکەی چاپەمنی سەکۆ.
٢- کیکۆر، چارەنووسی دوو منداڵ، لە عەرەبی و فارسییەوە، ١٩٩٧ بەرلین. بنکەی چاپەمەنی سەکۆ.
٣- دایکی هەڵەبجە. چیرۆک، (بە کوردی و بە ئەلمانی) بەرلین ٢٠٠٢، مەڵبەندی ئاوەدانی کوردستان.
٤- کرۆنۆلۆژیای ئەربێلا. لە ئەلمانییەوە وەرگێڕدراوە. ١٩٩٥ بەرلین. بنکەی سەکۆ. (چاپی یەکەم)، ٢٠١٢ بنکەی بڵاوکردنەوەی کۆیە (چاپی دووەم)
٥- کاروانسەراکانی رۆژهەڵات، لە ئەلمانییەوە وەرگێڕدراوە، ٢٠٠٢ سلێمانی، بنکەی سەردەم.
٦- بەختەوەری، لە ئەلمانییەوە وەرگێڕدراوە، ٢٠٠١ سلێمانی، وەزارەتی رۆشنبیری.
٧- دوارۆژی مەحکومێک/ ڤێکتۆر هۆگۆ، لە ئەلمانییەوە وەرگێڕدراوە، ٢٠٠٤ سلێمانی.
٨- شەترەنج، نۆڤلێت، شتێفان تسڤایک، لە ئەلمانییەوە وەرگێڕدراوە، ٢٠٠٢ سلێمانی، وەزارەتی رۆشنبیری.
٩- پرۆگرامەکانی پارتی سۆسیالدێمۆکراتی ئەلمانیا. لە ئەلمانییەوە وەرگێڕدراوە، ٢٠٠٨ سلێمانی.